واتــە : عەبـدوڵڵای كـوڕی عەببــاس خــوا لــە خـۆیو بــابی ڕازی بـێ ، دەڵـێ : قورەیشییەكـان شـەوێك لـە مەككـە ڕاوێژیـان كـرد ، دەربـارەی پێغـەمبـەر ، هـەندێكیـان گوتیـان : ئەگـەر بـەیـانی ڕۆژ بـۆوە ، بـە كـەلـەپچـەوە بیبـەستنـەوە (واتــە : حەپسـی بكـەن) ، وە هـەندێكیـان گوتیــان : بیكــوژن ، وە هـەندێكیــان گوتیـان : بـەڵكو دەری بكـەن ، خـوای پەنهـانزانیش پێغـەمبــەری خـۆی لـەوە ئـاگادار كـردەوە ، بۆیە عەلـی كـوڕی ئـەبی طـاڵیب لـە جێگـای پێغـەمبــەری خــوادا خــەوت ، وە پێغـەمبـــەری خـــوا لـــە مـــاڵ چـــووە دەر ، هـەتاكــو چـووە نێـو ئـەشكـەوتـەكـە ، وە هاوبـەش بۆ خـوا دانـەرەكانیش ئێشكـەیـان لە عەلـی دەگـرت ، وایـانزانی پێغـەمبـەری خـوایە ، كـاتێك ڕۆژیـان كردەوەو بـەرەو ڕووی چوون ، تـەماشـایـان كـرد (عەلـی)یە خـوا لێی ڕازی بـێ ، خـوا پیلانـەكەی ئـەوانی پووچـەڵ كـردەوە ، گوتیــان : كــوا ئــەو بـرادەرەت ؟ گوتــی : نازانــم ، ئــەوانیش بــە شــوێن پێیـدا ڕۆیشـتن ، تاكـو گەیشـتنــە چیـایەكـە ، لـەوێ لێیــان تێكـەڵ بـوو ، هـەندێك بـەملاو هـەندێك بـەولادا چوون ، دوایی تـەماشـای ئـەشكـەوتـەكـەیـان كـرد ، تـەونی جـاڵجاڵۆكـەی بـە دەرگـای ئـەشكـەوتـەكـە چنـرابوو ، گوتیــان : ئەگـەر چووبـایە نێـو ئـەم ئـەشكـەوتـە ، ئـەم تـەونی جـاڵجاڵۆكـەیە لێـرە نـەدەبوو ، پێغـەمبــەری خـوا سـێ شەوان لە ئـەشكـەوتـەكـەدا مایەوە .

هـەڵبـەتـە دوایی چـوو بۆ مەدینـە ، ئـەمە ڕیوایـەتێكی كـورتـە .

ب/ ئیبنو هیشـام ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ لە (السيرة النبوية)دا ، كـە دیـارە هـەم لـە ئیبنو ئیسحـاقەوە دێنـێ ، وە هـەم خۆشـی زیـادەی ڕەگـەڵ دەخات ، لە لاپـەڕە (٢٤٩ تـا ٢٥١) بــە درێـژیی بــاسی ئــەو پیلانـگێڕانــەی كافرەكـانی مەككــە ، وە بـاســی پووچـەڵكردنـەوەی پیلانـەكـەیـان لەلایـەن خــوای پەنهانزانــەوە ، دەكــات ، كــە لـە چـوار بڕگـەدا دەیهێنیـن ، لە ژێـر ناوونیشـانی :

## کۆبوونەوەی قسەڕۆیشتووانی قورەیش و ڕاوێژکردنیان دەربارەی پێغەمبەر دا

### اجْتِمَاعُ الْمَلأ مِنْ قُرَيْشٍ وَتَشَاوُرُهُمْ فِي أَمْرِ الرّسولِ :

١) }قَالَ ابْنُ إسْحَاقَ : وَلَمّا رَأَتْ قُرَيْشٌ أَنّ رَسولَ اللّهِ قَدْ صارَتْ لَهُ شِيعَةٌ وَأَصْحَابٌ مِنْ غَيْرِهِمْ بِغَيْرِ بَلَدِهِمْ ، وَرَأَوْا خُرُوجَ أَصْحَابِهِ مِنْ الْمُهَاجِرِينَ إلَيْهِمْ ، عَرَفُوا أَنّهُمْ قَدْ نَزَلُوا دَارًا ، وَأَصابُوا مِنْهُمْ مَنَعَةً ، فَحَذِرُوا خُرُوجَ رَسولِ اللّهِ إلَيْهِمْ ، وَعَرَفُوا أَنّهُمْ قَدْ أَجْمَعَ لِحَرْبِهِمْ ، اجْتَمَعُوا لَهُ فِي دَارِ النّدْوَةِ (وَهِيَ دَارُ قُصَيّ بْنِ كِلَابٍ الّتِي كَانَتْ قُرَيْشٌ لا تَقْضِي أَمْرًا إلاّ فِيهَا) يَتَشَاوَرُونَ فِيهَا مَا يَصْنَعُونَ فِي أَمْرِ رَسولِ اللّهِ حَيْنَ خَافُوهُ{ .

واتە : ئیبنو ئیسحاق دەڵێ : کاتێک قورەیشییەکان بینیان کە پێغەمبەری خوا هاوەڵ و لایەنگری بۆ پەیدابوون ، لە خەڵکی دیکەی جیا لەوان ، وە لە وڵاتی دیکەی جیا لە وڵاتی ئەوان ، (مەبەست پێی کۆچ کردنی هاوەڵانە بۆ مەدینە ، وە پەیمان پێدانی خەڵکی مەدینەیە بە پێغەمبەر ، لە پەیمانی یەکەم و دووەمی عەقەبەدا) وە بینییان کە هاوەڵەکانی لە کۆچکەران بەرەو ئەوانە دەچن ، کە پشتیوانی پێغەمبەر دەکەن ، وە زانییان کە مەنزڵگایان بۆ پەیدا بووە ، وە لەوێ هێزو پێو پشتیوانێکیان بۆ پەیدا بووە ، لەبەر ئەوە مەترسییان هەبووە لە دەرچوونی پێغەمبەری خوا بۆ لایان ، وە دەیانزانی ، کە ئەگەر پێغەمبەر دەربچێ ، جەنگیان لە دژ دەکات ، بۆیە لە (دَارِ النَّدْوَةِ) کۆبوونەوە ، کە خانووی قوصەی کوڕی کیلاب بوو ، کە قورەیشییەکان هیچ کارێکیان نەدەکرد ، مەگەر لەو خانووەی قوصەی کوڕی کیلاب دا ، کە ناویان نابوو (دَارِ النَّدْوَةِ) واتە : مەنزڵگای ڕاوێژو پرس و ڕا پێکردن و توێژینەوە ، ڕاوێژو تەگبیریان لەبارەوە کردبایە، لەوێدا کۆبوونەوەو ڕاوێژیان کرد ، کە ئایا دەربارەی پێغەمبەری خوا چی بکەن ؟ کاتێک مەترسییان لێی هەبوو کە بڕوات .

٢) }عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا قَالَ : لَمّا أَجمَعُوا لِذَلِكَ وَاتّعَدُوا أَنْ يَدْخُلُوا فِي دَارِ النّدْوَةِ لِيَتَشَاوَرُوا فِيهَا فِي أَمْرِ رَسولِ اللهِ غَدَوْا فِي الْيَوْمِ الّذِي اتّعَدُوا لَهُ وَكَانَ ذَلِكَ الْيَوْمُ يُسَمّى يَوْمَ الزّحْمَةِ ، فَاعْتَرَضَهُمْ إبْلِيسُ فِي هَيْئَةِ شَيْخٍ جَلِيلٍ ، عَلَيه بَتٌّ [1] له فَوَقَفَ عَلَى بَابِ الدّارِ ، فَلَمّا رَأَوْهُ وَاقِفًا عَلَى بَابِهَا ، قَالُوا : مَنِ الشّيْخُ ؟ قَالَ شَيْخٌ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ سَمِعَ بِالّذِي اتّعَدْتُمْ لَهُ فَحَضَرَ مَعَكُمْ ، لِيَسْمَعَ مَا تَقُولُونَ ، وَعَسَى أَنْ لا يُعْدِمَكُمْ مِنْهُ رَأْيًا وَنُصْحًا ، قَالُوا : أَجَلْ فَادْخُلْ ، فَدَخَلَ مَعَهُمْ{ .

واتە : عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : کاتێك یەك دەنگ بوون لەسەر ئەوە ، وە کاتیان دیاری کردو بەڵێنیاندا بچنە (دَار النَّدْوَة)ەوە ، بۆ ئەوەی دەربارەی پێغەمبەری خوا پێکەوە قسە بکەن ، وە ئەو ڕۆژەی کە بڕیاریان دابوو ، بەیانیەکەی چوون ، ئەویش ئەو ڕۆژە بوو کە لەلای قوڕەیشییەکان پێی دەگوترا : (يَوْمَ الزّحْمَةِ) ، ئیبلیس لە شێوەی پیاوێکی بە تەمەنی بە ویقاردا ، کە بەرگێکی ئەستووری لەبەردا بوو ، چووە پێشیانو لەبەر دەرگای خانووەکە ڕاوەستا ، کاتێك کە لەبەر دەگا بینییان ، گوتیان : ئەو پیاوە بە تەمەنە کێیە ؟

ئەویش گوتی : من پیاوێکی بە تەمەنم خەڵکی ناوچەی نەجدم ، بیستوومە ئەوەی کە ئێوە بۆی کۆبوونەوە ، دەمەوێ لەگەڵتان ئامادە بم ، تاکو بزانم چی دەڵێن ؟ بەڵکو دڵسۆزییو ڕایەکی سوود بەخشم بۆ ئێوە هەبێ ، گوتیان : فەرموو وەرە ژوورێ ، چووە ژوورێ .

٣) }وَقَدْ اجْتَمَعَ فِيهَا أَشْرَافُ قُرَيْشٍ ، مِنْ بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ : عُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ ، وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ ، وَمِنْ بَنِي نَوْفَلِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ : طُعَيْمَةُ بْنُ عَدِيّ ، وَجُبَيْرُ بْنُ مُطْعَمٍ ، وَالْحَارِثُ بْنُ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلٍ ، وَمِنْ بَنِي عَبْدِ الدّارِ بْنِ قُصَيّ : النّضْرُ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ كِلْدَةَ ، وَمِنْ بَنِي أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزّى : أَبُو الْبَخْتَرِيّ بْنُ هِشَامٍ ، وَزَمْعَةُ بْنُ الأَسْوَدِ بْنِ الْمُطّلِبِ ، وَحَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ ، وَمِنْ بَنِي مَخْزُومٍ : أَبُو جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ ، وَمِنْ بَنِي سَهْمٍ : نُبَيْهٌ وَمُنَبّهٌ ابْنَا الْحَجاجِ ، وَمِنْ بَنِي جُمَحٍ : أُمَيّةُ

١) البَتُّ : كِساءٌ غليظ من صوفٍ أو وَبَرٍ، المعجم الوسيط ، ص ٣٧.

بْـنُ خَلَـفٍ ، وَمَـنْ كـانَ مَعَهُـمْ وَغَيْـرُهُمْ مِمّـنْ لا يُعَـدّ مِـنْ قُـرَيْشٍ . فَقَـالَ بَعْضُـهُمْ لِبَعْضٍ : إنّ هَـذَا الرّجُـلَ قَدْ كـانَ مِنْ أمْرِهِ مَا قَدْ رَأَيْتُمْ ، فَإِنَّا وَاللّهِ مَا نَأْمَنُهُ عَلَى الْوُثُوبِ عَلَيْنَا فِيمَنْ قَدْ اتّبَعَهُ مِنْ غَيْرِنَا ، فَأَجْمِعُوا فِيهِ رَأْيا ، قَالَ فَتَشَاوَرُوا ، ثُمّ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ : احْبِسُـوهُ فِـي الْحَدِيدِ وَأَغْلِقُوا عَلَيْـهِ بـابـاً ، ثُـمّ تَرَبّصُـوا بِـهِ مَـا أَصـابَ أَشْبـاهَهُ مِنْ الشّعَرَاءِ الّذِينَ كـانُوا قَبْلَـهُ : زُهَيْـرًا وَالنّابِغَـةَ ، وَمَنْ مَضَـى مِنْهُمْ مِنْ هَـذَا الْمَوْتِ ، حَتّى يُصِيبَهُ مَا أَصابَهُمْ ، فَقَالَ الشّيْخُ النّجْدِيّ : لا وَاللّهِ مَا هَـذَا لَكُمْ بِـرَأْيٍ ، وَاللّهِ لَـئِنْ حَبَسْتُمُوهُ كَمَا تَقُولُـونَ ، لَيَخْـرُجَنّ أَمْـرُهُ مِـنْ وَرَاءِ الْبـابِ الّـذِي أَغْلَقْتُمْ ، يُكاثِرُوكُمْ بِهِ حَتّى يَغْلِبُوكُمْ عَلَى أَمْرِكُمْ مَا هَذَا لَـكُمْ بِـرَأْيٍ ، فَانْظُـرُوا فِي غَيْرِهِ .

فَتَشَـاوَرُوا ، ثُـمّ قَـالَ قَائِـلٌ مِنْهُمْ : نُخْرِجُهُ مِنْ بَيْنِ أَظْهُرِنَـا ، فَنَنْفِيهِ مِـنْ بِـلادِنَا ، فَإِذَا أُخْرِجَ عَنّا ، فَوَاللّهِ مَا نُبـالِي أَيْنَ ذَهَبَ ، وَلا حَيْثُ وَقَعَ ، إذَا غَابَ عَنّا وَفَرَغْنَا مِنْهُ ، فَأَصْلَحْنَا أَمْرَنَـا وَأُلْفَتْنَا كَمَا كـانَتْ .

فَقَالَ الشّيْخُ النّجْدِيّ : لا وَاللّهِ مَا هَذَا لَكُمْ بِرَأْيٍ ، أَلَمْ تَـرَوْا حُسْـنَ حَدِيثِهِ وَحَلاوَةَ مَنْطِقِهِ وَغَلَبَتِهِ عَلَى قُلُوبِ الرّجالِ بِمَا يـاتِي بِهِ ، وَاللّهِ لَـوْ فَعَلْتُمْ ذَلِكَ مَا أَمِنْتُمْ أَنْ يَحِلّ عَلَى حَيّ مِنْ الْعَرَبِ ، فَيَغْلِبَ عَلَيْهِمْ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِ وَحَدِيثِهِ ، حَتّى يُتَابِعُوهُ عَلَيْهِ ، ثُمّ يَسِيرُ بِهِمْ إلَيْكُمْ ، حَتّى يَطَاكُمْ بِهِمْ فِي بِلادِكُمْ ، فَيأْخُذَ أَمْرَكُمْ مِنْ أَيْدِيكُمْ ، ثُمّ يَفْعَلَ بِكُمْ مَا أَرَادَ ، دَبِّرُوا فِيهِ رَأْيا غَيْرَ هَذَا .

قَالَ فَقَالَ أَبُو جَهْلِ بْنُ هِشَامٍ : وَاللّهِ إنَّ لِي فِيهِ لَرَأْيًا مَا أَرَاكُمْ وَقَعْتُمْ عَلَيْهِ بَعْدُ ، قَالُوا : وَمَا هُوَ يَا أَبَا الْحَكَمِ ؟ قَالَ : أَرَى أَنْ نَأْخُذَ مِنْ كُلّ قَبِيلَةٍ فَتًى شَابا جَلِيدًا نَسِيبا وَسِيطا فِينَا ، ثُمّ نُعْطِي كُلّ فَتًى مِنْهُمْ سَيْفًا صَارِمًا ، ثُمّ يَعْمِدُوا إلَيْهِ فَيَضْرِبُوهُ بِهَا ضَرْبَةَ رَجُلٍ وَاحِدٍ ، فَيَقْتُلُوهُ ، فَنَسْتَرِيحَ مِنْهُ ، فَإِنّهُمْ إذَا فَعَلُوا ذَلِكَ تَفَرّقَ دَمُهُ فِي الْقَبَائِلِ جَمِيعًا ، فَلَمْ يَقْدِرْ بَنُو عَبْدِ مَنَافٍ عَلَى حَرْبِ قَوْمِهِمْ جَمِيعاً ، فَرَضُوا مِنّا بِالْعَقْلِ فَعَقَلْنَاهُ لَهُمْ .

قَالَ : فَقَالَ الشّيْخُ النّجْدِيّ : الْقَوْلُ مَا قَالَ الرّجُلُ هَذَا الرّأْيُ الّذِي لا رَأْيَ غَيْرُهُ ، فَتَفَرّقَ الْقَوْمُ عَلَى ذَلِكَ وَهُمْ مُجْمِعُونَ لَهُ...} .

واتە : كاتێك كە سەرانو قسە ڕۆیشتووانی قوڕەیش كۆبوونەوە ، كە لە (بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ) عوتبەی كوڕی ڕەبیعەو شەیبەی كوڕی ڕەبیعەو ، ئەبو سوفیانی كوڕی حەڕب بوون ، وە لە (بَنِي نَوْفَلِ بْنِ عَبْدِ مَنَاف) : طوعەیمەی كوڕی عەدییو ، جوبەیری كوڕی موطعیم و ، حارسی كوڕی عامری كوڕی نەوفەل ، وە لە (بَنِي عَبْدِ الدَّارِ بْنِ قُصَيّ) نەزری كوڕی حارسی كوڕی كیلدە ، وە لە (بَنِي أَسد بْنِ عَبْدِ الْعُزّى) ئەبو لبەختەریی كوڕی هیشامو ، زومعەی كوڕی ئەسوەدی كوڕی موتتەڵیبو ، حەكیمی كوڕی حیزام ، وە لە (بَنِي مَخْزُومٍ) ئەبو جەهلی كوڕی هیشام ، وە لە (بَنِي سَهْمٍ) ، (نُبَيْهٌ وَمُنَبّهٌ) كوڕانی حەججاج ، وە لە (بَنِي جُمَح) ئومییەی كوڕی خەلەف ، هەروەها جگە لەوانەش خەڵكی دیكەشیان لەگەڵدا هەبوو ، وە لە هۆزی قوڕەیش نەدەژمێردران هێندە زۆر بوون ، وە خەڵكی دیكەشیان تێدابوو كە لە هۆزی قوڕەیش نەبوو ، هەندێكیان بە هەندێكیان گوت : بۆ خۆتان دەزانن : ئەو پیاوە تا ئێستا چی كردووەو چۆنی كردووە ؟! (واتە : موحەممەد ) سوێند بە خوا ئێمە لەوە دڵنیانین كە ئەگەر بچێتە ئەو شوێنەی كە شوێنكەوتووانی كۆچیان بۆ كردووە (واتە : مەدینە) ، وە دوایی هەموویان یەكدەنگ بنو دژایەتیی ئێمە بكەن ، با ڕاوێژ بكەین ، بزانین چی بكەین باشە ؟

یەكێكیان گوتی : پێم باشە كەلەپچەی ئاسنی بخەینە دەستو پێ ، وە حەپسی بكەین ، وە دەرگای لەسەر دابخەین ، دوایی لێی دەگەڕێین وەك ئەو شاعیرانەی پێش خۆی ، وەك زوهەیرو نابیغە وەك خەڵكی دیكەی غەیری وانیش كە قسەی وایان كردووەو بیروڕای وایان هەبووەو ، مەترسییمان لێیان هەبووە ، حەپسمان كردوون تاكو مردوون ، ئەویش حەپس دەكەین تاكو دەمرێ .

پیاوە بە تەمەنە نەجدییەكە (كە مەبەست ئیبلیسە ، بەڵام لە شێوەی پیاوێكی بە تەمەن دا بوو) گوتی : نەخێر ، بە خوا ئەوە ڕایەكی باش نیە ، بەخوا ئەگەر بێتو حەپسی بكەن ، وەك ئێوە دەیڵێن ، دوایی ئیشەكەی وی لە پشت دەرگاوە كە لێتان داخستوە ، بەرەو هاوەڵەكانی دەچێ ، وە زۆر نیزیكە كە هاوەڵەكانی لێتان ڕاببەڕن ، وە پەلامارتان بدەن ، وە شەڕیشتان لەگەڵدا بكەنو بەسەریشتاندا زاڵ بن ، بۆیە ئەوە ڕایەكی باش نیە ، بزانن ڕایەكی دیكە هەڵبژێرن .

دووباره ڕاوێژیان کردەوە ، یەکێکی دیکە گوتی : لە نێو خۆماندا نەفی دەکەین ، دووری دەخەینەوە بۆ شوێنێکی دیکە ، هەر کاتێك لە نێو ئێمەدا نەما ، ئەو کاتە گوێ نادەینێ داخۆ بۆ کوێ دەچێو چی لێدێ ؟ وە ئەگەر لێرە نەما ئێمە لە دەستی دەربازمان دەبێ ، وە ئێمەش ئەوکاتە کاروباری خۆمان چاك دەکەینەوە ، وە ئەو تەباییەی هەمان بوو پێش ئەوەی ئەو باسی پێغەمبەرایەتیی بکات ، ئەو تەباییە بۆ نێو خۆمان دەگێڕینەوە .

پیاوە بە تەمەنە نەجدییەکە گوتی : سوێند بە خوا ئەوەش ڕایەکی باش نیە ، ئایا تەماشا ناکەن قسەی چەند چاکە ، گفتوگۆی چەند شیرینە ، وە چۆن بەو قسانەی کە هێناونی بەسەر دڵی پیاواندا زاڵ دەبێ ، بە خوا ئەگەر وابکەن ، ئەوە ئێوە دڵنیا نابن ، کە بچێتە لای هۆزێك لە هۆزەکانی عەرەب ، ئیقناعیان بکات ، بەهۆی قسەی خۆشیو وتەی جوانی ، وە دوایی لەگەڵ ئەو هۆزەدا بێتو بەسەرتاندا بدات ، وە کاروبارتان لە دەست دەربێنێ ، وە ئەوەی بیەوێ پێتان بکات ، بۆیە بۆ ڕایەکی دیکە بگەڕێن ، ئەم ڕایە بەکەڵك نایەت .

ئەبو جەهلی کوڕی هیشام گوتی : بە خوا من ڕایەکەم هەیە ، پێم وایە تاکو ئێستا ئێوە پەیتان بەو ڕایە نەبردوە .

گوتیان : ئەی ئەبو لحەکەم ! ڕایەکەت چییە ؟

گوتی : من ڕام وایە کە لە هەر هۆزێك لە هۆزەکان ، گەنجێکی بە تینو تاقەتی خاوەن ڕەچەڵەکی خۆشەویست لە نێوماندا بێنین ، وە هەر کامێك لەوانە شمشێرێکی پێ بدەین ، پاشان ئەو گەنجانە هەموویان وەك یەك پیاو هێرشی بکەنە سەری ، پێکەوە لێی بدەنو بیکوژن ، ئەو کاتە ئێمە لێی دەرباز دەبینو ئاسوودە دەبین ، وە ئەگەر واشمان کرد ، خوێنەکەی لە نێو هۆزەکانی هەموو عەرەبدا بڵاو دەبێتەوە ، وە (بَنُو عَبْد مَنَاف) ناتوانن شەڕ لەگەڵ هەموو هۆزەکاندا بکەن ، بۆیە ڕازی دەبن کە خوێنیان بدەینێ ، ئێمەش خوێنیان دەدەینێ .

پیاوە پیرە نەجدییەکە گوتی : ڕای ڕاست ئەوەیە کە ئەم پیاوە گوتی ، وە منیش جگە لەو ڕایەم پێ باش نیە ، خەڵکەکە لەسەر ئەو ڕایە ڕێککەوتن .

٤) کە باسی بە جێهێشتنی عەلییە خوا لێی ڕازی بێ لەسەر جێی پێغەمبەری خوا ، {فأتَى جبْريلُ عليْهِ السّلامُ رَسولَ اللهِ ، فقَالَ : لا تَبِتْ هَذِهِ الليْلَةَ علَى فِراشِكَ الّذِي كُنْتَ تَبِيتُ عَلَيْهِ ، قَالَ : فلَمّا كانَتْ عَتَمَةٌ مِنَ الليْلِ اجْتَمَعُوا علَى بابِهِ يَرْصُدُونَهُ مَتَى يَنَامُ ، فيَثِبُونَ علَيْهِ ، فلَمّا رَأى رَسولُ اللهِ ، مَكانَهُمْ ، قَالَ لِعَلِيّ بْنِ أبِي طالِبٍ : نَمْ علَى فِرَاشِي وَتَسجّ بِبُرْدِي هَذَا الأَخْضَرِ ، فَنَمْ فِيهِ ، فإنّهُ لَنْ يَخْلُصَ إليْكَ شَيْءٌ تَكْرَهُهُ مِنْهُمْ ، وَكانَ رَسولُ اللهِ يَنَامُ فِي بُرْدِهِ ذَلِكَ إذَا نَامَ .

لَمّا اجْتَمَعُوا لَهُ وَفِيهِمْ أَبُو جَهْلِ بْنُ هِشامٍ ، فقَالَ وَهُمْ علَى بابِهِ : إنّ مُحَمّدًا يَزْعُمُ أنّكُمْ إنْ تَابَعْتُمُوهُ علَى أمْرِهِ ، كُنْتُمْ مُلُوكَ الْعَرَبِ وَالْعَجَمِ ، ثُمّ بُعِثْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَوْتِكُمْ ، فجُعِلَتْ لَكُمْ جِنَانٌ كَجِنَانِ الأُرْدُنّ ، وَإنْ لَمْ تَفْعَلُوا ، كانَ لَهُ فِيكُمْ ذَبْحٌ ، ثُمّ بُعِثْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَوْتِكُمْ ، ثُمّ جُعِلَتْ لَكُمْ نَارٌ تُحْرَقُونَ فِيهَا .

قَالَ : وَخَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسولُ اللّهِ فَأَخَذَ حَفْنَةً مِنْ تُرَابٍ فِي يَدِهِ ، ثُمّ قَالَ : أنَا أَقُولُ ذَلِكَ وأنْتَ أحَدُهُمْ ، وَأَخَذَ اللهُ تَعَالَى علَى أَبْصارِهِمْ عَنْهُ ، فَلا يَرَوْنَهُ فَجَعَلَ يَنْثُرُ ذَلِكَ التُّرَابَ عَلَى رُءُوسِهِمْ ، وَهُوَ يَتْلُو هَؤُلاءِ الآيَاتِ مِنْ يس :

﴿يسٓ ۝١ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ۝٢ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ۝٣ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ۝٤ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ۝٥﴾ ، إلَى قَوْلِهِ ﴿وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ۝٩﴾ ، حَتّى فَرَغَ رَسولُ اللهِ مِنْ هَؤُلاءِ الآيَاتِ وَلَمْ يَبْقَ مِنْهُمْ رَجُلٌ إلاّ وَقَدْ وَضَعَ عَلَى رَأْسِهِ تُرَاباً ، ثُمّ انْصَرَفَ إلَى حَيْثُ أرَادَ أنْ يَذْهَبَ ، فأتَاهُمْ آتٍ مِمّنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُمْ فقَالَ : مَا تَنْتَظِرُونَ هاهُنَا ؟ قَالُوا : مُحَمّداً ، قَالَ : خَيّبَكُمُ اللهُ قَدْ وَاللهِ خَرَجَ عَلَيْكُمْ مُحَمّدٌ ، ثُمّ مَا تَرَكَ مِنْكُمْ رَجُلا ، إلاّ وَقَدْ وَضَعَ عَلَى رَأْسِهِ تُرَابا ، وَانْطَلَقَ لِحَاجَتِهِ ، أَفَمَا تَرَوْنَ مَا بِكُمْ ؟ قَالَ : فَوَضَعَ كُلّ رَجُلٍ مِنْهُمْ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ فَإِذَا عَلَيْهِ تُرَابٌ ، ثُمّ جَعَلُوا يَتَطَلّعُونَ فَيَرَوْنَ عَلِياً عَلَى الْفِرَاشِ مُتَسَجّيًا بِبُرْدِ رَسولِ اللهِ فَيَقُولُونَ : وَاللّهِ إنّ هَذَا لَمُحَمّدٌ نَائِمًا ، عَلَيْهِ بُرْدُهُ ، فَلَمْ يَبْرَحُوا كَذَلِكَ ، حَتّى أَصْبَحُوا فَقَامَ عَلِيّ عَنْ الْفِرَاشِ فَقَالُوا : وَاللّهِ لَقَدْ كَانَ صَدَقَنَا الّذِي حَدّثَنَا} .

واتە : جبریل هاتە لای پێغەمبەری خوا ، وە پێی فەرموو : ئەم شەو لە جێگاکەی خۆتدا کە پێشتر لێی دەخەوتی ، مەخەوە ، جا کاتێك کە شەو داهات ، کافرەکان کە بڕیار بوو هەموو پێکەوە وەك یەك پیاو هێرشی بکەنە سەریّو بیکوژن ، لەبەر دەرگاکەی کۆبوونەوە ، وە چاوەڕێ بوون کە کەی دەخەوێ ، وە پاشان هەموو هێرشی بکەنە سەرێ ، وە پاشان کە پێغەمبەری خوا بینی لەو شوێنەن ، فەرمووی : تۆ لەم جێگایەی مندا بخەوە ، وە ئەم بوڕدە[1] حەزرەمییە سەوزەی من بەسەر خۆت دا بدە ، وە تێیدا بخەوە ، وە دڵنیابە کە لەوانەوە هیچ زیانێکت پێناگات ، پێت ناخۆش بێ ، وە پێغەمبەری خوا عادەتی وا بوو ئەو بوردەی بە خۆی دادەدا .

ئنجا کاتێك کە کۆبوونەوە ئەبو جەهلی کوڕی هیشامیشیان لەگەڵدا بوو ، ئەبو جەهل گوتی : موحەممەد پێی وایە ئەگەر شوێنی بکەون (واتە : شوێن بەرنامەکەی بکەون) ، ئێوە دەبن بە پاشای عەرەبو جگە لە عەرەبان ، وە دوای مردنیشتان زیندوو دەکرێنەوە ، وە چەندان باغو بێستانی وەك باغو بێستانەکانی ئوردونتان پێ دەدرێ ، وە ئەگەر شوێنی نەکەون ، ئەوە لەلایەن ویەوە تووشی کوژرانو سەبڕدران دەبن ، وە دوایی پاش مردنیشتان زیندوو دەکرێنەوە ، ئاگرێکتان بۆ ساز دەکرێو تێیدا دەسووتێنرێن (واتە : بە تەوسو توانجەوە ئەم قسانەی کردن) .

پێغەمبەری خواش هاتەدەر لە ماڵەکەی خۆی ، وە چنگە خۆڵێکی هەڵگرتو دوایی فەرمووی : ﴿أَنَا أَقُولُ ذَلِكَ وأَنْتَ أَحَدُهُمْ﴾.

واتە : بەڵێ من وا دەڵێمو تۆش یەکێکیانی ، وە خوای پەروەردگاریش چاویانی گرت ، پێغەمبەری خوایان نەبینی ، وە پێغەمبەری خوا چنگە خۆڵێکی بەسەر سەریان دا کرد ، لە کاتێکدا کە ئەم ئایەتانەی سووڕەتی (یس)ی دەخوێندەوە : ﴿يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ۝٢ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝٣ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ۝٤ تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ۝٥﴾ تاکو دەگاتە : ﴿وَجَعَلۡنَا مِنۢ

---

١) بورد : قوماشێکی ئەستوورە ، وەك لێفەو بەتانیی ئەم سەردەمە وابووە ، بۆ بەخۆدادانو خەوتن بەکارهاتوە.

﴿بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ۝٩﴾ ، وە هیچ پیاوێك لەوانەی كە لەبەر دەرگای پێغەمبەر بوون ، نەما ، كە لەو چنگە خۆڵەی نەكەوێتە سەر سەر ، وە پێغەمبەری خواش بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشت كە دەیویست .

ئەوانیش هەر لەوێ بوون ، كە یەكێك هات بۆ لایان كە لەگەڵ وان نەبوو ، گوتی : چاوەڕێی چی دەكەن لێرە ؟ گوتیان : چاوەڕێی موحەممەد دەكەین ، گوتی : خوا بەدبەختتان بكات ! موحەممەد بە لاتاندا ڕۆیشتە دەر ، وە هیچ كامێكی لە ئێوە نەهێشتۆتەوە ، تۆزە خۆڵێكی نەخستبێتە سەر سەر ، وە موحەممەد بۆ ئیشی خۆی ڕۆیی ، ئایا نابینن چیتان لێ هاتوە ، دەڵێ : هەر كامێك لەو پیاوانە دەستی گەیاندە سەری ، تەماشای كرد : تۆزە خۆڵێكی لەسەرە .

ئنجا دوایی تەماشای ژوورەكەیان كرد ، بینییان عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) لەسەر جێگای پێغەمبەرە و ئەو پێخەفەی پێغەمبەری خوای بەخۆی داداوە ، ئەوانیش گوتیان : بە خوا ئەوە موحەممەدە ، خەوتووە پێخەفەكەش هەر هی موحەممەدە ، بۆیە هەر لەوێ بوون تاكو ڕۆژیان كردەوە ، كە ڕۆژداهات عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) لەسەر جێگایەكەی هەڵسا ، گوتیان : وا دیارە ئەو كەسەی كە هەواڵەكەی بۆ هێنابووین ، ڕاستی كردوە .

٢ / هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی كە خوا دەفەرموێ : ﴿وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ۝٣٢﴾ ، ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ، قَالَ : قَالَ أَبُو جَهْلٍ : اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ ، فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ، فَنَزَلَتْ : ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ۝٣٣﴾﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ فِي (التفسير) برقم : (٤٣٧١) ، وَمُسْلِم فِي (ذكر المنافقين والكفار) برقم : (٢٦٩٧)} .

واتە : ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) ، دەڵێ : ئەوە ئەبو جەهل بوو کە گوتی : خوایە ! ئەگەر ئەم (قوڕئان)ە هەقە لەلایەن تۆوە ، بەردبارانمان بکە لە ئاسمانەوە ، یاخود سزایەکی بە ئێشمان بۆ بێنە ، خوای بەرزیش ئەمەی دابەزاند : ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ .

٣ / هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە خوا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ ، ﴿عَنِ الزّهْرِيّ وَمُحَمّدُ بْنُ يَحْيَى وَعَاصِمُ بْنُ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ وَالْحُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرّحْمَنِ بْنِ عَمْرِو بْنِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ : أُصِيبَ يَوْمَ بَدْرٍ مِنْ كُفَّارِ قُرَيْشٍ : أَصْحَابُ الْقَلِيبِ ، وَرَجَعَ كُلُّهُمْ إِلَى مَكة ، وَرَجَعَ أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ بَعِيرِهِ : مَشَى عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي رَبِيعَةَ ، وَعِكْرِمَةُ بْنُ أَبِي جَهْلٍ ، وَصَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ ، فِي رِجَالٍ مِنْ قُرَيْشٍ ، مِمّنْ أُصِيبَ آبَاؤُهُمْ وَأَبْنَاؤُهُمْ وَإِخْوانُهُمْ يَوْمَ بَدْرٍ ، فَقَالُوا : يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ ! إِنَّ مُحَمَّدًا قَدْ وَتَرَكُمْ ، وَقَتَلَ خِيَارَكُمْ فَأَعِينُونَا بِهَذَا الْمَالِ عَلَى حَرْبِهِ ، فَلَعَلَّنَا نَدْرِك مَعَهُ ثَأْرَنَا بِمَنْ أَصَابَ مِنَّا ، فَفَعَلُوا (قَالَ فِيهِم كَمَا ذكِرَ عَنِ ابْنِ عَبَاس) أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ﴾ }أَخْرَجَهُ الْبَيْهَقِي فِي (الدلائل) ج ٣ ، ٢٢٤ ، ٢٢٥ ، وَابْنُ هِشَام ج ٣ ، ص ٣ ، ٤ ، وَابْنُ أَبِي حَاتِم فِي (تفسيره) برقم : (٩٠٥٥) ، وَالطَّبَرِي، ج ٩ ، ص ١٦٠ ، وَابْنُ المنذر فِي (تفسيره) كما فِي الدر المنثور ، وَقَالَ مُؤَلفا الإِسْتِيعَاب ، ج ٢ ، ص ٢٣٨ ، قُلْنَا وَهَذَا مُرْسَلٌ ، صَحِيحُ الإِسنادِ { .

واتە : زوهریی‌و موحەممەدی کوڕی یەحیاو عاصیمی کوڕی عەمری کوڕی قەتادەو حوصەینی کوڕی عەبدوڕەحمان‌و عەمری کوڕی سەعدی کوڕی موعاز (کە هەموویان زانایانی تابیعینن) گوتوویانە : دوای ئەوەی لە جەنگی بەدردا ئەوە بەسەر کافرەکانی قوڕەیش هات ، ئەوانەیان کوژران کە جەنازەکانیان فڕێدرانە قەلیبەوە ، وە هەموو ئەوانەی گەڕانەوە بۆ مەککە ، ئەبو سوفیانیش

بە كاروانەكەیەوە بە سەلامەتیی گەڕایەوە بۆ مەككە ، عەبدوڵڵای كوڕی ڕەبیعەو عیكرەمەی كوڕی ئەبو جەهلو صەفوانی كوڕی ئومەییە لەگەڵ پیاوانێكی دی لە قوڕەیش ، كە باوكیان كوژرا بوو ، یان برایان كوژرا بوو ، یان كوڕیان كوژرا بوو ، لە جەنگی بەدردا ، گوتیان : ئەی كۆمەڵی قوڕەیش ! مەحەممەد بەو شێوەیەی لێكردوون ، كە ناودارەكانی ئێوەی كوشتوە ، بۆیە ئێوە بەو ماڵو سامانەی كە لەو كاروانەدا بووە ، كە ئەبو سوفیان هێناویەتەوە لە شام ، هاوكارییان بكەن ، بۆ ئەوەی جەنگی لە دژی موحەممەد پێ بكەین ، تاكو تۆڵەی خۆمانی پێ لێ بكەینەوە ، لە بەرانبەر ئەو هەموو خەڵكەی ئێمەدا كە كوژراونو ، ئەوانەی كە گیراونو ، ئەوانەی كە بریندار كراون ، ئەوانیش وایانكرد ، ئنجا وەك عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس گێڕاویەتەوە ، خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ٣٦ ﴾ .

# مانای گشتی ئایەتەكان

خوا لەم ئایەتانەدا سەرەتا باسی ئەوە دەكاتو ، دەیخاتەوە یادی پێغەمبەری خوا ، وە پاشان یادی ئۆممەتەكەی دەخاتەوە بەگشتی ، وە بەتایبەت هاوەڵانی بەڕێزی ، كە چۆن پێغەمبەری خۆی دەرباز كردوە ، لە پیلانو فێڵی كافرەكانی مەككە ، كاتێك كە لە مەككە بوون .

ئنجا ئێمە لە سەرەتای پێناسەی ئەم سوورەتەدا باسمان كرد ، كە هەندێك لە توێژەرەوان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ، تۆزێك سەتحییانە تەماشای ئایەتەكانیان كردوە ، گوتوویانە : لە ئایەتی (٣٠)یەوە تاكو (٣٦) ، واتە : حەوت ئایەت لە مەككە هاتوونە خوار ، بۆچی ؟

چونكە باسی ئەو ڕووداوە دەكەن ، كە لە مەككە ڕوویداوە !

بەڵام بێگومان ئەمە وانیە ، بەڵكو خوا لە مەدینە لە گەرمەی ڕووداوەكانی بەدرو ، دوای جەنگی بەدردا ئەم سوورەتەی ناردۆتە خوارو هەموویشی پێكەوە هاتۆتە خوار ، بەڵام خوا لێرەدا چەند شتێكی دیكەشی خستۆتەوە یادی پێغەمبەری خوا ، وە هاوەڵان ، بۆ وێنە : كە دەفەرموێ : ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٢٦﴾ ، دەفەرموێ : یاد بكەنەوە ! كاتێك ئێوە كەم بوونو چەوسێنراوە بوون لە زەویداو ، دەترسان خەڵك بتانرفێنێ ، بۆیە لێرەش كە دەفەرموێ : ﴿وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ، یاد بكەوە كاتێك ئەوانەی بێبڕوان پیلانیان لە دژی تۆ دەگێڕا ، (واتە لە شاری مەككە)، بە تەمای فێڵو تاكتیكێك بوون ، كە ئەویش لە سێ شت دا خۆی دەنواند : ﴿لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَ﴾ :

١) یان حەپست بكەن‌و زیندانییت بكەن .

٢) یان بتكوژن .

٣) یان دەرت بكەن .

كە پێشتر بەسەرهاتەكەمان بە دوو ڕیوایەت هێنا ، هەم بە كورتیی‌و هەم بە درێژیی ، كە سەرەنجام كافرەكانی مەككە بڕاردەی كوشتنیان تەبەننیی كردوە ، ﴿وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُ﴾ ، ئەوان پیلانیان دەگێڕاو فێڵیان دەكرد ، خواش تەگبیری دەكرد ، هەڵبەتە بۆیە بۆ خوای پاك ، وشەی فێڵ بەكارناهێنم ، چونكە لە كوردییدا وشەی فێڵ ، زیاتر بۆ حاڵەتی خراپ‌و مەبەستی خراپ بەكاردێ ، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا وشەی (مكر) هەم باری چاكەدا بەكاری دێنن ، وە هەم بە باری خراپەدا بەكاری دێنن ، بەڵام كە لە كوردییدا كە گوترا : فێڵ ، یان فێڵباز ، یان فێڵ زان ، ئەوە بۆ كەسێكە كە دەیەوێ خەڵك هەڵخەڵەتێنێ‌و كاری خراپ بكات .

بۆیە ئەم وشەیە لە كوردییدا نابێ واتایەكەی بەكاربێ ، بەڵكو دەبێ تەعبیرێك بەكاربێ ، كە شایستەی خوای بێ وێنە بێ ، ﴿وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ﴾ ، وە بێگومان خوا باشترین تەگبیركارو نەخشە دانەرە .

ئنجا باسی هەڵوێستێكی دیكەی كافرەكان دەكات ، دەفەرموێ : ﴿وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا قَالُواْ قَدۡ سَمِعۡنَا لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ﴾ ، وە كاتێك ئایەتەكانی ئێمەیان بەسەردا خوێنرانەوە ، گوتیان : ئەوە بیستمان (واتە : تێگەیشتین ، دەزانین چییە ؟) ئەگەر بمانەوێ ، ئێمەش وێنەی ئەو قسەیە دەكەین : ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ ، ئەوە جگە لە ئەفسانەكانی پێشینان ، هیچی دیكە نیە .

دیارە ئێمە دوایی هەڵوەستەی زیاتر دەكەین ، كە بۆچی ئەوەیان گوتوە ؟!

ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات ، دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ ، وە یاد بکەوەو سەرنج بدەو تێبیرامێنە ! چەند نەفام بوون ، کاتێك گوتیان : ئەی خوایە ! ئەگەر ئەم قورئانە هەقە لەلایەن تۆوە ، ئەوە لە ئاسمانەوە بەرد بارانمان بکە ، یاخود سزاو ئازارێکی بەئێشمان بۆ بنارێنە .

ئەوەیە حاشای ئامادەبووان و خوێنەران کە دەڵێ : (کەری دێزە ، حەز بە مەرگی خۆی و زیانی خاوەنی دەکات) ! جاری وایە کە ئینسان زۆر بە کوفرو بێبڕوایی دا ڕۆدەچێ ، دەشزانێ هەق لە کوێیە ، بەلام پێی خۆشە لە ناهەقیی دا سەری بە فەتارەت بچێ ، بەلام نەگاتە هەق !

ئنجا خوا باسی یاسایەکی خۆی دەکات ، بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئۆممەتی پێغەمبەر دا ، دەفەرموێ : ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ﴾ ، وە ناگونجێ خوا سزایان بدات ، هەتا تۆیان لەنێودابی ، دیارە مەبەست پێی سزای بنەبڕکردنە ، وەك چۆن خوای بالادەست گەلی هوودو صالح و شوعەیب و لووط و ئەوانی دیکەی لەبەین بردن ، خوای کارزان ئۆممەتەکەی تۆ بنەبڕ ناکات ، چونکە تۆ بۆ هەموو مرۆڤایەتیی نێردراوی ، بەلام پێغەمبەرانی دیکە بۆ کاتێکی دیارییکراوو ، بۆ خەڵکێکی دیارییکراو نێردراون ، کە ئەگەر ئەو خەڵکەش لەبەین چووبان ، خەڵکی دیکە هەبوون ، بەلام هەموو خەڵك ئۆممەتی موحەممەدە ، ناکرێ خوا هەموویان لەنێو ببات ، ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾ ، هەروەها خوا سزادەریان نابێ ، هەتا داوای لێبوردن ( لە خوا) بکەن ، ئنجا خوا باسی ئەوە دەکات ، کە چ شتێك ڕێگرە لەبەردەم ئەوەدا کە خوا سزایان بدات : ﴿ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓاْ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا

﴿يَعۡلَمُونَ﴾ ، ئایا چ شتێك ڕێگرە کە خوا سزایان بدات ، یان بۆچی خوا سزایان نادات ؟ لە حاڵێکدا کە خەڵکی (مسوڵمان) لە مزگەوتی حەرام قەدەغە دەکەن ، (ڕێگا نادەن بچن بۆ حەج و عومرە) ، کە هەرچەندە لافی ئەوەشیان لێدەدا ، بەڵام ئەوان دۆست و دڵسۆزی مزگەوتی حەرام نەبوون ، بەڵکو دۆستانی وی ، تەنیا پارێزکارانن ، بەڵام ئەوان زۆربەیان نازانن ، (کە دۆستایەتیی کردنی ماڵی خوا دەبێ چۆن بێ و بە چ شێوازێك بێ ؟) .

پاشان باسی ئەو چالاکییانەیان دەکات کە لە دەوروبەری مزگەوتی حەرام ئەنجامیان دەدان و ، بە حیسابی خۆیان ناویان لێ نابوون خواپەرستیی ، دەفەرموێ : ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمۡ عِندَ ٱلۡبَيۡتِ إِلَّا مُكَآءٗ وَتَصۡدِيَةٗ﴾ ، وە نوێژو خواپەرستییان لە لای ماڵی خوا ، هەر بریتی بوو لە فیکە کێشان و چەپڵە لێدان ، (بەڵکو زۆرجار پیاوان و ئافرەتانیان بە ڕووتیی بە دەوری کەعبەدا دەسووڕانەوە) ، ﴿فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ﴾ ، لە دواڕۆژدا پێیان دەگوترێ : سزاو ئازار بچێژن ، بەهۆی ئەوەوە ، کە ئێوە بێبڕوا بوون !

ئنجا خوای پەروەردگار باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات ، کە لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی دا ئاماژەمان پێدا ، دەفەرموێ : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيۡهِمۡ حَسۡرَةٗ ثُمَّ يُغۡلَبُونَ﴾ ، بێگومان ئەوانەی بێبڕوا بوون ، سامانەکانیان خەرج دەکەن ، تاکو خەڵك لە ڕێی خوا لابدەن ، (یانی دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان دەکەن) ، ئنجا سامانەکانیان خەرج دەکەن ، دوایی تێدەشکێن و بۆیان دەبێتە مایەی خەم و خەفەت ، بۆچی ؟ چونکە ئەو ئامانجەی کە ماڵەکەی بۆ سەرف دەکەن ، کە تێشکاندنی ئیسلام و مسوڵمانانە ، نایەتەدیّ ، کەواتە : سەرەنجام دەکەونە زەرەریّ ، ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحۡشَرُونَ﴾ ، وە ئەوانەی بێبڕوان ، بەرەو دۆزەخ کۆدەکرێنەوەو خڕ دەکرێنەوە .

ئنجا بۆچی خوا بازاڕی بەرەنگاربوونەوەی ئیسلامو مسولْمانانو كافران دێنێتە پێش ؟ دەفەرموێ : ﴿ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُۥ فِي جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾ ، بۆئەوەی خوا پیس لە پاك جیابكاتەوە ، وە پیس هەمووی لەسەر یەك كۆبكاتەوەو كەڵەكەی بكاتو ، بیخاتە دۆزەخەوە ، هەر ئائەوانەن زیانبارانی ڕاستەقینە ، كە بەو شێوەیە خڕدەكرێنەوە سەریەك ، دواییش دەخرێنە دۆزەخ .

ئنجا لە كۆتایی دا بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ : ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ بەوانەی بێبڕوان بڵێ : ئەگەر وازبێنن لە كوفرو لە دژایەتیی ئیسلامو مسولْمانان ، ئەوەی ڕابردوویان دەبووردرێ ، وە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ (كوفرو دژایەتیی ئیسلامو مسولْمانان) ئەوە یاسای خوا ، لە مامەڵەكردنی لەگەڵ پێشووانو ڕابردووان دا تێپەڕیوە ، (كە مسولْمانان بەسەر كوفردا سەر دەخات) ، وە ئەگەر بۆ كوفر بگەڕێنەوە ئەوە یاسای (خوا) لە پێشووان دا تێپەڕیوە ( كە ئەوانەی لەسەر كوفر دەژینو دەمرن ، لە دواڕۆژدا خوا دەیانخاتە دۆزەخەوە .

پاشان فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ، وە بە بڕواداران دەكات ، دەفەرموێ : ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ ، وە لە دژیان بجەنگن ، تاكو فیتنە نامێنێ .

فیتنە لێرەدا دەگونجێ بە چەند مانایەك بێ :

١/ بەمانای سزادانو ئەشكەنجە دانی خەڵك .

٢/ وە لادانیان لە ڕێی خوا .

٣/ هەڵگێڕانەوەیان ، دوای ئیمان هێنانیان .

٤/ ڕێ لێگرتنیان لەوەی كە ئیمان بێنن .

﴿ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ﴾ ، وه لـه دژیـان بجەنگـن ، تاكـو ملكـەچیی تـەنیـا بـۆ خـوا دەبـێ ، (یانـی : كـەس لـه كـەس ناترسـێ ، ئنجـا ئـەو كاتـه كـه ملكەچیی تـەنیـا بـۆ خـوا بـوو ، ئەگـەر خەڵـك بـه ویستـی ئـازادانـەی خـۆی ئیمـانی هێنـاو ، مسوڵمـان بـوو ، باشـه ، وه ئەگـەر بـه ویسـتی ئـازادانـەی خـۆی ، كـوفری هەڵبژارد ، ئـەوه خـوای كاربـەجێ ئـەو خەڵكەی بـۆ تاقیكردنـەوه دروسـت كـردوه) ، كەواتـه : وشـەی (دیـن) لێـرەدا بـه مانـای ملكەچیـی دێ ، نـەك بـه مانـای ئیسـلام ، چونكـه ئەگـەر ئێمـەش جەنـگ نـەكـەین ، ئیسـلام هـەر هی خـوایـه ، بـەڵام هـەتا مسـوڵمانان هێـزو پێـزیـان نـەبـێ ملكـەچیی تـەنیـا بـۆ خـوا نابـێ ، بـەڵكـو ئەگـەر ملكەچیی تەنیا بۆ خـوا نـەبـێ ، دەسـتـەڵاتو هێزو توانا بۆ طـاغـووتو سـتـەمكارەكـان دەبـێ ، بۆیـەش وا دەڵێـم ، چونكـه زۆربـەی توێـژەرەوانی قورئـان وشـەی (دیـن)یـان هـەر بـه مانای ئیسـلام لـێكداوەتـەوه ، كـه له ڕاسـتییدا ئـەوه هەڵەیـه ، وەك دوایـیـش لـه مەسـەله گرنگـەكان دا تیشـكی زیـاتری دەخەینـه سـەر، ﴿ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴾ ، ئنجا ئەگـەر بێبـڕوایەكان وازیان هێنـاو دەستیان لـه كوفـر هەڵگرت ، یان دەستیان له دژایەتیـی ئیسلامو مسـوڵمانان هەڵـگرت ، ئـەوه خـوا بینـەری ئـەوەیه كـه دەیكـەن ، ﴿ وَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَىٰكُمۡۚ نِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ﴾ ، وه ئەگـەر پشـتیان هەڵكـردو هـەر لـه سـەر مـل وەرسـووڕاندن بـەرەو ناهەق بـەردەوام بوون ، ئـەوه بزانـن كـه خـوا پشـتیوانـی سـەرپەرشـتیـارتانـه ، بێگومـان خـواش بـاشـتـرین سـەرپەرشـتیـارو چاكتـرین سـەرخـەرو دۆسـتـه .

# ضـةند مةســةلـةيةكـى طرنـط

**مەسەلەی یەکەم** : کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ ، لەبارەی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەوە ، کاتی خۆی دوو بەسەرهاتمان هێنان ، دەربارەی ئەو پیلان گێڕانە ، ئێستاش بەسەرهاتێکی دیکە دێنین : ﴿عَنْ المطلّب بْنِ أَبي وَدَاعَة : أنَّ أبا طالِبَ قَالَ لِرَسول اللهِ ﷺ : مَا يَأْتمِرُ بِهِ قَوْمكَ ؟ قَالَ : يُرِيدُونَ أَنْ يَسْحَرُونِي ، أَوْ يَقْتُلُونِي ، أَوْ يُخْرِجُونِي ! فَقَالَ : مَنْ أَخْبَرَكَ بِهَذَا ؟ قَالَ : رَبِّي ! قالَ : نِعْمَ الرّبّ رَبُّكَ﴾[1].

واتە : موتەللیبی کوڕی ئەبی ویداعە دەڵێ : ئەبو طالیب بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت : گەلەکەت چ تەگبیرێك دەکەن ، خەریکی چ پیلانێکن ؟ فەرمووی : دەیانەوێ یان جادووم لێ بکەن ، یان بمکوژن ، یان دەرم بکەن ، ئەبو طالیب گوتی : کێ هەواڵی پێدای ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : پەروەرگارم ، ئەویش گوتی : باشترین پەروەردگار ، پەروەردگاری تۆیە .

ئنجا دەربارەی وشەی (مَكْر) ، (محمد رشيد رضا) گوتوویەتی[2] : (المَكْرُ : التَّدْبيرُ الخَفيُّ لإيصالِ المَكْروهِ إلى المَمْكورِ بِهِ مِنْ حَيْثُ لاَ يَحْتَسِب ، وَوِقَايَةُ المَمْكورِ لَهُ مِنَ المَكْرُوهِ كَذَلِكَ).

واتە : (مَكْر) بریتیە لە تەگبیرێکی پەنهان بۆ گەیاندنی زیان بە کەسێك کە دەویستری (مَكْر)ی لە دژ بکرێ ، بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ ، هەروەها پاراستنی کەسێك کە پیلانی لە دژ دەگێڕدرێ ، کە زیانی پێ بگەیەنرێ .

---

١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرِي ، ج ٩، ص ١٤٩، وَقَالَ مُؤَلفا الإسْتِيعَاب ، ج ٢، ص ٢٣٨ قُلْنَا: هَذَا إِسْنَادٌ حَسَنٌ .

٢) تفسير القرآن الحكيم ، ج ٩ ، ص ٥٥٧ .

وە جگە لەم ئایەتەش ، وشەی (مَكْر) لە فەرمایشتی پێغەمبەردا بۆ خوای پەروەردگار بەکارهێنراوە ، بۆ وێنە : پێغەمبەری خوا لە یەکێك لە دوعاکانی خۆیدا دەیفەرموو : ﴿وامْكُرْ لِي وَلا تَمْكُرْ عَلَيَّ﴾ }أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبي شَيْبَة ، برقم : (٢٩٣٩٠) ، وَأَحْمَد ، برقم : (١٩٩٧) ، وَأَبُو دَاوُدَ ، برقم : (١٥١٠) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (٣٥٥١) وَقَالَ : حَسَن صَحِيحٌ ، وَابْنُ مَاجَهْ ، برقم : (٣٨٣٠) ، وَالحَاكِمُ ، برقم : (١٩١٠) وَقَال : صَحِيحُ الإِسناد ، وَالبُخَارِي فِي الأَدَب المُفْرَد برقم : (٦٦٥) وَصَحَّحَهُ كُلّ مِن الأَلباني وَشُعَيْب الأرنؤوط{ .

واتە : (ئەی خوایە !) تەگبیرم بۆ بکەو تەگبیرم لە دژ مەکە .

بەلاّم ئەگەر بە کوردی لێکی بدەینەوە ، دەبێ بڵێین : فێڵم بۆ بکەو فێڵم لە دژ مەکە ، بەلاّم وەك گوتم : وشەی (مَكْر) لە زمانی کوردییدا زیاتر بۆ مەبەستی خراپ بەکاردەهێنرێ ، یاخود مانایەکی نەگونجاوی هەیە ، بۆیە من بەکاری ناهێنم ، دەڵێین (مَكْر) واتە : تەگبیرکردنێکی پەنهان .

**مەسەلەی دووەم** : کە خوا دەفەرمویّ : ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا قَالُوا۟ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ ۙ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾﴾ ،

وە کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا خوێنرانەوە ، گوتیان : ئەوە بیستمان ئەگەر ویستبامان ئێمەش قسەی وامان دەکرد ، ئەوە جگە لە ئەفسانەکانی پێشینان ، هیچ شتێکی دیکە نیە .

کە دەڵێن : ﴿قَدْ سَمِعْنَا﴾ ، واتە : ئەوە تێگەیشتین ، لێی حاڵی بووین ، وەك چۆن کەسێك قسەت بۆ دەکات ، تۆش وەك بەهەند وەرنەگرتنی قسەکەی ، بڵێی : تێگەیشتم ، تێگەیشتم ، دەزانم دەڵێی چی ؟ ! یانی : قورئان قسەیەکی هێندە گرنگ نیە ، هێندە فەرمایشتێکی گەورەو بایەخدار نیە ، ئەوە لێی حاڵی بووین .

کە دەڵێن : ﴿لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ﴾ ، ئەگەر ویستبامان ، ئێمەش وێنەی ئەو قسەیەمان دەکرد ، ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ، ئەمە

جگە لە قسەی پێشینان هیچی دیكە نیە ، وەك لە سوورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ : ﴿وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ۝٥﴾ ، واتە : (كافرەكان) گوتیان : ئەوە ئەفسانەی پێشینانە ، بەسەریدا خوێنراوەتەوە بەیانیانو ئێواران ، ئەویش نووسیویەتەوە ، دیارە لێرەدا كە گوتوویانە : ﴿لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ﴾ ، وەك لە مانای گشتییش دا ئاماژەمان پێكرد ، بەڕاستیی كافرەكان قسەیەكی زۆر بێ ئابڕووانەو زۆر بێ شەرمانەیان كردوە ، درۆیەكی شاخداریان كردوە ، ئەگەرنا }مەیدان مشكان نەكێڵاوە{ كەس دەستی نەگرتوون ، زۆریشیان پێویست بەوە هەبوو كە وەڵامی تەحەدداكەی قورئان بدەنەوە ، كە خوای پاكو تاك لە سەرەتاوە فەرمووی : وێنەی هەموو قورئان بێنن ، ﴿فَلۡيَأۡتُواْ بِحَدِيثٖ مِّثۡلِهِۦٓ إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ ۝٣٤﴾ الطور ، واتە : ئەگەر ڕاست دەكەن ، با قسەیەكی وەك وی بێنن .

پاشان فەرمووی : دە سوورەتی وەك قورئان بێنن : ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ۝١٣﴾هود ، واتە : یان ئایا دەڵێن : قورئانی هەڵبەستووەو بۆ خۆی دایناوە ؟ بڵێ : ئێوەش دە سوورەتی وەك قورئان بێنن ، وە هەر كەسێكیش كە لە تواناتاندا هەیە ، جگە لە خوا بانگی بكەن با هاوكارتان بێ ، ئەگەر ڕاست دەكەن .

پاشان بۆی سووكتر كردنو ، تەحەددای كردن بە یەك سوورەتی وەك قورئان ، وەك لە سوورەتی بەقەرەو یونس دا هاتوە : ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ ۝٢٣﴾البقرة ، واتە : وە ئەگەر لە دوودڵیی دابوون لەبارەی ئەوە كە ناردوومانەتە سەر بەندەكەمان موحەممەد

ئـەوە سـوورەتێکی وەك وی بێنن ، وە جگە لە خـواش سـەرجەم شاهیدەکانتان هاوکارەکانتان بانگ بکەن ، ئەگەر ڕاست دەکەن .

وە دەفـەرموێ : ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣٨ ﴾ یونس ، واتە : یان ئایا دەڵێن : قورئانی هەڵبەستووە بۆ خۆی دایناوە ؟ بڵێ : ئێوەش سوورەتێکی وەك قورئان بێنن ، وە هەر کەسێکیش کە لە تواناتاندا هەیە ، جگە لە خوا بانگی بکەن ، با هاوکارتان بێ ، ئەگەر ڕاست دەکەن .

کە دیارە نە قورئانێکیان وەك قورئان پێهات ، نە دە سوورەتیان پێهاتن ، وە نە سوورەتێکیشیان پێهات ، لە حاڵێکیشدا کە زۆریان پێویست بەوە بوو ، وەڵامی تەحەدداکەی قورئان بدەنەوە ، (تەحەدداش یانی : داوای مەیدان داریی کردن) ، بەڵام شایانی باسە خوای پەنهانزان هەر لە سەرەتاوە هەواڵیشی پێداون ، کە ناتوانن ئەو کارە بکەن ، وەك لە سوورەتی بەقەرەدا فەرموویەتی : ﴿ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ ٢٤ ﴾ ، واتە : ئەگەر نەتانکرد ، وە پێشتان ناکرێ .

ئنجا مادام خوا کە پەروەردگاری هەموو جیهانییانەو ، توانای مرۆڤ باش دەزانێ ، بفەرموێ : ناتوانن ، کەواتە : هەرگیز ناتوانن ئەو کارە بکەن .

بۆیە لە ڕاستییدا لێرەدا کە گوتوویانە : ﴿ لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ ﴾ ، درۆیەکی زۆر گەورەیان کردوە ، چونکە نەیانتوانیوە ئەوەی گوتوویانە بە کردار بیسەلمێنن .

**مەسەلەی سێیەم** : کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ٣٢ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمۡ وَأَنتَ فِيهِمۡۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ

مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ ، وە یاد بکەوە کاتێك کافرەکان گوتیان : ئەی خوایە ! ئەگەر ئەم قورئانە هەقە ، لەلایەن تۆوەیە ، لە ئاسمانەوە بەردبارانمان بکە ، یان ئازارێکی بەئێشمان بۆ بێنە . بەڵام بڕیاری خوایە کە هەتا تۆیان (ئەی موحەممەد !) لە نێودابی ، ئازاریان نادات ، وە هەتا داوای لێبوردن (لە خوا) بکەن ، ئازاردەریان نابێ .

ئێمە پێشتر لە هۆی هاتنەخوارەوەکەدا بێژەری ئەو قسەیەمان دەرخست ، کە ئەبو جەهل بووە ،ئەو قسەیەی کردوە ، وە دەشگونجێ وێڕای وی کەسی دیکەش لە کافرەکان ئەو قسەیان کردبێ ، چونکە خوای پەنهانزان بە صیغەی کۆ هێناویەتی ، بەڵام جاری واش هەیە کە کەسێك قسان دەکات بە ناوی کۆمەڵێکەوە ، وەك هەموویان کردبێتیان وایە .

ئنجا لەوبارەوە ئەم دەقە گێڕدراوەتەوە : {رُوِيَ أَنَّ مُعَاوِيَةَ قَالَ لِرَجُلٍ مِنْ سَبأْ : مَا أَجْهَلَ قَوْمَكَ حِيْنَ مَلَّكوا عَلَيْهِ امرأةً ؟ فقَالَ : أَجْهَلُ مِنْ قَوْمِي قَوْمُكَ ، حِيْنَ قَالُوا : (اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ ، وَلَمْ يَقُولُوا : فَاهْدِنَا لَهُ)[1].

واتە : گێڕدراوەتەوە کە موعاویە بە پیاوێکی سەبەئیی گوت : گەلەکەت چەند نەفام بوون ! کە ئافرەتێکیان کردە گەورەی خۆیان ، ئەویش گوتی : نەفامتر لە گەلی من ، گەلی تۆ بوون ، کاتێك کە گوتیان : ئەی خوایە ! ئەگەر ئەم قورئانە هەقە ، لەلایەن تۆوەیە ، لە ئاسمانەوە بەردبارانمان بکە ، یان ئازارێکی بەئێشمان بۆ بنێرەو نەیانگوت : خوایە ! ئەگەر هەقە ڕێنمایمان بکە بۆی .

بە ڕاستیی وەڵامێکی پڕ بە پێستو چاکی داوەتەوە ، بێگومان لەوە نەفامیتر نیە ، بڵێی : ئەگەر ئەوە هەقە لەبەینم بەرەو سزام بدە ، لە جیاتی بڵێی : ئەگەر هەقە ، ڕێنماییم بکە بۆی ، وە دڵم بەرەو لای وەربچەرخێنە .

دیارە لێرەدا خوای کارزان یاسایەکی خۆی دەخاتەڕوو ، کە شێوە مامەڵەی خۆی لەگەڵ بەندەکانیدا ، لەگەڵ ئۆممەتی پێغەمبەری خاتەم دا لە دوو یاسادا ، بەرجەستە دەکات :

---

١) تفسير القرآن الحكيم، ج ٩ ، ص ٥٦١.

یەکەمیان دەفەرموێ : ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ﴾ ، وە خوا ناگونجێ سزایان بدات ، تاکو تۆ لە نێویان دابی ، واتە : سزایەکی وایان نادات بنەبڕیان بکات ، وەك ئەو سزایەی کە میللەتانی دیکەی پێ سزا داون .

دووەمیان دەفەرموێ : ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾ ، وە هەتا داوای لێبوردن لە خوا بکەن ، ئەوە بێگومان خوا ئازاردەریان نابێ .

بە ڕاستی ئەوە موژدەیەکی زۆر خۆشە ، کە خوا دەفەرموێ : هەتا داوای لێبوردن لە خوا بکەن ، ئەوە بێگومان خوا ئازاردەریان نابێ ، دیارە ئەوەش بۆ هەموو بەندەکان هەر وایە .

**مەسەلەی چوارەم** : کە خوا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ ۚ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ الْبَيْتِ إِلَّا مُكَاءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ ، واتە : هیچ پەرچێك نیە لەبەردەم خوای زاڵو مەزن دا ڕێی لێ بگرێ ، کە سزایان بدات ، لە حاڵێکدا کە ئەوان :

١ - خراپەکارن ، چونکە : ﴿ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾ ، خەڵکی بڕوادار لە مزگەوتی حەڕام قەدەغە دەکەن .

٢ - وە چاکەشیان نیە ، چونکە : ﴿ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ ۚ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ ، ئەوان دۆستو دڵسۆزیی مزگەوتی حەڕام نین ، بەڵکو دۆستانی وی بەس پارێزکارانن ، بەڵام زۆربەیان نازانن ، کە دۆستایەتیی و دڵسۆزیی بۆ ئایینی خوا دەبێ چۆن بێ .

٣ - ئەو چاکەیەی هەشیان بوو ، بە کەڵك نەدەهات ، چونکە : ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً﴾ ، وە نوێــــــــــــــژو خواپەرستییانو پاڕانەوەیان لە لای ماڵی خوا ، تەنیا فیکە کێشانو چەپڵە لێدان بوو ، دەجا ئازار بچێژن بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون .

دیارە لە شوێنی دیکەش باسمان کردوە ، کە کافرەکانی مەککە بە خەیاڵی خۆیان لەسەر بەرنامەی ئیبراهیم بوون سەلامی خوای لێ بێ ، ئنجا هەندێ شوێنەواری ئایینی ئیبراهیمو ئیسماعیل لە نێویاندا مابوون ، بەڵام زۆربەیان دەستکاریی کردبوو ، بۆ وێنە : ئەوەی خوا فەرموویەتی ، لە لای کەعبە ، ئەوە بە حیسابی خۆیان خواپەرستیی دەکەن ، فیکەیان دەکێشاو ، چەپڵەیان لێدەدا ، بەڵکو لە شوێنی دیکەدا هاتوە ، کە پیاوانو ئافرەتانیان بەڕووتیی بەدەوری کەعبەدا دەسووڕانەوە ، کە دوایی خوا پشتیوان لە تەفسیری سووڕەتی تەوبەدا ، پێی دەگەین .

کە دەفەرموێ : ﴿فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ ، کەواتە : هاندەرێك هەیە خوا سزایان بدات لەبەر خراپییان ، پاشان هیچ ڕێگرێكو پەرچێکیش نیە ، ڕێ لە خوا بگرێ سزایان بدات ، بەڵکو سێ هۆکار هەن بۆ ئەوەی خوا سزایان بدات ، بەڵام بۆچی سزایان نادات ؟ لەبەر ڕێزی پێغەمبەر ، وە لە دوای ئەوە کە پێغەمبەری خوا یان لە نێودا نامێنێ ، ئەگەر دوعا بکەنو بپاڕێنەوە ، خوا هەر سزایان نادات ، ئەگەرنا شایستەی سزادرانن ، هەر بۆیەش کاتێك پێغەمبەری خوا لە نێویاندا نەماو جەنگی بەدر هاتە پێش ، حەفتا لە ناودارانیان کوژران ، حەفتاشیان لێ بە دیل گیران ، کە ئەوە بەلایەکی زۆر گەورە بوو بۆ هۆزی قوڕەیشی کافر ، کە خۆشیان بە گەورەی نیوە دوورگەی عەرەبیی دەزانی ، ئەو شکستە گەورەیان بەسەربێ ، لەلایەن کۆمەڵێك مسوڵمانی ڕەشو ڕووتەوە ، کە ئەوان سێ بەرانبەری ئەوان زیاتر بوون ، وە چەند بەرانبەری ئەوان چەکیان پێ بوو ، مانای وایە خوای کاربەجێ سزای دان ، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا یان لەنێودا نەما ، وە داوای لێبوردنیشیان لە خوا نەدەکرد ، ئەو دوو ڕێگرە نەمان ، وە پاساویش هەبوون بۆ سزادانیان ، بۆیە خواش سزای دان .

**مەسەلەی پێنجەم** : کە خوا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُۥ فِي جَهَنَّمَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ ، واتە : ئەوانە لەجیاتی ئەوەی نیعمەتی خوا لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنن ، نیعمەتی خوا لە دژایەتیکردنی ئایینی خواو ، لە چەوساندنەوەی بەندەکانی خوادا بەکاردێنن ، چەند سپڵە بوون ؟!

بۆیە خوا لە حەوت بڕگەدا ، باسی ئەو ماڵ خەرج کردنەیانو ، پاشان سەرەنجامەکەیو ، دوایی ئەو نەهامەتییەی دێتە سەریان لە دنیاو دوارۆژدا ، باس دەکات :

١) ﴿ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ﴾ ، ماڵو سامانیان خەرج دەکەن ، بەڵام دوایی بۆیان دەبێتە مایەی داخو خەمو خەفەتو پەشێمانیی ، کەسێك ماڵ خەرج دەکات بۆ ئەوەی بەرهەمێکی دەست بکەوێو ، ببێتە مایەی بەختەوەرییو دڵخۆشیی ، کەچی ئەوان ماڵ خەرج کردنەکەیان ، بۆ دەبێتە داخو خەفەتو حەسرەت .

٢) ﴿ ثُمَّ يُغْلَبُونَ ﴾ ، کابرا بۆیە ماڵو سامانی خەرج دەکات ، تاکو بەسەر بەرانبەرەکەی دا زاڵ بێ ، بەڵام ئەوان ماڵەکەش خەرج دەکەن ، کەچی دواییش تێدەشکێن .

٣) ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴾ ، وە ئەوانە لە دوارۆژدا ، بەرەو دۆزەخ کۆدەکرێنەوە .

٤) ﴿ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ﴾ ، بۆئەوەی لە ئەنجامی بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئیسلامو کوفردا ، خوا پیس لە پاك جیابکاتەوە ، کە لە کوێدا پیسو

پـاك لـه یەكـدی جیادەبنــەوە ؟ لـه مەیـدان دا لێـك جیادەبنــەوە ، ئەگــەرنا لـه شـێنــەیی دا خــەڵك هــەمووی پێكــەوەیه ، وەك كــوردەواریی خۆمـان دەڵـێن : (لـه بوارێدا لاقی ڕەش و سپی دەردەكەون) خەڵك كه دەیانەوێ لـه ڕووبـار بپەڕنــەوە ، لاقان هەڵدەكەن ، ئـەوكاتـه دەردەكـەوێ لاقــی كــێ ڕەشــەو ، هــی كــێ سپییــه ؟ یانی له كاتی تـەنگانـەو ڕووبـەڕووبوونـەوەدا ، ماهیەتی مرۆڤـەكان دەردەكـەوێ ، هـەروەها عــەرەب گوتوویانـه : (عِنْدَ الإمْتِحَانِ ، يُكْـرَمُ الْمَرْءُ أَوْ يُهَـان) .

واتـه : له كاتی تاقی كـردنـەوەدا ، ئینسان ڕێـزی لـێ دەگیـرێ ، یـاخود ســووك دەكرێ ، بـەپێی دەرەنجامەكـەی ، كـه وەدەستـی دەهێنـێ .

٥) ﴿وَيَجْعَلَ ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا﴾ ، وه پــــــیس هـەندێــكی دەخاتــه پـاڵ هــەندێكیو ، لەســەر یەكــدی كـەڵەكــەی دەكـات ، وەك عـەرەب دەڵێن : (الطّيورُ عَلَـى أشْكـالِهَا تَقـعُ) ، واتــه : بـاڵندەكـان هـەر كامەیـان هۆگــری شــێوەی خۆیـەتی ، كــەو لەگـەڵ كــەوێ ، كۆتر لەگـەڵ كۆتــرێ ، هــەرگیز كۆترو كــەوان پێكــەوە نابینــی ، هەروەهـا بـاڵندەكـانی دی ، بــه هــەمان شێوە ، دیـاره خـوای كاربـەجێ یـاسای وایه ، پیس ڕەگـەڵ پـیس دەخـاتو ، لەســەر یـەكی كـەڵەكه دەكات ، وەك چـۆن پـاكانیش دەخاتـه گـەڵ پاكـان .

٦) ﴿فَيَجْعَلَهُۥ فِى جَهَنَّمَ﴾، ئـەو پیسـەی كـه هـەندێكی خستۆتە سـەر هەندێكیو ، لەســەر یەكـدی كـەڵەكــەی كــردوە ، دوایــی دەیگێـڕێ بـۆ نێـو دۆزەخ ، كــه ئــەوە سـەرەنجامەكـەیه .

٧) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ ، ئـا ئـەوانـه زیـانبـارانن ، هـەڵبـەتـه له هـۆی هاتنـەخـوارەوەكــەی دا بـاســـمان كـــرد ، كـــه ئـەمـــه دەربــارەی كۆمەڵـێــك لــه نـاودارانــی قــورەیش كــه بــاب ، یــان كــوڕ ، یـان مـام ، یـان برایـان لـه جـەنگی بـەدردا كوژرابوو ، دوای ئـەوەی كاروانەكـەی ئـەبو سوفیـان بۆ مەككه گەڕایـەوە ، مـاڵو ســامانێكی زۆری ســامانداران و دەوڵەمەنـدانی ســەرانی قورەیشی تێـدا بــوو ، بەسـەر خەڵكەكەوە گـەڕان ، گوتیـان : بـا ئــەو پـارەو سامانــه تـەرخـان بكـەیــن بـۆ خـۆ ئــامادەكردنی جەنگێــك لـه دژی موحـەممـەدو هـاوەڵانی ، تاكـو تۆڵـەی

خۆمـان بكەینـەوە ، ئـەم ئایەتـە مەبەسـتی پێـی ئـەوەیە ، بـەڵام زۆرجـاری دیكەش گوتوومانە : (إِنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لاَ يَمْنَعُ شُمُولَ الـمَعْنَى) .

واتـە : ئـەوە كـە هۆیەكـەی تایبەتـە ، رێگرنابـێ لەبـەردەم گشتگیـریی ماناكەیدا ، ئێستاو لە پێش ئێستاش‌و دوای ئێستاش هەر وایە .

ئەو بێبڕواو كافرانەی كە ماڵ‌و سامان خەرج دەكەن ، بۆ پیلان گێڕان دژی ئیسلام‌و مسوڵمانان ، هیچیان پێناكرێ ، بە مەرجێك ئەهلی ئیسلام ، ئەهلی ئیسلام بن ، ئەگەر پابەندبن بە شەریعەتی ئیسلامەوە ، هەر پیلانێكیان لە دژ بگێڕدرێ ، خوای پەنهانكار پیلانەكەیان دەكاتە نەخشی سەر ئاو ، بەڵام دیارە خوای كاربەجێ لەگۆترە پشتی ئیمانداران ناگرێ ، وە پشتی هەر كەسێك ناگرێ كە ئیددیعای ئیمانی كرد ، بەڵكو بە ئەندازەی هەبوونی ئیمان ، وە بە ئەندازەی بۆ خوا صولحان ، خوا پشتی مسوڵمانان دەگرێ .

كەواتە : ئەگەر پشتیان نەگیراو هاوكارییان نەكرا ، وە پیلان‌و فێڵی دوژمنان لەوێدا كاریگەر بوو ، وە جێی خۆی گرت ، وە باروودۆخی مسوڵمانان خراپ بوو ، ئەوە لەبەر ئەوەیە كە خوا لەگەڵ ئیمانداراندا نیە ، لەبەر ئەوەی ئیمانداران بەو شێوەیە نین ، كە خوا لەگەڵیان دابێ‌و پشتیان بگرێ ، بۆیە پیلان‌و فێڵی كافران ، لەواندا كاریگەریی هەیەو ، زیانیان پێدەگەیەنێ ، لێمان تێكنەچێ ! خوا نەیفەرمووە : هەرچی گوتی : مسوڵمانم ، من لەگەڵیدام ، بەڵكو فەرموویەتی : ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ١٩﴾الأنفال ، بێگومان خوا لەگەڵ ئیمانداران دایە ، یان دەفەرمویێ : ﴿وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ١٣٩﴾آل عمران ، واتە : ئەگەر ئێوە بڕواداربن[1] ، لەسەرەوە دەبن ، نەیفەرمووە : ئەگەر مسوڵمان بن ، بەڵكو هەر دەفەرموێ : ئەگەر بڕواداربن ، بۆیەش روونم كردەوە ، بۆ ئەوەی لە بەڵێنە دڵنیایی‌و مسۆگەرەكانی خوا ، نەكەوینە گومانەوە ، وە كاتێك بەڵێن‌و موژدەیەكی خوا بۆ ئێمە نایەتە دی ، ئەوە بە تەئكید خەتای خۆمانە ، بۆیە دەبێ چاو بە خۆماندا بگێڕینەوە .

---

١) دیارە (مسوڵمان) و (بڕوادار)یش لە یەك جیان ، وەك لە بەرگی دووەمی : (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) داو ، لە بەرگی یەكەمی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا روونمان كردۆتەوە .

**مەسەلەی شەشەم :** كە خوا ﷻ دەفەرموێ : ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ ، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : بەوانەی بێبڕوان ، بفەرموو : ئەگەر واز بێنن ، ڕابردوویان لێ دەبووردرێ ، وە ئەگەر جارێكی دیكە بشكەڕێنەوە بۆ دژایەتیی ئیسلام‌و مسوڵمانان ، ئەوە یاسای خوا تێپەڕیوە ، واتە : یاسای خوا لە پێش واندا تێپەڕیوە ، كە هەر كەسێك دژایەتیی ئایین‌و بەرنامەو پێغەمبەرانی خوای پەروەردگاری كردبێ ، سەرەنجامی شكست‌و تێشكان‌و بێ‌مرادیی بووە .

ئنجا لەوبارەوە كە ئەگەر واز بێنن ، خوا لێیان دەبووری ، با ئەم دەقە بێنین ، ﴿عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ : فَلَمَّا جَعَلَ اللهُ الإِسْلامَ فِي قَلْبِي أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ أُبْسُطْ يَمِينَكَ فَلأُبايِعْكَ ! فَبَسَطَ يَمِينَهُ ، فَقَبَضْتُ يَدِي ، قَالَ : (مَا لَكَ يا عَمْرُو) ؟ قَالَ : قُلْتُ : أَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِطَ ، قَالَ : (تَشْتَرِطُ بِمَاذَا) ؟ قُلْتُ أَنْ يُغْفَرَ لِي ؟ قَالَ : (أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الإِسْلامَ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ ، وَأَنَّ الْهِجْرَةَ تَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهَا ، وَأَنَّ الْحَجَّ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ)﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ ، برقم : (٣٣٦)} .

واتە : عەمری كوڕی عاص دەڵێ : كاتێك خوا ئیسلامی خستە دڵم ، چوومە لای پێغەمبەر ﷺ گوتم : دەستت بێنە با پەیمانت پێ بدەم‌و ئیمانت پێ بێنم ، ئەویش دەستی هێناو منیش دەستم گێڕایەوە ؟ فەرمووی : ئەوە چیتە ئەی عەمر (بۆ دەستت گێڕایەوە) ؟ دەڵێ : گوتم : ویستم مەرج بگرم ، فەرمووی : چ مەرجێك دەگری ؟ گوتم : مەرجی ئەوە دەگرم (خوا) لێم ببووری[1] ، ئەویش فەرمووی : ئەدی ئەی عەمر ! نازانی ئیسلام پێش خۆی لادەبات ، وە كۆچكردن پێشی دەڕووخێنێ‌و لایدەبات ، وە حەج كردن ، پێش خۆی دەسڕێتەوەو لایدەبات .

---

١) عەمر یەكێكە لەوانەی هەر لە سەرەتاوە دوژمنێكی سەرسەختی مسوڵمانان بووە ، هەر لە سەرەتا چوونی مسوڵمانان بۆ حەبەشە عەمری كوڕی عاص شاندی كافرەكان بوو ، بۆ ئەوەی بچێ بۆ ئەوانە بێنێتەوە كە چوون بۆ حەبەشە، بەڵام لە هەوڵەكەیدا شكستی هێنا !

واتــە : کــە تــۆ مسوڵمــان بــووی ، مسـوڵمانەتییەکــەت گوناهــەکانی پێشــووت دەسـڕێتـەوە .

وە کـــە دەفـــەرموێ : ﴿فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ ، یـــانی : (فَقَـدْ مَضَـتْ سـنة اللهِ فِي الأَوَّلِين) .

واتـە : یاسای خوا لە مامەڵەکردنی لـەگەڵ پێشووانـدا تێپـەڕیـوە ، کـە بریتیـە لـە چی ؟ بریتیــە لەوەی شـکستیان بـە ملـدا دێنـێ‌و ، ڕەنج بـەخەساریان دەکات .

**مەسـەلـەی حەوتـەم‌و کۆتـایی :** کـە خــوا دەفـەرموێ : ﴿وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِن تَوَلَّوْاْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٤٠﴾﴾ ، ئێمـە لە چەند بڕگـەیەکدا ئـەم ئـایەتـە دەتوێژینـەوە :

**ڕوونکـردنـەوەی چـەنـد ڕاســتییـەك‌و ڕاسـتکردنـەوەی چـەند هـەڵـەیەك**

١/ ﴿وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ ، لەگەڵیـانـدا بجەنگن ، تاکـو فیتنـە نامێنــێ ، فیتنـــە یـــانی : چـــی ؟ زۆربـــەی توێژەرەوانـــی قورئـــان گوتوویانـــە : (الفِتْنة : الشِّرْك) مەبـەست لە فیتنـە ، هاوبـەش بۆ خـوا دانانـە ، بـەڵام مـن زۆر بــە ڕوون‌و ڕاشـکـاویی دەڵێـم : ئــەم مانــایە لــێرەدا هـەڵــەیەو ، ناگونجــێ لێـرەدا وشـەی (فِتْنة) بـە مانـای شـیـرك بێ ، بۆچی ؟

چونکـە خــوا دەفـەرموێ : لەگەڵیـانـدا بجـەنگن ، تاکـو فیتنــە نامێنــێ ، ئنجـا ئەگەر (فِتْنة) بـە مانـای شـیــرك‌و کـوفر بــێ ، واتــە : لەگەڵیـانـدا بجەنگـن تاکـو مسوڵمانیـــان دەکـــەن ، واتـــە : بـــە زۆر مسوڵمانیـــان دەکـــەن ، کەچـــی خـــوای پەروەردگاریش لە چەنـدان شوێنی قورئـان دا دەفـەرموێ : بـە زۆرو بــە تۆبزیــی کـردن مسـوڵمان بوون نیــە ، بۆ وێنـە :

أ) دەفەرموێ : ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴿٢٥٦﴾ ﴾ البقرة .

ب) وە دەفەرموێ : ﴿ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾ یونس .

ج) وە دەفەرموێ : ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ﴿٤١﴾ ﴾ الزمر .

د) وە دەفەرموێ : ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖ ﴿٤٥﴾ ﴾ ق .

هـ) وە دەفەرموێ : ﴿ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ الغاشیة .

کەواتە : مانای ڕاست ئەوەیە کە (فِتْنَة) لێرەدا واتە : ئەشکەنجەدانی کافران بۆ مسولْمانان ، تاکو لە ئایینەکەیان هەڵیانگێڕنەوە ، ئەوانەی کە مسولْمان بوون ، یاخود ڕێیان لێ بگرن ، کە مسولْمان ببن ، یانی : جەنگ بۆیە دەکرێ ، تاکو ئەزیەتو ئازار لەسەر مسولْمانان نەهێڵرێ ، نەك بۆ ئەوەی کافرەکان بە زۆر مسولْمان بکرێن ، چونکە کوفرو شیرکو هەر بیروبڕوایەکی دیکە ، بە زەختو زۆرو بە هەڕەشەو گوڕەشەو ترساندنو تۆقاندنو بە کوشتنو بڕین ، لە دڵی کەس نایەتە دەر ، وە خوای بەرزو مەزنیش مرۆڤەکانی ئازاد کردوە فەرموویەتی : ﴿ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴿٢٩﴾ ﴾ الکهف ، واتە : هەر کەس دەیەوێ با ئیمان بێنێ ، وە هەر کەس دەیەوێ با کافر بێ ، چونکە دینداریی کردنو مامەڵەکردن لەگەڵ خوای بێ وێنەدا بە زۆر ناکرێ .

٢ / ﴿ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ﴾ ، دین هەمووی بۆ خوا دەبێ ، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان بە (محمد رشید رضا)شەوە ، کە بۆچوونی زۆر وردو باشی هەن ، بەڵام ئەویش لەوەدا نەیپێکاوە ، دەتوانم بڵێم هەموو ئەو توێژەرەوانەی مـن سەرنجی تەفسیرەکانیانم داوە ، گوتوویانە : (الدِّينُ : الإِسْلاَم) ، واتە : لەگەڵیاندا بجەنگن ، تاکو ئیسلام هەمووی تەنیا بۆ خوا دەبێ !

بەڵام دەڵێم : نەخێر ئەم مانایە ڕاست نیە ، بەڵکو دین لێرەدا بە مانای ملکەچیی‌و ژێردەستیی دێ ، واتە : لەگەڵ کافرەکاندا بجەنگن ، تاکو ملکەچیی مرۆڤەکان هەمووی بۆ خوا دەبێ ، هیچ کام لە بەندەکانی خوا ، هیچ

طاغووتێك ، هیچ فیرعەونێك ، هیچ دیكتاتۆرێك ، ناتوانێ خەڵكەكە بچەوسێنێتەوە ، وە ڕێی دینداریی ئازادانەیان لێ بگرێ ، ئەگەرنا ئەگەر مسوڵمانانیش جەنگ نەكەنو دەستەڵاتیان نەبێ ، ئیسلام هەر هی خوایە ، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ : لەگەڵیان بجەنگن ، تاكو (دین) تەنیا هی خوا دەبێ ، كەواتە : (دین) ناگونجێ مەبەست پێی ئیسلام بێ ، چونكە ئیسلام هەر هی خوایە ، وەك گوتم : ئێمەی مسوڵمانان جەنگو جیهاد بكەین ، یان نەیكەین ، ئەوە دیارە ئیسلام هەر هی خوایە ، بەڵام ملكەچیی دەگونجێ بۆ خوا بێ ، وە دەشگونجێ بۆ جگە لە خوا بێ ، وە وشەی (دین)یش وەك زۆرجاری دیكەش گوتوومانە : بە چوار مانا بەكارهاتوە ، كە بریتین لە :

١) ملكەچیی . ٢) سزاو پاداشت .

٣) بەرنامەی ژیان . ٤) ئیسلام .

بەڵام لێرەدا ناگونجێ بە مانای سزاو پاداشت ، یان بەرنامەی ژیان ، یان ئیسلام بێ ، بەڵكو بە مانای ملكەچیی ، بەكارهاتوە .

٣ / ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ ، ئنجا ئەگەر دەستیان هەڵگرت ، ئەوە بێگومان خوا بینەری ئەوەیە كە دەیكەن .

لێرەشدا زۆربەی توێژەرەوان گوتوویانە : (﴿فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ﴾ : (أي : انْتَهَوا عَنِ الكُفْر والشرك) .

واتە : ئەگەر وازیان لە شیركو كوفر هێنا .

بەڵام ئەوەش مانا لێكدانەوەیەكی ڕاست نیە ، بەڵكو واتە : هەر كاتێك دەستیان هەڵگرت لە دژایەتیی كردنی مسوڵمانان ، (أي : انْتَهَوا عَنْ مُعاداة المسلمين) بۆچی ؟ چونكە جەنگ بۆ ئەوە ناكرێ ، تاكو خەڵك واز لە كوفرو شیرك بهێنێ ، بەڵكو جەنگ بۆ ئەوە دەكرێ ، تاكو خەڵك ئازاد بێ ، ئنجا ئەو كاتە ئیمان هەڵدەبژێرێ ، یان كوفر ، بۆخۆی سەرپشكە ، بەڵام دوایی دیارە باجی هەڵوێستەكەی خۆی دەدات ، لە دواڕۆژدا ، بەڵام لە دنیادا ئەوە دیارە كە خوا خەڵكی ئازاد كردوە ، وە هیچ واتایەك بۆ تاقیكردنەوەی

بەندەکانی خوا نامێنێتەوە ، ئەگەر زۆریان لێ بکرێ ، بۆ ئەوەی مسوڵمان بن ، وە کەسێکیش کە زۆری لێ دەکرێ ، نابێتە مسوڵمان ، بەڵکو دەبێتە مونافیقو دووڕوو ، وە ئەگەر ئیسلام هەر ناچارییش بێ یەکێکیان هەڵبژێرێ ، وەك (أَهْوَنُ الشَّرَّيْن) ئیسلام پێی خۆشە مرۆڤ کافرێکی ئاشکرابێ ، نەك کافرێکی پەنهان ، مسوڵمانێکی ساختەو دەغەڵ نەبێ ، بەڵکو کافرێکی ئاشکرابێ ، کە بە ڕوونو ڕاشکاویی کوفری خۆی ڕابگەیەنێ ، کە بە تەئکید ئەوە باشتر دەتوانین مامەڵەی لەگەڵدا بکەین ، وە هەمیشە ئەهلی نیفاقو ئەوانەی کە دووڕوو دەغەڵ بوون ، وە گورگ بوون لە پێستی مەڕدا ، زەرەرو زیانیان بۆ ئیسلامو ئەهلی ئیسلام زیاتر بووە ، لە کافرانێك کە هاتوونە مەیدانو ، بە ئاشکرا کوفری خۆیان ڕاگەیاندوە ، ئنجا ئەو کاتە ، یان لەگەڵ مسوڵمانان سازاندوویانەو پەیمانیان بووە ، یاخود دژایەتییان کردوون .

٤ / ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ ، بێگومان خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن ، ئەوەی کە دەیکەن چییە ؟ بریتییە لە دژایەتیی کردنی ئیسلامو مسوڵمانان ، ئنجا یان لەگەڵیان ئاشتو تەبا دەبن ، یاخود سەنگەریان لێ دەگرن ، ئەگەرنا ئەگەر مەبەست پێی شیركو كوفر بووایە ، دەیفەرموو : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ ، یان تەعبیرێکی لەوجۆرە ، چونکە کوفرو شیرك ، لە دڵ دایە ، بەڵام ئەوە دژایەتییو دۆستایەتییە ، کە لەسەر ئەرزی واقیع ئەنجام دەدرێ ، ئنجا ئەم ئایەتە وەك ئایەتی ژمارە (١٦)ی سوورەتی (الفتح) وایە کە دەفەرموێ : ﴿قُل لِّلۡمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ سَتُدۡعَوۡنَ إِلَىٰ قَوۡمٍ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ تُقَٰتِلُونَهُمۡ أَوۡ يُسۡلِمُونَ ١٦﴾ ، واتە : ... لە دژیان دەجەنگن ، یاخود ملکەچ دەبنو دێنە قۆناغی صوڵحو ئاشتییەوە .

چونکە ناگونجێ بڵێی : بۆیە لە دژت دەجەنگم تاکو مسوڵمان بی ، هەرگیز ئیسلام جەنگی نەکردوە لە دژی خەڵك ، بۆ ئەوەی مسوڵمان بن ، بەڵکو جەنگی بۆ ئەوە کردوە ، تاکو لەگەڵی ئاشتیخوازبنو ، لەگەڵی بێنە پای صوڵحو پێکەوە ژیان .

وە باشترین بەڵگەش لەوبارەوە ئایەتی (٢٥٦)ی سووڕەتی بەقەڕەیە کە دەفەرموێ : ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾ ، واتە : تۆبزیی کردنو زۆر لێکردن لە دیندا نیە ، وە ئەو ئایەتەیە کە خوا لە سووڕەتی (یونس)دا دەفەرموێ : ﴿ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩ ﴾ ، واتە : وە ئەگەر پەروەردگارت ویستبای (زۆریان لێ بکات) تێکڕای خەڵکی ئیمانیان دەهێنا ، ئنجا ئایا (کە خوا نەیویستوە زۆریان لێ بکاتو بەندەی خۆیشینی) ، تۆ زۆر لە خەڵك دەکەی تاکو ببێتە بڕوادار ؟! کە لێرەدا ڕووی دواندن لە خودی پێغەمبەری خوایە ، کە دیارە ئەم پرسیارکردنە ، پێی دەگوترێ : پرسیارکردنی نکووڵیی لێکەرانە ، (الإستفهام الإنكاري) واتە : تۆ چاوەڕێی وەڵام ناکەیو ، وەڵامەکەی لە نێو خۆیدایە ، واتە : تۆ ئەی موحەممەد ! بۆت نیە شتی وا بکەی .

٥ / ﴿ وَإِن تَوَلَّوۡاْ ﴾ ، سێ واتایان بۆ لێکداونەوە :

أ - (تَوَلَّوا عَنِ الإِيْمَانِ وَاسْتَمَرُّوا عَلَى الكُفرِ) ئەگەر پشتیان هەڵکرد ، واتە : پشتیان لە ئیمان کردو لەسەر کوفر بەردەوام بوون .

ب - (تَوَلَّوا عَنِ السِّلْمِ وَالتَّعَايش وَاسْتَمَرُّوا عَلَى العَدَاوَةِ) ، ئەگەر پشتیان لە ئاشتی پێکەوە ژیان کرد ، وە بەردەوام بوون لەسەر دژایەتی .

ج - (تَوَلَّوا عَنِ الإِيْمَانِ وَعَنِ السِّلْمِ كلَيْهِمَا) ، من پێم وایە ئەمەیان ڕاستترە ، واتە : ئەگەر پشتیان هەڵکرد ، چونکە خوا بە گشتی فەرموویەتی ، هەم پشت لە ئیمانو ئیسلام دەکەن ، وە هەم پشت لە ئاشتییو تەباییو پێکەوە ژیانیش دەکەن .

٦ / ئنجا دەفەرموێ : ﴿ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَىٰكُمۡۚ نِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ﴾ ، ئەوە بزانن کە خوا سەرپەرشتیارتانە ، وە بێگومان خوا باشترین سەرپەرشتیارو دۆستو ، باشترین یارمەتیدەرو سەرخەرتانە .

بەڵام ئایا مەبەست ئەوەیە کە مادام ئێوە مسوڵمانن‌و ئەوانیش کافرن ، خوا بەبێ هۆکار سەرتان دەخات بە سەریاندا ؟ بێگومان نەخێر ، بۆچی ؟ چونکە خوا کە ئەم دنیایەی داناوە ، دنیای هۆکارەکانە ، وە ئێمەی بۆیە لەسەر ئەم زەوییە داناوە ، تاکو تاقییمان بکاتەوە ، وەك دەفەرموێ : ﴿وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖ ۝٤﴾ محمد ، واتە : ئەگەر خوا ویستبای تۆڵەی لێ دەستاندن‌و ، بە سەریاندا سەردەکەوتن ، بەڵام خوا دەیەوێ هەندێکتان بە هەندێکتان تاقی بکاتەوە .

ئنجا ئێمە تەماشا دەکەین : خوا فەرمان بە ئێمە دەکات دەفەرموێ : ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ ۝٦٠﴾ الأنفال ، واتە : ئەوەندەی لە تواناتاندا هەیە ، هێزیان بۆ ئامادە بکەن .

هەروەها فەرمانمان پێدەکات دەفەرموێ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ ۝٧١﴾ النساء ، واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! وریایی خۆتان وەربگرن ، کەواتە : بەڵێ خوا یارمەتیدەرو سەرخەری ئیماندارانە ، بەڵام دەبێ ئەوانیش ئەوەی کە بە خۆیان دەکرێ بیکەن ، وە هەوڵی خۆیان بدەن ، نەك پشتێندی لێ بکەنەوەو بڵێین : خوایە ! ئەوەمان بۆ بکەو ئەوەمان بۆ بکە ... ، وەك زۆربەی مسوڵمانانی ئێستا وا دەکەن ، کە جاری دیکەش هەر لەم تەفسیرەدا ئاماژەمان پێداوە ، من زۆر پێم پێچەوانەی سوننەتە ، کە مسوڵمانان بێنن هەرچی داواو پێداویستی هەیانە ، بە تایبەت لە مانگی ڕەمەزانان‌و لە قونووتی دا نوێژی وەتردا ، بیپارێنەوە ، ئنجا بیست خولەك ، نیو سەعات ، سێ چارەگ ، دەست بەرز بکەنەوە ، خەڵك دەستی شل بێ‌و پێی بتەزێ ، مەلا هەر دەپاڕێتەوە ، خوایە ! وا بکەو وا مەکەو ، هەرچی کافرە لەبەینی بەرەو هەموویان قڕ بکە ، ژنەکانیان بێوەژن بکەو ، منداڵەکانیان هەتیو بکەو ، وڵاتیان کاول بکەو ، چیان پێبکەو چیان لێ بکە ! دوایی خەڵك تەماشا دەکات ، کافر هەر ملیان ئەستوور دەبێ‌و ،

ولآتیان هەر ئاوەدان دەبیٚو ، هەر بەهێز دەبنو ، ژمارەشیان هەر زیاد دەکات !
ئنجا ڕەنگە خەڵکێك بکەوێتەوە گومانەوە ، بڵێ : باشە بۆچی ئەو هەموو دوعایانە دەکرێن ! کەچی حاڵمان هەر وەك خۆیەتی ؟ چونکە ئەو دوعایانە هیچی ئەوە نین کە خوا وەریان بگرێ ، چونکە دوعا شوێنی خۆی هەیەو ، کاتی خۆی هەیەو ، شێوازی خۆی هەیە ، وە هەرگیز پێغەمبەری خوا ئەو هەموو دوعایانەی پێکەوە نەکردوون ، بەڵکو لە هەر حاڵو مەقامەدا هۆکارەکانی ئامادە کردوون ، ئنجا داوای هاوکاریی کردوەو پاڕاوەتەوە لە خوای پەروەردگار ، فەرموویەتی : خوایە ! سەرمان بخە ، خوایە ئەو کارەمان بۆ بکە ، بەلآم تۆ دەست لە هەموو هۆکارەکان بەر بدەیو ، هەموو هێزی خۆت بخەیە سەر دوعا ، بەڕاستی ئەوە بیدعەتێکە داهێنراوە ، بە تایبەتی لە هەندێ ولآتانی خەلیج دا ، کە لە بواری هۆکارەکان دا تێیان دۆڕاندوە ، فەرمان بە چاکەو قەدەغەی خراپە ناکەن ، دژی حوکمڕانە ستەمکارەکان هەڵوێستیان نیە ، ئنجا هەموو تینو تاقەتی خۆیان خستۆتە سەر دوعا !!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە چوار (٤) ئایەت پێكهاتوە ، ئایەتەكانی : (٤١ تا ٤٤) پێك دێ ، كە خوای كاربەجێ ، تێیاندا باسی چۆنیەتی دابەشكردنی ، دەستەكەوتەكانی جەنگ دەكات ، پاشان باسی چۆنیەتی هاتنە پێشو ڕوودانی جەنگی بەدر دەكات ، كە ئەوە بە ویستی حەكیمانەی خواو ، بۆ هێنانەدی چەندان حیكمەتی گەورە گەورە بووە .

دوایی باسی ئەوە دەكات ، كە خوای كاربەجێ بە مەبەستی سەركەوتنی مسوڵمانان لەو جەنگەدا ، بە خەون ژمارەی كافرەكانی بە كەم پێشانی پێغەمبەر داوە تاكو نەترسن ، هەروەها لە كاتی ڕووبەڕووبوونەوەشیاندا ، هەر كام لە سوپای ئیسلامو ، كوفری بە كەمتر لەوەی هەیە ، خستۆتە بەرچاوی بەرانبەرەكەی ، تاكو لە ڕووبەڕووبوونەوە ، نەترسنو ، ئەوەی خوا مەبەستی بووە ، بێتە دی ، كە جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەكە بووە .

ﭽ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾ إِذۡ أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلۡقُصۡوَىٰ وَٱلرَّكۡبُ أَسۡفَلَ مِنكُمۡۚ وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡمِيعَٰدِ وَلَٰكِن لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ إِذۡ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلٗاۖ وَلَوۡ أَرَىٰكَهُمۡ كَثِيرٗا لَّفَشِلۡتُمۡ وَلَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤٣﴾ وَإِذۡ يُرِيكُمُوهُمۡ إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا وَيُقَلِّلُكُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ لِيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗاۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٤٤﴾ ﭼ .

# مانای وشـــه بە وشـەی ئایەتەكـان

}وە بزانن كە هەر شـتێكتـان (لە جەنگدا) دەستكەوت بوو ، ئـەوە پێنـج یـەكی بـۆ خـواو پێغەمبـەرو خزمـان (ی پێغەمبـەر)و بۆ هەتیوانو ، بۆ نـەدارانو ، بـۆ ڕێبـواره ، ئـەگەر بڕواتان بـە خـواو بـەوە هێناوە ، كە لـە ڕۆژی جیاكردنـەوە (ی هـەقو ناهـەق) لـە ڕۆژی پێكـەوە بـەرەنگاربوونـەوەی دوو كۆمـەڵەكـە (سـوپای ئیسلامو كـوفر) دا دامانبـەزاندۆتـە سـەر بـەندەكـەمان (موحـەممـەد) ، وە خـوا لەسـەر هـەموو شـتێك بـە توانـایـە ﴿٤١﴾ (یـاد بكەنـەوە) كـاتێك ئێـوە (ئـەی مسولْمـانینـە !) لـە دیـوی نیزیكتـر (ی شـیوەكـە بـە لای مەدینـەوە) بـوونو ئـەوان (كـافرەكـان)یش لـە دیـوی دوورتـرەوە بـوون ، كاروانـەكـەش لـە دامێنتانـەوە بـوو ، وە ئـەگـەر بـەڵێنیشـتان بـە یەكدیـدا دابـایە (بۆ دیارییـكردنی كاتو شـوێنی ڕووبـەڕووبوونەوە) ئـەوە لە بـەڵێنـگـە (كـاتو شـوێنی پێكگـەیشـتن)دا جیـاواز دەبوون (لە هـەمان كـاتو شـوێندا پێك نـەدەگـەیشـتن) بـەڵام (خـوا) پێكگـەیشتنـتـانی بـەو جـۆرە سـاز كـرد ، تاكـو كـارێك كـە خـوا بڕیـاری لەسـەر داوە ، (كـە ڕوودانی جەنگـەكـەیە) بێتـە دی ، بۆ ئـەوەی كەسـێك كـە دەفـەوتێ ، لەبــەر ڕۆشــنایی دا بفــەوتێ ، وە كەســێك كــە دەژی (بــە هــۆی ئیمانــەوە) لەبــەر ڕۆشـنایی دا بـژی ، وە مسـۆگـەر خـوا بیسـەری زانـایە ﴿٤٢﴾ (یــاد بكـەنــەوە) كـاتێـك كـە خـوا ئـەوان (كـافرەكـان)ی لە خەونتـدا بـە كـەم پێشـان دەدای ، وە ئـەگـەر ئـەوانی بـە زۆر پێشــان دابــای دەترســان (و تێدەشكــان) وە لــە كـارەكــە (ڕووبـەڕووبوونــەوە) دا ناكـۆك دەبوون ، بـەڵام خـوا كـارەكـەی بـە سـەلامەتیـی تێپـەڕاند ، بێگومـان خـوا بـە نهـێنیی سینـەكـان زانـایـە ﴿٤٣﴾ (وە یــاد بكـەنــەوە) كـاتێــك كــە لــە كــاتی پێكــەوە بـەرەنگاربوونـەوەدا ، (خـوا) ئـەوانـی لەبـەرچـاوی ئێـوە كـەم دەكـردەوەو ، ئێـوەشـی لەبـەرچاوی ئـەوان كـەم دەكـردەوە ، بۆ ئـەوەی كـارێك كـە خـوا بڕیـاری لەسـەر داوە ، بیكـات ، وە كـاروبـارەكـانیش هـەر بۆ لای خـوا دەگـێڕرێـنـەوە ﴿٤٤﴾)).

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(غَنِمۡتُم) : (الغَنَمُ : مَعْرُوفٌ ، وَالغُنْم إصابَتُهُ ، والظَّفَر بِهِ ، ثُمَّ اسْتُعْمِلَ فِي كُلّ مَظْفُور بِهِ مِنْ جِهةِ العَدو ، وَغَيْرِهِ ، وَالمَغْنَمُ : مَا يُغْنَمُ وَجَمْعُهُ مَغَانِم) ، (غَنِمْتُم) لە (غَنَم)ەوە ، (غَنَم) .

واتە : مەڕ ، وە (غُنْم) بریتیە لەوە کە تۆ مەڕت دەستبکەوێ ، وە بەسەری دا زاڵ بیو ببێتە هی تۆ ، دوایی وشەی (غُنْم) بەکارهێنراوە بۆ هەر شتێك لەلایەن دوژمنو غەیری دوژمنەوە ، تۆ زیانی پێبگەیەنی ، وە (مَغْنَم) بەو دەستکەوتە دەگوترێ : کە دەگیرێ ، وە کۆیەکەشی (مَغَانِم)ە .

(يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ) : (اليَوْمُ الَّذِي يُفرَقُ فِيهِ بَيْنَ الحَقِّ وَالباطِل) .

ڕۆژی فورقان ، واتە : ڕۆژی لێك جیاکردنەوە ، یانی : ئەو ڕۆژەی کە هەقو ناهەقی تێدا لێك جیاکرایەوە ، کە جەنگی بەدر بوو .

(يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ) : واتە : ئەو ڕۆژەی کە دوو کۆمەڵەکە بەرەنگاری یەکدی بوونەوە ، خۆی لە ئەسڵدا وشەی (التقى) واتە : پێکگەیشتن ، بەڵام بە زۆریی وشەی (التقى) و (لقاء) بۆ بەرەنگاربوونەوەو جەنگ بەکارهاتوە .

(بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا) : واتە : ئەو لاپاڵە شیوەی کە (لە مەدینەوە) نیزیکترە ، وشەی (العُدْوَة) کە بە (العِدْوَة)و (العَدْوَة)ش خوێنراوەتەوە ، وە (دنيا) ، (مُؤَنَّث)ی (أَدْنَى)یە ، واتە : نیزیکتر ، دەڵێ : (العُدَوْةُ : الجانِبُ المُتَجاوِز لِلْقُرْبِ) .

واتە : ئەو لایەی کە تێدەپەڕێ لە ڕووی نیزیکییەوە .

(ٱلۡقُصۡوَىٰ) : (القَصَا : البُعْدُ ، وَالقصِيُّ : البَعِيدُ ، وَالمَكانُ الأَقْصَى وَالنَّاحِيَةُ القُصْوَى) .

(قَصَا) بە مانای دووریی دێ ، وە (قَصِي) بە مانای دوور دێ ، وە (المَكانُ الأَقْصَى) ، واتە : شوێنێك دوورترە ، دیارە (قُصْوَى) (مُؤَنَّث)ی (أَقْصَى)یە ، یانی : دوورتر .

(ٱلۡمِيعَـٰدِ) : (المَوْعِد وَالمِيعَادُ ، يَكُونَانِ مَصْدَرًا وَاسْمًا) ، هەرکام لە وشەی (مَوْعِد) و (مِيعَادُ) دەگونجێ چاوگ بن ، دەشگونجێ ناوبن .

(بَيِّنَةٍ) : (البَيِّنة : الدَّلالَةُ الوَاضِحَة ، عَقْلِية كانَتْ أَو مَحْسوسة) .

(بَيِّنة) بریتیە لە ڕێنماییەکی ئاشکرا ، جا لە ڕێی عەقڵییەوە بێ ، یاخود لە ڕووی بەرهەستەوە بێ .

(لَّفَشِلۡتُمۡ) : (الفَشَلُ : ضَعْف مَعَ جُبْنٍ ، وَتَفَشَّلَ المَاءُ : سالَ) .

وشەی (فَشَل) بێهێزییە لەگەڵ ترسدا ، کە دیارە ترس لە ڕووی مەعنەوییەوەیە ، وە بێهێزیش لە ڕووی جەستەییەوەیە ، وە دەگوترێ : (تَفَشَّلَ المَاءُ) واتە : ئاوەکە ڕژا ، یانی : ئێوەش پەیت نینو شلن ، دەرژێن .

(سَلَّمَ) : واتە : سەلامەتی کرد ، (السَّلْمُ وَالسَّلامَةُ : التَعَرِّي مِنَ الآفَاتِ الظَاهِرَة وَالباطِنَة) .

هەردووك وشەی (سَلْمُ) و (سَلامَة) یانی : دووریی لە دەردو بەڵای ئاشکراو پەنهان .

## مانای گشتی ئایەتەکان

دیارە ئەم چوار ئایەتە بە گشتی لە دەوری دوو بابەت دەخولێنەوە ، یەکەم : دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگی بەدر ، دووەم : چۆنیەتی ڕوودانی جەنگەکەو ، چۆنیەتی هێنرانە پێشی ئەو جەنگە لەلایەن خوای کاربەجێوە ، خوا دەفەرموێ : ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ ، واتە : وە بزانن هەر شتێکتان دەست کەوت بوو لە جەنگداو گرتتان ، ئەوە بە مسۆگەریی ، پێنج یەکی هی خوایە ، وە هی پێغەمبەرە ، وە هی نیزیکانو خزمانە ، وە هی هەتیوانە ، وە هی نەدارانە ، وە هی ڕێبوارانە ، ﴿إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ﴾ ، ئەگەر بڕواتان بە خوا هێناوە ، وە ئیمانتان بەوە هێناوە کە دامان بەزاندۆتە سەر بەندەکەی خۆمان لە ڕۆژی فورقان ، ڕۆژی پێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکەدا ، واتە : سوپای ئیسلام بە فەرماندەیی پێغەمبەر ، وە سوپای هاوبەش بۆ خوادانەرانی قوڕەیش ، بە فەرماندەیی ئەبو جەهل ، ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ ، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە .

دیارە ئێمە دوایی زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم ئایەتە کە باسی چۆنیەتی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگیی دەکات ، وە ئایا لەم ڕۆژگارو سەردەمەی ئێمەش دا ، هەر بەو شێوەیە دابەش دەکرێ ؟ لە کاتێکدا کە شێوەی سوپا گۆڕاوە ، وە شێوەی جەنگ کردنەکە گۆڕاوە ، وە ئایا ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە : حەتمەن دەبێ چوار لەسەر پێنجی دەستکەوتی جەنگیی بۆ جەنگاوەران بێ ، وەك هەموو توێژەرەوانی قورئان وایانگوتوە ، لە حاڵێکدا کە خوای پەروەردگار باسی چوار لەسەر پێنجی هەر نەکردوە ؟ تەنیا باسی پێنج یەکی کردوە ؟ ئەوە دوایی باسی دەکەین .

ئنجا دێتە سەر بابەتی دووەم ، کە بریتیە لە باسکردنی چۆنیەتی ڕوودانی ئەو جەنگە ، سەرەتا خوای کاربەجێ ، وەك وێنە کێشانێکی جوگرافیی ، باسی ئەوە دەکات ، کە سوپای کافران لە کوێ بووەو ، سوپای ئیسلام لە کوێ بووە ؟ وە کاروانەکە لە کوێ بووە ؟ هەمووی وێنا دەکات ، کە دیارە هەر ئەو سێ لایەنە بوون :

١) کاروانێك بوو کە لە شامەوە دەگەڕایەوە ، بە سەرقافڵەیەتیی ئەبو سوفیان .

٢) وە مسوڵمانان بوون ، بە فەرماندەیەتیی پێغەمبەر ، کە ژمارەیان (٣١٣) یان (٣١٩) جەنگاوەر بووە ، لە مەدینە دەرچوون ، بۆ ئەوەی ڕێ لەو کاروانە بگرن .

٣) وە لایەنی سێیەم سوپای قوڕەیش بە فەرماندیەتیی ئەبو جەهل ، کە دوای ئەوەی بیستیان سوپای مسوڵمانان هاتوونە دەر ، بۆ ڕێگرتن لەو کاروانەیان ، کە لە شامەوە دەگەڕێتەوە ، هاتن ، وە ژمارەی ئەو سوپایە هەزار (١٠٠٠) جەنگاوەر بوو .

ئنجا لێرەدا خوا باسی ئەوە دەکات ، دەفەرموێ : ﴿ إِذْ أَنتُم بِٱلْعُدْوَةِ ٱلدُّنْيَا وَهُم بِٱلْعُدْوَةِ ٱلْقُصْوَىٰ وَٱلرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ ﴾ ، یاد بکەنەوە کاتێك کە ئێوە لەو لایەی نیزیکتر لە مەدینە بوون ، وە ئەوان (سوپاکەی ئەبو جەهل)یش کەوتبوونە ئەو لایەی کە دوورترە لە مەدینە ، هەر کەسە لە ئاقار خۆیەوە هاتوە ، وە کاروانەکەش لە خوار هەردوو لاتانەوە بوو ، بە لای دەریای سووردا ، چونکە ئەبو سوفیان کە بیستی سوپای مسوڵمانان بۆی دەرچووە ، وەك پێشتر باسمان کرد ، لە ڕووداوەکانی جەنگی بەدردا : یەکسەر ڕووی بە کاروانەکە گۆڕی بەرەو دەریای سوور ، وە دەربازی کرد .

ئنجا خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَٱخْتَلَفْتُمْ فِى ٱلْمِيعَـٰدِ ﴾ ، وە ئەگەر بەڵێنتان پێکەوە دابایە ، لەسەر کاتو شوێنی پێکگەیشتنەکە ، ڕاجیا دەبوون ، لەو شوێنەو بەو شێوەیە بەرەنگاری یەك نەدەبوونەوە ، ئنجا یان لەبەرئەوەی مسوڵمانان خۆیان دەپاراست ، یان لەبەرئەوەی ئەوان لە خۆیان ڕانەدەبینی ، یان

لەبەرئەوەی کاتژمێر نەبووەو ، نەدەگونجا زۆر بە وردیی کاتەکە دیاریی بکرێ ، ﴿وَلَٰكِن لِّيَقْضِيَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾ ، بەلاّم خوا بۆیە وایکرد ، تاکو بریارێك کە خوا داویەتی ، دەبێ جێبەجێ بێ ، کە ئەویش بریتی بوو لەوەی ئەو دوو سوپایە پێك بگەن ، ئنجا ئامانج لە بەیەکگەیشتنی سوپایەکان چی بوو ؟ دەفەرموێ : ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ﴾ ، تاکو ئەوەی دەفەوتێ ، لەبەر ڕۆشنایی دا بفەوتێ ، بەڵگەی لەسەر هەبێو بفەوتێ ، واتە : لەبەر نەزانییو نەفامیی نەبێ بفەوتێ ، بەڵکو بەرچاوی ڕوون بێ ، بۆ ئەوەی هیچ بیانوو پاساوی نەبێو ، بەڵگەی لەسەر تەواو بکرێ ، ئنجا بفەوتێ ، ﴿وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ﴾ ، وە ئەوەش کە دەژی ، ژیانی مەعنەویی ، ژیانی بە ئیمانەوە ، ئەویش دیسان بە بەرچاوو ڕوونیی و بەڵگەی ڕوونو ڕاشکاوەوە بژیو ، لەسەر حاڵەتی ئیمانیی خۆی ، بەردەوام بێ ، ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ، وە بێگومان خوا بیسەری زانایە .

ئنجا خوا دوای دیارییکردنی شوێنی جوگرافیی هەر سێ لایەنەکە ، وە حیکمەتی پێکگەیشتنی ئەو دوو سوپایە : باسی نەخشەو پلانو تەگبیری خۆی دەکات ، بۆ ئەوەی ئەو دوو کۆمەڵە لێك ڕاست[1] بێنو خۆ پێکدادەن ، دەفەرموێ : ﴿إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا﴾ ، یاد بکەوە ، ئەی موحەممەد ! کاتێك کە خوا ئەوانی لە خەودا بە کەم پێشانی تۆدا .

پێغەمبەری خوا  خەونی بینی ، ژمارەی کافرەکانی بە کەم هاتە پێش چاو ، ئەویش مەگەر چۆن ، ئەگەرنا هەموو جارێ خەونی بۆ هاوەڵان گێڕاوەتەوە ، فەرموویەتی : لە خەون دا بینیم ، کافرەکان ژمارەیان کەم بوو ، ﴿وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ﴾ ، وە ئەگەر ئەوانی بە زۆر پێشانی تۆ دابایە ، ئێوە بێهێز

---

١) لێك ڕاست بێن : بەرانبەری یەکدی بێن ، بەرەنگاری یەك ببنەوە .

دەبوون ، یاخود تێدەشكان ، وە دەترسان لە ڕووبەڕووبوونەوە ، ﴿وَلَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾ ، وە لە نێو خۆتاندا ناكۆك دەبوون لە سەرئەنجامدانی كارەكە ، كە بریتی بوو لە بەرەنگاربوونەوەی سوپای دوژمن ، بەڵام كە پێغەمبەر فەرمووی : لە خەونمدا خوا پێشانی داوم ، ژمارەیان كەمە ، هەمووتان هاندراو بوون كە ئەو جەنگە بكەن ، وە لەگەڵ ئەو هێزەدا ، كە خوا بە كەم خستوویەتە بەرچاوی پێغەمبەرەكەی ، ڕووبەڕوو ببنەوە ، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ﴾ ، بەڵام خوا حاڵەكەی بە سەلامەتیی گوزەراندو تێپەڕاند ، واتە : ژمارەی ئەوانی زۆر نەخستە بەرچاوی ، بۆ ئەوەی لە ڕووبەڕووبوونەوە نەترسن ، ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ ، بێگومان خوا بە نهێنیی سینەكان زانایە .

ئنجا لە كۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿وَإِذۡ يُرِيكُمُوهُمۡ إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا وَيُقَلِّلُكُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ﴾ ، وە یاد بكەنەوە ، كە : نەك هەر لە خەوندا كافرەكانی كەم پیشانی پێغەمبەردا ، بۆ ئەوەی هاوەڵان سووربن لەسەر ئەو جەنگەو نەترسێن ، بەڵكو كاتێكیش كە ڕووبەڕووو بەرەنگاری یەكدی بوونەوە ، ئەوانی بە كەم خستە بەرچاوی ئێوە ، وە ئێوەشی بە كەم خستە بەرچاوی ئەوان ، بۆ ئەوەی هەم ئێوە سووربن لەسەر ئەنجامدانی ئەو جەنگەو ، بڵێن : ژمارەیان كەمە ، هەم ئەوانیش سووربن لەسەر ئەنجامدانی جەنگەكە ، بە هۆی كەمیی ژمارەی مسوڵمانەكانەوە ، هەموو ئەو شتانە بۆچی كران ؟ دەفەرموێ : ﴿لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا﴾ ، تاكو خوا كە بڕیارێك دەدا ، جێبەجێ بێ ، یانی : بەو شێوەیە كە لە زانیاریی ئەزەلیی خۆیدا هەیە ، جێبەجێی بكات ، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ ، وە بێگومان كاروبارەكان بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە .

## ضـةند مةســةلةيةكـى طرنـط

**مەسەلەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ ، لێرەدا بە پێویستی دەزانم باسێك لەبارەی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگەوە ، بکەین :

# باسێک لە بارەی دابەشکردنی غەنیمەتەوە

سەرەتا پێویستە چەند وشەیەك پێناسە بکەین ، بە سوودوەرگرتن لەوەی کە (مُحَمَّد رَشید رضا) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] هێناویەتی :

(الغنیمة) : (فِي الشَّرْعِ : مَا أَخَذَهُ الـمُسْلِمُونَ مِنَ الـمَنْقُولاَتِ فِي حَرْبِ الكُفَّارِ عُنوةً) .

واتە : غەنیمەت لە شەرعدا ، بریتیە لەوەی کە مسوڵمانان وەریدەگرن لە موڵك و ماڵی گواستراوە لە جەنگی کافران ، کە بە زۆر لێیان بگرن .

(الفيء) : (مَا أُخِذَ مِنْ مَالِ الكُفَّارِ الـمُحَارِبِينَ ، بِغَيْرِ قَهْرِ الحَرْبِ ، لِقَوْلِهِ : ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ ۝٦﴾

١) تفسیر القرآن الحکیم ، ج ١٠ ، ص ٤ .

الحشر ، وَهُوَ لِمَصالِح جُمهُورِ المُسْلِمِين وَقِيلَ كالْغَنِيمَةِ) .

واتە : (فِيء) بریتیە لە ماڵو سامانی كافرانی جەنگاوەری شەڕفرۆش بە مسوڵمانان ، كە بەبێ جەنگ لە كافران دەگیرێ ، لەبەر فەرمایشتی خوا : ﭽوَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ ﴿٦﴾ﭼالحشر .

واتە : وە ئەوەی خوا گێڕایەوە بۆ پێغەمەرەكەی ، ئێوە نەئەسپو نە حوشترتان بۆ لێ نەخوڕیو بۆ دەنگ نەدا ، (واتە : بەبێ جەنگ دەستتان كەوت) ئەویش گوتراوە : بۆ بەرژەوەندییەكانی زۆرینەی مسوڵمانان بەكاردەهێنرێ ، هەندێكیش گوتوویانە : وەك دەستكەوتی جەنگ دابەش دەكرێ .

(والنَّفْل) (بالمَعْنَى الخَاص : مَا يُعْطِيهِ الإمَام لِبَعْضِ الغُزَاةِ بَعْدَ القِسْمَةِ ، زِيادَةً عَلَى سَهْمِهِ مِنَ الغَنَائِمِ ، لِمَصْلَحةِ اسْتَحَقَّه بهَا ، وَقِيلَ : يَكونُ مِنْ خُمسِ الخُمس) .

واتە : نەفل كە بە مانا گشتییەكەی بە واتای غەنیمەت دێ ، بەڵام بە مانا تایبەتییەكەی ، بریتیە لەوەی فەرماندەی مسوڵمانانو پێشەواو كاربەدەستی مسوڵمانان ، دەیبەخشێ بە هەندێ لە جەنگاوەران ، دوای ئەوەی دەستكەوتی جەنگ دابەش كراوە ، زیاد لە پشكەكەی خۆی لە دەستكەوتی جەنگ، لەبەر بەرژەوەندییەك كە پێی وایە ئەو كەسە شایستەیەتی ، هەندێكیش گوتوویانە : پێنجیەكی پێنج یەك ، دەدرێ بەو نەفەرە .

(السَّلَب) : }وَهُوَ مَا يُسلَبُ مِنَ المَقْتُولِ فِي المَعْرَكةِ مِنْ سِلاَحٍ وَثِيابٍ ، يُعْطَى لِلْقَاتِل ، قِيلَ مُطْلَقَاً ، وَقِيلَ إذَا جَعَلَ الإمَامَ لَهُ ذَلِكَ كمَا قَالَ النَّبِيّ : (مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُه){ .

سەلەب بریتیە لەوەی كە لە كوژراوێك (ی كافر) كە لە جەنگدا كوژراوە ، دەكرێتەوە ، لە چەكو جلو بەرگو لە هەر شتێك كە پێوەینەتی ، هەندێكیش گوتوویانە : هەر بە ڕەهایی هەر كەسێك كەسێكی كوشت ، شایستەی ئەوەیە

كە ئەو كەلو پەلانەی پێوەینی هی ئەو بن ، هەندێكیش گوتوویانە : كاتێك كە پێشەواو فەرماندەو بەرپرسی مسولْمانان ئەوەی بۆ دابنێ ، وەك پێغەمبەر فەرموویەتی : ﴿مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ﴾[(١)] {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ ، برقم : (٢٩٧٣) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (١٧٥١) ، وَأَبُو دَاوُدَ ، برقم : (٢٧١٧) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (١٥٦٢) وَقَالَ : صَحِيحٌ ، وَابْنُ حبانَ ، برقم : (٤٨٣٦) ، وَالحَاكِمُ ، برقم : (٥٥٠٥) وَقَالَ : صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ} .

واتە : هەر كەسێك (لە جەنگ دا) كەسێكی (كافری شەڕفرۆشی) كوشت ، ئەوە كەلو پەلەی تایبەتییەكانی وی ، بۆ خۆینی .

ئنجا زانایان زۆربەی هەر زۆریان دەڵێن : چوار لەسەر پێنجی دەستكەوتی جەنگ بۆ جەنگاوەرانە ، وە یەك لەسەر پێنجیشی ، بۆ : خواو بۆ پێغەمبەرو بۆ خزمانو هەتیوو نەدارو ڕێبوارانە ، لەوبارەوە ، با ئەم دەقە بێنین :

﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ عَنْ رَجُلٍ (مِنْ بَلْقَيْنَ) قَالَ : أَتَيْتُ النَّبِيّ وَهُوَ بِوَادِي الْقُرَى وَهُوَ يَعْرِضُ فَرَساً ، فَقُلْتُ : يا رَسولَ اللهِ ! مَا تَقُولُ فِي الْغَنِيمَةُ؟ قَالَ : (لِلَّهِ خُمُسُهَا وَأَرْبَعَةُ أَخْمَاسٍ لِلْجَيْشِ) ، قُلْتُ : فَمَا أَحَدٌ أَوْلَى بِهِ مِنْ أَحَدٍ؟ قَالَ : (لاَ وَلاَ السَّهْمُ تَسْتَخْرِجُهُ مِنْ جَنْبِكَ ، لَيْسَ أَنْتَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ أَخِيكَ الْمُسْلِمِ)﴾ {أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي فِي (الكُبْرَى) برقم : (١٢٦٤١) ، باسنادٍ صَحِيح[(٢)]} .

واتە : عەبدوڵڵای كوڕی شەقیق (كە یەكێكە لە زانایانی تابیعین) لە پیاوێك كە خەڵكی بەلْقەین بووە ، گێڕاویەتەوە ، كە گوتوویەتی : چووم بۆ لای پێغەمبەر لە (وادي القرى) ، (كە شوێنێكە) تەماشای ئەسپێكی دەكرد ، گوتم : ئەی پێغەمبەر ! لە بارەی دەستكەوتی جەنگەوە چی دەفەرمووی ؟ فەرمووی : پێنج یەكی بۆ خوا (و پێغەمبەرەكەی و ئەوانەیە كە دیاریی كراون) وە چوار لەسەر پێنجیشی بۆ سوپایە ، گوتم : ئایا هیچ كەس لە هیچ كەسی زیاتر بەش پێوە نیە ؟ فەرمووی : نەخێر ، تەنانەت ئەو تیرەش كە لە تەنیشتی خۆت دەریدێنی ، ئەویش تۆ لە برا مسوڵمانەكەت زیاتر بەشت پێوەی نیە .

١) وَفِي رِوَايَةِ مُسْلِمٍ ، يَقُولُ : {(مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ)} .
٢) المِصْبَاحِ المُنِيرِ فِي تهذيب تفسير ابن كثير ، ص٥٤٠ .

وە (ابن الجوزي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا[١] دەڵێ : (أَجْمَعَ العُلَمَاءُ عَلَى أَنَّ أَرْبَعَةَ أَخْمَاسِ الغَنِيمَةِ لأَهْلِ الحَرْبِ خَاصَّةً ، فَأَمَّا الخُمُسُ الخَامِس ، فَكَيْفَ يُقَسَّمُ ؟! فِيهِ ثَلاثَةُ أَقْوَالٍ :

أَحَدُهَا : يُقَسَّمُ مِنْهُ للهِ وَلِلرَّسولِ ، وَلِمَنْ ذُكِرَ فِي الآيَةِ ، وَقَدْ ذَكَرْنَا أَنَّ هَذَا مِمَّا انْفَرَدَ بِهِ أَبُو العَالِيَة وَهُوَ يَقْتَضِي أَنْ يُقَسَّمَ عَلَى سِتة أَسْهُمٍ .

وَالثَّانِيّ : أَنَّهُ مَقْسومٌ عَلَى خَمْسَةِ أَسْهُمٍ ، سَهْمٌ لِلرَّسولِ ، وَسَهْمٌ لِذَوِي القُرْبَى ، وَسَهْمٌ لِلْيَتَامَى ، وَسَهْمٌ لِلْمَساكِين ، وَسَهْمٌ لأَبْنَاءِ السَّبيل عَلَى ظاهِرِ الآيَةِ ، وَبِهِ قَالَ الجُمْهُور .

وَالثَّالِثُ : أَنَّهُ يُقَسَّمُ عَلَى أَرْبَعَةِ أَسْهُمْ : فَسَهْمُ اللهِ عَزَّوَجَلَّ ، وَسَهْمُ رَسولِهِ عَائِدٌ عَلَى ذَوِي القُرْبَى ، لأَنَّ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكُنْ يَاخُذُ مِنْهُ شَيْئاً ، وَهَذَا المَعْنَى رَوَاهُ ابْنُ أَبِي طَلْحَة عَنِ ابْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) .

واتە : زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوە كە دەستكەوتی جەنگ : چوار لەسەر پێنجی بۆ سوپایەكەیە ، ئەوانەی كە جەنگەكەیان كردوە بە تایبەت ، بەڵام پێنج یەكی پێنجەمی ، ئایا چۆن دابەش دەكرێ ؟ سێ ڕای لەبارەوە هەن :

یەكەمیان : دەڵێ : دابەش دەكرێ بۆ پشكی خوا و، پشكی پێغەمبەرو ، پشكی ئەوانەی كە لە ئایەتەكەدا باس كراون ، پشكی هەمووانی لێ جیا دەكرێتەوە ، ئەمە ئەبو عالیە ڕای وابووە ، كە بەو پێیە بێ ، دەبێ بكرێ بە شەش بەش .

دووەمیان : دەڵێ : دابەش دەكرێ بۆ پێنج پشك ، بەشێك بۆ پێغەمبەری خوا ، }كەواتە : (للهِ وَلِلرَّسولِ) ئەوەش هەر یەك پشكە{ ، وە پشكێك بۆ خزمان ، وە پشكێك بۆ هەتیوان ، وە پشكێك بۆ نەداران ، وە پشكێكیش بۆ ڕێبواران ، بە پێی ڕواڵەتی ئایەتەكە ، ئەوە دەگەیەنێ ، كە ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە .

سێیەمیان : دەڵێن : دەكرێتە چوار پشك : پشكی خواو پێغەمبەری خوا ، دەگەڕێتەوە بۆ خزمان ، (واتە : خزمانی پێغەمبەر ) چونكە پێغەمبەری

---

١) زاد المسير في علم التفسير ، لابن الجوزي ، ص ٥٥٤.

خـوا هیچـی لـە دەستکـەوتی جـەنگ وەرنـەدەگـرت ، ئـەم مانـایەش ئیبنـو ئـەبی تـەڵحـە لە ئیبنـو عەبباسـەوە خـوا لێیان ڕازی بێ ، هێنـاویەتـی .

## وەڵامـدانـەوەی چـەند پرسـیـارێکـی پێویسـت لەبارەی دەسـتکـەوتەکانـی جـەنـگو چـۆنیـەتـی دابەشـکردنیـانەوە ، لـەم ڕۆژگـارەدا

١ / ئـایا پشکی پێغـەمبـەری خـوا لـە دەسـتکـەوتی جەنگـیی دوای کۆچـکـردنی خـۆی ، مـاوە ؟ وە چـی لـێ دەکرێ ؟

أ - لەوبـارەوە زۆربـەی زانایان دەڵێـن : هـەر مـاوە ، بـەڵام دەدرێ بـە حـوکمڕانـی مسـوڵمـانـان ، کـە لە جێی پێغـەمبـەرە ، یـاخود لـە بـەرژەوەندیی گشـتی مسـوڵمـانـاندا خەرج دەکـرێ .

ب - هـەندێکی دیکە دەڵێـن : ئـەو پشـکـەی پێغـەمبـەری خـوا ، دوای کۆچـی دوایـی وی ، نـامێنـێ ، وە دەچێتـەوە نێـو دەسـتکـەوتی جەنگـیی ، ئـەمەش بۆچـوونی ئـەبـو حـەنیفـەیە .

٢ / ئایا کە باسی پشکی خزمان کراوە، مەبەست لە خزمان کێن ؟ سێ بۆچوون هەن :

أ - هـەندێك دەڵێـن : تێکـڕای هـۆزی قـوڕەیشـە .

ب - هـەندێك دەڵێن : بـەنو هاشـیمو بـەنو موتـەڵلیبـن .

ج - هـەندێکـیش دەڵێن : تـەنیـا بـەنو هاشـیمە .

٣ / ئنجا ئـایا لەبـەر هـەژاریی ، یـان لەبـەر خزمایەتیی ئـەو پشکـەیـان دەکـەوێ ؟

أ - ئـەبو حەنیفـە دەڵـێ : لەبـەر هـەژاریـی ، واتـە : چ هـۆزی قـوڕەیش بـێ ، چ بـەنو هاشـیمو بـەنو موتـەڵـیب بـێ ، وە چ تـەنیـا بـەنو هاشیم بێ ، ئـەگـەر هـەژاربـن ، دەیـانکـەوێ ، بەڵام ئـەگـەر هـەژار نـەبـن ، نایـانـکـەوێ .

ب - بەڵام شـافیعـییو ئەحمـەد دەڵێن : لەبـەر خزمایەتـیی دەیـانکـەوێ ، کـەواتـە : ئـەگـەر هـەژاریـش نـەبـن ، هـەر دەیـانکـەوێ .

بەڵام گومانی تێدانیە ، کە لەم ڕۆژگارەدا نە هۆزی قورەیشمان بۆ دەدۆزرێتەوە ، نە بەنو هاشیمو بەنو موتەڵلیبمان بۆ دەدۆزرێنەوە ، بگرە نە بەنو هاشیمیشمان بە تەنیاش بۆ دەدۆزرێتەوە !

بۆیە من ڕام وایە کە ئەم پشکە دەچێتەوە نێو دەستکەوتی جەنگیی .

٤ / ئایا لەم ڕۆژگارەدا دەستکەوتی جەنگ چۆن دابەش دەکرێ ؟ واتە : هەمووی ، نەك تەنیا پێنج یەکەکەی ؟!

هەڵبەتە زانایان گوتوویانە : ڕاجیایی تێدایە ، دیارە بۆیەش ڕاجیایی تێدایە ، چونکە دیارە دەقێکی ڕوونو ڕاشکاوی لەسەر نیە ، کە مەسەلەکە هەڵبرِێ ، پێغەمبەر ﷺ یش ، بە پێی بەرژەوەندیی ئەو کاتەی مسوڵمانان ، تەصەرروفی لە دەستکەوتی جەنگ دا کردوە ، لە پێنج یەکەکەشو لە هەمووشی دا ، وەك تۆزێکی دیکە باسی دەکەین :

من زۆر سەرنجی ئەو مەسەلەیەم داوە ، چونکە بێگومان قورئان هەر بۆ ئەو ڕۆژگارە نەهاتوە ، بەڵکو قورئان کتێبی خوایە ، بۆ بەندەکانی خوا ، بە پانایی زەمینو ، بە درێژایی زەمان ، کەواتە : دەبێ هەمیشە باش سەرنج بدەین ، فەرمانێکی خوا ، یان کە خوا لە ئایەتێکدا باسی شتێکی کردوە ، دەبێ وردبینەوەو بزانین لەو ڕۆژگارەی ئێستاماندا ، ئەوە چۆن جێبەجێ دەبێ ؟ دیارە ئەوەی من بۆم دەرکەوتوە ، دوای تێفکرینو ڕامانو لێکۆڵینەوەی زۆر لەوبارەوە ، ـ هەڵبەتە ئەوەندەی کە پێی ڕاگەیشتووم ـ ، ئەوەیە کە : ئەو کاتە دەستکەوتی جەنگیی بەو شێوەیە دابەش کراوە ، کە دادگەرییو بەرژەوەندیی گشتی وای خواستوە ، وە واقیعی ئەو کاتە ئەوەی پێویست کردوە ، بەڵام ئێستا مەرج نیە وابێ ، وە ئایەتەکەش هیچ باسی چوار لەسەر پێنجی نەکردوە ، تەنیا باسی یەك لەسەر پێنجەکەی کردوە ، کە بۆ یەك لەسەر پێنجەکەش خوا دەفەرموێ : ﴿فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ ، ئنجا زانایان دەڵێن : خوای پەروەردگار بۆیە ئەوانەی باسکردوون ، چونکە ئەو کاتە ئەو توێژانە لە هەموو توێژەکانی کۆمەڵگا

ئاتاجتر بوون ، ئەدی ئەگەر ئێستا توێژێك هەبێ ، لەوانەی كە باسكراون ئاتاجتر بێ ، ئایا بەشی ناكەوێ لەو پێنج یەكە ؟ بێگومان با ، چونكە لە ئەسڵدا ئەوانە بۆچی دەیانكەوێ ؟ دیارە لەبەر حاڵەكەیان ، كە پێویستییان پێیەتی ، ئەدی ئەگەر توێژێكی دیكە هەبوو ، لەوانە زیاتر پێویستیی پێی هەبوو ؟ بە پێی عەقڵو مەنتیق ، وە پێی ڕووحو عورفی شەریعەت ، دەبێ ئەویش بیكەوێ .

ئنجا بە سەرنجدانی ڕستەی یەكەمی ئەم سوورەتە ، كە دەفەرموێ : ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۝١﴾ الأنفال ، واتە : دەربارەی دەستكەوتی جەنگ پرسیارت لێدەكەن ، بڵێ : دەستكەوتی جەنگی هی خواو پێغەمبەری خوایە ، لێرەوە دەزانین كە دەستكەوتی جەنگ ، بە موڵكی گشتی دادەنرێ ، كە دەفەرموێ : ﴿قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۝١﴾ ، مانای وایە خوای پەروەردگار موڵكایەتیی گشتی ئەو دەستكەوتە جەنگییە ، دەگێڕێتەوە بۆ خۆی و بۆ پێغەمبەر .

بە نسبەت خواوە ، ئەوە دیارە كە خوا خاوەنی هەموو شتێكە : ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ ۝٢٦﴾ آل عمران ، بە نسبەت پێغەمبەر یش ، وە بە سیفەتی ئەوەی كە بەرپرسی دەوڵەتو دەستەڵاتی شەرعیی مسوڵمانانی ئەو كاتە بووە ، كەواتە : لە بنەڕەتدا ، دەستكەوتی جەنگیی هی دەوڵەتە ، هی دەستەڵاتی شەرعییە ، دەوڵەتو دەستەڵاتی شەرعییش ، دەبێ بە پێی بەرژەوەندیی مسوڵمانان ، تەصەڕڕوف لەو ماڵو سامانەدا بكات ، كە دەكەوێتە ژێر دەستی ، ئەمە لە لایەك .

پاشان ڕستەی : ﴿وَٱعْلَمُوٓا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ ... ۝٤١﴾ الأنفال ، واتە : بزانن كە هەر شتێكتان دەستكەوت بوو لە جەنگ دا ، ئەمە دیسان ئەوە دەگەیەنێ ، كە ئەم دەستكەوتە موڵكی گشتییە ، وە هی هەموو سوپایەكەیە ، نەك هی تاكەكان ! واتە : هی سوپایەكەیە بە گشتی ، بە تایبەتی كە ئێستا

سوپا بۆتە دامەزراوەیەکی سەربەخۆی دەوڵەت ، وە دەوڵەت ڕاستەوخۆ سەرپەرشتیی دەکات ، وە دەوڵەت پێداویستییەکانی سوپا دابین دەکات ، وە ئەگەر کاتی خۆی هەر کەسە بە ڕمێك و شمشێرێك و تیرکەوانێك و مەتاڵێکەوە ، جەنگی کردوە ، ئێستا : کەتیبەی دەبابان هەیە ، هێزی ئاسمانیی هەیە ، هێزی دەریایی هەیە ، هێزی پێرۆ هەیە ، ئنجا سوپا ئاڵۆزیی و وردەکاریی زۆری تێدا پەیدا بووە ، بۆ وێنە : دەبابە هی کەسێك نیە ، بگرە بەتەنیا هی چەند کەسێکیش نیە ، بەڵکو هی کۆی دامەزراوەی سوپایە ، هەروەها فڕۆکە ، هی فڕۆکەوانەکە نیە بە تەنیا ، بەڵکو هی کۆی دامەزراوەی سوپایە ، هەروەها کەشتییەکی جەنگیی ، یان غەواسەیەك ، مەدفەعێکی دوورهاوێژ ... هتد .

کەواتە : ئێستا شێوەی سوپا گۆڕاوە ، بۆیە دەبێ شێوەی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگیی بەسەر سوپادا ، بگۆڕدرێ .

وە لە ڕاستییدا دەستکەوتی جەنگ بەتەنیا هی سوپاش نیە ، بەڵکو بەگشتی هی کۆمەڵگاو دەوڵەتە .

وەك ئایەتی یەکەمی سوورەتی ئەنفال دەیگەیەنێ، هەروەها ئەم ئایەتەش ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٤١﴾﴾الأنفال ، واتە : بزانن کە هەر شتێکتان دەستکەوت بوو لە جەنگ دا ، ئەوە پێنجیەکی هی ... لێرەدا باسی ئەوە نەکراوە کە چوار لەسەر پێنجەکە بۆ کێ دەبێ ؟ هەر تەنیا باسی یەك لەسەر پێنجەکە کراوە ، کە بۆ ئەو کەسانەیە ، کە ئایەتەکە ئاماژەی بۆ کردوون ، بەڵێ : پێغەمبەر ﷺ کە پرسیاری لێکراوە دەربارەی دەستکەوتی جەنگیی ، فەرموویەتی : «لِلَّهِ خُمُسُهَا وَأَرْبَعَةُ أَخْمَاسٍ لِلْجَيْشِ» {أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي فِي (الكُبْرَى) برقم : (١٢٦٤١) ، باسنادٍ صَحِيحٍ}[1].

واتە : پێنج یەکی بۆ خوا (و پێغەمبەرەکەی و ئەوانەیە کە دیاریی کراون) ، وە چوار لەسەر پێنجیشی بۆ سوپایە .

---

١) المِصْباحِ المُنِير فِي تهذيب تفسير ابن كثير ، ص٥٤٠ .

بەلاَم بێگومان ئەوەی كە لە پێغەمبەری خوا دەگێڕدرێتەوە ، دەگونجێ كە وەك بەرژەوەندیی گشتی ئەو كاتە ، وا مامەڵەی كردبێ ، بەلاَم بۆیە لە ئایەتەكەدا بەیان نەكراوە ، چونكە بە تەئكید خوای پەنهانزان زانیویەتی ، ئەو بابەتە گۆڕانی بەسەردا دێ ، شێوەی سوپا گۆڕانی بەسەردا دێ ، بۆیە دەستو پێی مسوڵمانانی نەبەستوە ، گرنگ ئەوەیە دیاریی كردوە ، كە یەك لەسەر پێنجی هاوكاریی خەڵكی كەمدەستی پێ بكرێ ، بەلاَم ئایا ئەوەی دیكە چی لێ بكرێ ؟ خوای پەروەردگار لێ بێ دەنگ بووە ، وە ئەوە دەكەوێتە سەر شانی دەوڵەت ، كە چۆن تەصەرڕوف دەكات ، لە دەستكەوتی جەنگیی دا .

(الشاطبي) لە كتێبەكەی خۆیدا ، كە (د . یوسف القرضاوي) لێیەوە دەخوازێتەوە ، لە كتێبی (السیاسة الشرعیة)ی خۆی دا ، بە تەفصیل دەیهێنێ ، بەلاَم ئێمە پوختەیەكی لێ دەردێنین ، دەڵێ :

(الأَصْلُ فِيمَا يَتَعَلَّقُ بالعِبادَاتِ الشَّعَائِرِيَةِ ، هُوَ التَّعَبُّدُ بِهَا والتقَيُّدُ بنصُوصِهَا دُونَ الإلْتِفَاتِ كَثِيراً إِلى العِلَلِ وَالمَقَاصِدِ المَرْبُوطَةِ بِهَا ، بخِلافِ مَا يَتَعَلَّقُ بالعِادَاتِ وَالمُعَامَلاتِ وَشُؤُونِ الحَيَاةِ ، فَالأَصْلُ فِيهَا ، هُوَ النَّظَرُ إِلى العِلَلِ وَالمَعَانِي وَالمَقَاصِدِ مِنْ وَرَائِهَا)[1] .

هەڵبەتە یوسف قەرزاویی بە تەعبیری خۆی دایڕشتۆتەوە ، واتە : بناغە لەوەدا كە پەیوەستە بە دروشمەكانی خواپەرستییەوە ، بریتیە لە بەندایەتیی كردن بۆ خوا بە پێی ئەو دروشمانە ، وە خۆ بەستنەوە بە دەقەكانەوە ، بە بێ زۆر سەرنجدانی هۆكارەكانو ئامانجەكانی كە پێیانەوە پەیوەستن ، بە پێچەوانەی عادەتەكانو مامەڵەكانو كاروباری ژیانەوە ، كە بناغە لەواندا بریتیە لە سەرنجدانی هۆكارەكانو حیكمەتەكانو ئەو ئامانجانەی كە لە پشتیانەوەن .

وە (ابن القیم) لە (زاد المعاد)دا ئەو بابەتە دێنێ ، كە دیارە من پوختەیەكی لێ دێنم ، هەر دەربارەی دابەشكردنی دەستكەوتی جەنگیی ، دەڵێ :

---

١) ص ٢٧١ ـ ٢٨٦ .

(وَمَعْلُومٌ : أَنَّ الأَنْفَالَ للهِ وَلِرسولِهِ ، يُقَسِّمُهَا رَسوله حَيْثُ أَمَرَهُ لا يَتَعَدَّى الأَمْرَ ، فَلَوْ وَضَعَ الغَنَائِمَ بِاسْرِهَا فِي هَؤلاءِ لِمَصْلَحَةِ الإِسْلامِ العَامَّةِ ، لَمَا خَرَجَ عَنِ الحِكْمَةِ وَالمَصْلَحَةِ وَالعَدْلِ ، وَلَمَا عَمِيَتْ أَبْصارُ ذِي الخُوَيْصِرَةِ التَّمِيمِي وَأَضْرَابِهِ عَنْ هَذِهِ المَصْلَحَةِ وَالحِكْمَةِ ، قَالَ لَهُ قَائِلهُم : اعْدِل ، فَإِنَّكَ لَمْ تَعْدِل ... ، فَإِنْ قِيلَ : فَلَو دَعَتْ حَاجَةُ الإِمَامَ فِي وَقْتٍ مِنَ الأَوْقَاتِ إِلى مِثْلِ هَذَا مَعَ عَدّوِهِ ، هَلْ يَسوغُ لَهُ ذَلِكَ؟

قِيلَ : الإِمَامُ نَائِبٌ عَنِ المُسْلِمِينَ يَتَصَرَّفُ لِمَصالِحِهِم ، وَقِيامِ الدِّين ، فَإِنْ تَعَيَّنَ ذَلِكَ لِلدَفْعِ عَنِ الإِسْلامِ ، وَالذَبّ عَنْ حَوْزَتِه ، وَاسْتِجْلابِ رُؤُوسِ أَعْدَائِهِ إِلَيْهِ لِيامَنَ المُسْلِمونَ شَرَّهُمْ ، ساغَ لَهُ ذَلِكَ ، بَلْ تَعَيَّنَ عَلَيْهِ)[1].

بە ڕاستی ئیبنو قەییمی جەوزیی زۆر بۆچوونی وردی هەن ، کە پەردەی کاتو شوێنی دڕیوەو ، ئاسۆی ڕوونی بینیوە ، واتە :

شتێکی زانراوە کە دەستکەوتی جەنگیی هی خواو هی پێغەمبەرەکەیەتی ، پێغەمبەری خوا بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی پێکردوە دابەشی دەکات ، وە لەو سنوورە کە خوا بۆی دیاریی دەکات لانادات ، بۆیە ئەگەر هەموو دەستکەوتی جەنگ بەسەر کۆمەڵە خەڵکێکدا دابەش بکات ، {دیارە پێشتر باسی کردوە ، کە مەبەستی پێی کەسانێکە ، کە تازە دێنە نێو ئیسلامەوە ، بەڵکو جاری وایە ئەگەر مسوڵمانیش نەبووبن}[2] لەبەر بەرژەوەندیی گشتی ئیسلام ، ئەوە ئەو دابەشکردنە لە حیکمەتو بەرژەوەندییو دادگەریی نەچۆتە دەرێ ، بەڵام لە کاتێك دا کە چاوی (ذِي الخُوَيْصِرَةِ التَّمِيمِي)[3] هاووێنەکانی کوێر بوو ، لەبەردەم ئەم بەرژەوەندییو ئەم حیکمەتەدا ، (لە کاتی دابەشکردنی

---

١) ج ٣ ، ص ٤٨٤ ـ ٤٨٦ .

٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە .

٣) ئەوەی کە بوو بە پێشەوای خەواریج ، هەڵبەتە نەك ئەوە کە لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەرچووبێ، بەڵام خەواریج کە لە سەردەمی (عەلی)دا خوا لێی ڕازی بێ ، دەرچوون ، بە پێی ئەوەی پێغەمبەری خوا ئاماژەی بۆ دەکات ، هەڵگری هەمان جۆرە بیروبۆچوونو سیما بوون .

دەستکەوتی جەنگدا) یەکێکیان بە پێغەمبەری خوای فەرموو : (اعْدِل فَإِنَّكَ لَمْ تَعْدِل) ! دادگەربە ، چونکە تۆ دادگەر نەبووی ، (لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە ، گوتوویەتی : ئەی موحەممەد ! پارێز لە خوا بکە ، لە خوا بترسە)[1] چاوی کە ئەو بەرژەوەندیی و حیکمەتەی نەدەبینی ، بۆیە ئەو بێئەدەبییەی کرد بەرانبەر پێغەمبەری خوا ، ئنجا ئەگەر بگوترێ : ئایا ئەگەر بەرژەوەندیی ڕۆژگارێك لە ڕۆژگارەکان وای خواست ، کە پێشەواو حوکمڕانی مسولْمانان ، مامەڵەیەکی وەك مامەڵەی پێغەمبەری خوا بکات ، کە لەگەڵ ئەو سەرۆك هۆزانە کردی ، بۆی هەیە لەگەڵ دوژمنەکەی دا بیکات ، یان نا ؟ دەگوترێ : پێشەوا جێگری مسولْمانانە ، وە بە پێی بەرژەوەندیی ئەوان‌و بۆ بەرپاکردنی ئایین هەڵسوکەوت دەکات ، بۆیە ئەگەر شێوە مامەڵەیەکی وا ، (واتە : دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگ بەسەر کەسانێك دا ، کە ڕەنگە هەر مسولْمانیش نەبن) ، بەڵام بۆ ئەوەی سەرنجیان ڕابکێشێ ، وە شەڕو خراپەیان لە کۆڵ مسولْمانان بکرێتەوە ، ئەوە شتێکی ڕەوایە }وە ئەوە خەرجیی‌و مەسرەفی کەمترە لەوەی شەڕێك بەرپا بکەن ، هەم ئەوان زۆریان لێ بکوژرێ ، هەم ئەهلی ئیسلام زۆری لێ بکوژرێ ، بۆیە ئەگەر ئەو شەڕو بەڵایە لە کۆڵ مسولْمانان بکرێتەوە ، بە تۆزە تەماع‌و بەخششێك شتێکی باشە{[2] ، وە ئەگەر ئەوە پێویست بێ بۆ پاراستنی مسولْمانان‌و قەوارەی ئیسلامیی ، ڕاکێشانی سەرانی کافران ، تاکو مسولْمانان لە شەڕو خراپەو زیانیان پارێزراوبن ، ئەوە حوکمڕانی مسولْمانان ئەم مافەی هەیە ، بەڵکو جاری وایە لەسەریشی پێویست دەبێ .

منیش دەڵێم : دیارە ئەوە (ابن القیم) گوتوویەتی بە پێی بنچینەی : (لِلْوَسائِلِ حُكْمُ الْمَقَاصِدِ) واتە : ئامرازەکان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە ، ئەگەر ئەو ئامانجە بەبێ ئەو ئامرازە جێبەجێ نەبێ ، ئەو کاتە

---

١) }اتَّقِ اللهَ يَا مُحَمَّدُ!{ أَخْرَجَهُ البُخَارِي فِي: كتاب فرض الخمس، باب ومن الدليل على أن الخمس لنوائب المسلمين، ومسلم فِي : (ذِكْرِ الْخَوَارِجِ وَصِفَاتِهِمْ).

٢) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە .

بەکارهێنانی ئەم ئامرازە پێویست دەبێ ، هەروەها بە پێی بنچینەی : (مَا لاَ يَتِمُّ الْوَاجِبُ إلاَّ بِهِ ، فَهُوَ وَاجِبٌ) واتە : هەر شتێك فەرزێك پەکی لەسەری بکەوێ ، ئەویش فەرز دەبێ ، شتێکی ڕاستو ڕەوایەو هیچ گرێو گۆڵی تێدا نیە .

ئەمە کورتەیەك بوو دەربارەی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگیی .

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ ، واتە : }بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ دەستکەوتی جەنگیی دا بکەن{ ئەگەر بڕواتان بە خواو بەوە هەیە کە بۆ سەر بەندەی خۆمان دامانبەزاندوە ، لە ڕۆژی فورقاندا ، ڕۆژی پێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکەدا ، (واتە : سوپای ئیسلامو سوپای کوفر) ، وە خوا لەسەر هەموو شتێك توانایە .

لێرەدا دوو هەڵوەستە دەکەین :

هەڵوەستەی یەکەم : ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە پابەندیی بە شەریعەتەوە نیشانەی ئیمانە .

وە کە خوا دەفەرموێ : ئاوا مامەڵە لەگەڵ دەستکەوتی جەنگیی دا بکەن ، ئەگەر ئیمانتان بە خوا هەیەو ، ئیمانتان بەوە هێناوە کە بۆ سەر بەندەی خۆمان دامانبەزاندوە ، کەواتە : ئینسان بە ئەندازەی ئەوەی ئیمانی هەیە ، پابەند دەبێ ، وە بە ئەندازەی ئەوە کە پابەند دەبێ ، دەیسەلمێنێ کە ئیمانی هەیە .

هەڵوەستەی دووەم : بۆیە خوا باسی ڕۆژی فورقانی کردوە ، چونکە ئەو ڕۆژە بەزەیی و میهرەبانی خوا بۆ ئیمانداران ، وە زاڵیی و دەستەڵاتی خوا بۆ کافران ، زۆر بە جوانیی بەرجەستە بوو بوو ، وە وەك ڕۆژ لە نێوەڕاستی ئاسمان دا دەرکەوت ، کە خوا لەگەڵ ئیمانداران و چەوساوان دایە ، وە خوای دادگەر دژی ئەو زۆردارو ستەمکارانەیە ، کە دەیانەوێ ئازادیی لە مرۆڤەکان زەوت بکەن ، وە ڕێگای دینداریان لێ دەگرن ، زۆر بە جوانیی ئەوە بەرجەستە بوو ،

کەواتە : ئەو خوایەی کە لە ڕۆژی بەرەنگاربوونەوەکەدا ، سیفەتە بەرزەکانی بەرجەستە بوون : میهرەبانیی‌و سۆزو بەزەیی بۆ ئێوە ، وە زاڵیی‌و دەستەڵاتداریی‌و تۆڵە ستاندنەوەی ، بۆ کافرەکان ، ئێوەش بە پەیامو شەریعەتەکەیەوە پابەند بن‌و دەستی پێوە بگرن .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ إِذْ أَنتُم بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا وَهُم بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَىٰ وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ ۚ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَاخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ ۙ وَلَٰكِن لِّيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ ۗ وَإِنَّ اللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ .

**پێنج هەڵوەستە لەبەردەم ئایەتی (٤٢)ەوە کە باسی جوگرافیای گۆڕەپانی جەنگی بەدرو حیکمەتەکانی دەکات**

هەڵوەستەی یەکەم : جارێ پێش هەموو شتێك خوا		حاڵەتی جوگرافیی ئەو سێ لایەنەمان بۆ وێنا دەکات ، کە بریتی بوون لە :

١) کاروانێکی قورەیشییەکان کە بە سەرقافڵەیەتیی ئەبو سوفیان لە شام دەگەڕایەوە ، کە ماڵو سامانێکی زۆری تێدا بوو ، وە نیزیکەی سی تا چل (٣٠ ـ ٤٠) کەس پارێزگارییان لێ دەکرد .

٢) لایەنی دووەم : پێغەمبەری خوا		بوو لەگەڵ هاوەڵانی بەڕێزی دا ، کە لە مەدینە دەرچوون ، بە نیەتی ڕێ پێگرتنی کاروانەکەو دەست بەسەردا گرتنی .

٣) لایەنی سێیەم : ئەو سوپایەی قورەیش بوو ، کە دوای ئەوەی هەواڵیان پێگەیشت کە پێغەمبەری خوا		خۆی‌و هاوەڵانی بەڕێزی لە مەدینە دەرچوونو ، دەیانەوێ ڕێ بەو کاروانە بگرن ، هاتن .

جا لێرەدا خوای زاناو پەنهانزان شوێنی جوگرافییو پێگەی هەر سێ لایەنمان بۆ دیاریی دەكات ، تاكو بەرچاومان ڕوون بێ ، دەفەرمویٚ : ﴿ إِذۡ أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾ ، یاد بكەنەوە كاتێك كە ئێوە لە لاپاڵی نیزیكتر لە مەدینە بوون ، ئەوە بە نسبەت پێغەمبەری خوا ﷺ و مسوڵمانانەوە ، ئەو لا شیوەی كە لە مەدینە نیزیكتر بووە ، دیارە پێی گوتراوە : (العُدْوَة الدُّنیا) ، (عُدْوَة) دیارە بە (عَدْوَة) و (عِدْوَة)ش خوێنراوەتەوە ، واتە : لادیو ، لاشیو ، یان لایەكی دۆڵەكە ، كە دۆڵ و شیوێكی پانو بەرینەو ناوچەیەكی فراوانی گرتۆتەوە ، كەواتە : ﴿ إِذۡ أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾ ، واتە : (بالجانِبِ الأَقْرَب) ، ئەو بەرەی كە لە ئێوەوە نیزیكتر بوو .

وە بە نسبەت سوپای قوڕەیشەوە دەفەرمویٚ : ﴿ وَهُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلۡقُصۡوَىٰ ﴾، سوپاكەی ئەبو جەهلیش كەوتبوونە ئەو لای مەدینەوە ، واتە : لا دۆڵی دوورتر لە مەدینە .

ئنجا بە نسبەت كۆمەڵی سێیەمەوە دەفەرمویٚ : ﴿ وَٱلرَّكۡبُ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ ﴾ ، وە كاروانەكەش لە خوار هەردوو لاتانەوە بوو ، لە دامێنتانەوە بوو ، بە لای دەریای سووردا ، كەواتە : ئەوەی كە ئامانجی ئێوەو ئەوان بوو ، لە هەردووك لاتانەوە نیزیك بوو ، كە كاروانەكە بوو ، ئێوە ئەی مسوڵمانینە ! كە لە مەدینە دەرچوون مەبەستتان گرتنی كاروانەكە بوو ، وە ئەوانیش كە لە مەككە دەرچوون ، مەبەستیان پاراستنی كاروانەكە بوو ، ئێوە بۆ گرتنی كاروانو ئەوانیش بۆ پاراستنی ، نە ئێوە بە مەبەستی جەنگ دەرچوو بوون ، نە ئەوانیش بەو مەبەستە دەرچوو بوون ، بەڵام ئەوەی كە خوا ﷻ ویستی پێچەوانەی ئەوە بوو ، كە هەم ئێوە دەتانویست ، وە هەم سوپاسی قوڕەیشیش دەیوست ، لەبەر ئامانجو حیكمەتێك كە دوایی باسی دەكەین .

هەڵوەستەی دووەم : دوایی خوا دەفەرموێ : ﴿وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡمِيعَٰدِ﴾ ، وە ئەگەر ئێوە بەڵێنتان پێکەوە دابایە ، لەسەر کاتو شوێنی پێکگەیشتنەکە ، ڕاجیا دەبوون ، لەو شوێنەو بەو شێوەیە ، بەرەنگاری یەك نەدەبوونەوە ، لەبەرچی ؟ لەبەر دوو هۆکار :

١) نە ئێوە ئامانجو مەبەستتان شەڕ بوو ، نە ئەوان ، وە هیچ کامتان نەیدەویست ئەو جەنگە بکات ، ئێوە دەتانویست کاروانەکە بگرنو ، ئەوانیش سەرەتا مەبەستیان پاراستنی کاروانەکە بوو ، دواییش کە مانەوە هەر مەبەستیان شەڕ نەبوو ، وەك لە قسەکانی ئەبو جەهلەوە دەردەکەوێ ، هەر مەبەستیان ترساندنو خۆ گیف کردنەوەو لافو گەزافو گەفو خۆڕانواندن بوو ، وە ترساندنی هۆزو تیرەکانی دیکەی عەرەب بوو ، نەیانزانی ئەو شەڕەیان بە مل دادێ .

٢) یاخود مەبەست ئەوەیە کە ئێوە نەتاندەتوانی ئاوا بە وردیی لەسەر کاتو شوێنی جەنگەکە ڕێکبکەون ، چونکە پەیوەندییان پێکەوە نەبووەو وەك ئێستاش کاتژمێرو ئامێرەکانی دیکەی دیارییکردنی کات نەبووە .

هەڵوەستەی سێیەم : ئنجا دوایی دەفەرموێ : ﴿وَلَٰكِن لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا﴾ ، واتە : ئەوەی کە ڕوویدا ، بۆیە ڕوویدا ، تاکو کارێك کە خوای کاربەجێ بڕیاری لەسەر دابوو ، بێتە دی ، دەبێ هەر بێتە دی ، دیارە بڕیاری خوا هەر دەبێ بێتە دی ، ویستی خوا بەرپەرچ دەرەوەی نیە ، دیارە هەرچیش خوا بیەوێ ببێ ، هەمووی بە پێی زانیاریی‌و حیکمەتی خوایە ، وە بۆ ئیمانداران هەمووی بەرژەوەندییەو ، بۆ کافرانیش بە زیان تەواو دەبێ .

هەڵوەستەی چوارەم : ئنجا دوایی ئامانجی هەموو ئەوانە باس دەکات ، کە پێشتر بە ویستی وی ڕوویاندا ، دەفەرموێ : ﴿لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖ﴾ ، تاکو ئەوەی کە لە بەین دەچێ ،

لەبەر ڕۆشنایی بێ ، وە بەڵگەی لەسەر تەواو بکرێو ، بیانووی نەمێنێ ، وە ئەوەش کە دەژیێ بەهۆی ئیمانەوە ، کە مەبەست ژیانی مەعنەوییە ، ئەویش دیسان بەڵگەی بەدەستەوە هەبێ ، کە لەسەر هەقە .

چونکە : ئەوە بەڵگەیەکی ڕاستو دروستو بێ چەندو چوونە ، کە ڕاستییو دروستیی ئیسلامو قورئان دەخاتەڕوو ، کە مسوڵمانان بەو ژمارە کەمەو بەو بێ ئیمکانیەتەوە ، ئەو جەنگە ببەنەوە ، دەرەنجام بەهۆی ئەو جەنگەوە بیانووی کافر بوون نامێنێ ، وە ئەوەی کافربێ بە هیلاك دەچێ لە حاڵێکدا کە بەڵگەی لەسەر تەواو کراوە ، ئەوەش کە دەمێنێ ، کە مسوڵمانانن ، بەڵگەیان بەدەستەوە هەیە کە ئایینەکەیان تەواوە ، وە خوا لەگەڵیانە ، وە لەسەر هەقن ، بە بەڵگەی ئەوە کە ئەو ژمارە کەمە ، دیارە پشتیوانیی خوای لەگەڵدایە ، بۆیە بەسەر ئەو ژمارە زۆرەی کافرەکان دا ، بەو هەموو چەكو تفاقەوەش ، زاڵ دەبن .

هەڵوەستەی پێنجەم : لە کۆتایی ئایەتەکە دەفەرموێ : ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ، وە بێگومان خوا بیسەری زانایە ، واتە : قسەی هەردووك لایان دەبیستێ ، وە نهێنی دڵەکانیشیان دەزانێ .

**مەسەلەی چوارەم** : کە دەفەرموێ : ﴿إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا ۖ وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤٣﴾ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤٤﴾﴾ ، ئەم دوو ئایەتە موبارەکە ، جارێکی دیکە دەستەڵاتو حیکمەتی خوای پەروەردگار لە جەنگی بەدردا ، بۆ ئێمە دەخەنە ڕوو ، دەفەرموێ : یاد بکەنەوە کاتێك خوا بە کەمیی لە خەونتدا ئەوانی پێشانی تۆ دەدا ، (واتە :

ژمارەی سوپای کافرەکانی بە کەم دەخستە پێش چاوت) ، وە ئەگەر بە زۆر خستبایە پێش چاوت ، (وەك خۆیان لە واقیعدا وا بوون ، کە سێ هێندەی مسوڵمانان بوو) ، (ئەوە مسوڵمانان دەترسان ، وە ناکۆك دەبوون لە ئەنجامدانی جەنگەکەدا) ، لە ئەنجامدا دەترسانو بێهێز دەبوون ، بەڵام خوا کارەکەی سەلامەت کرد ، وە بێگومان خوا بە نهێنی سینەکان ئاگادارە .

ئنجا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە : ئایا چۆن خوا پێچەوانەی واقیعی لە خەوندا پێشانی پێغەمبەری خوا داوە ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە ، کە خوای کارزان خودی واقیعەکەی پێشان داوە ، چونکە خەون ڕەمزو هێمایە ، کەمیی ، یانی : بێهێزیی ، وە سوپای کافرەکانیش لە بەرانبەر سوپای ئیمانداران دا بێهێز بوو ، واتە : خوای پەنهانزان واقیعی ڕاستەقینەی کافرەکانی پێشانی پێغەمبەر داوە ، کە بێهێزن ، چونکە کەمیی ژمارە لە خەوندا ، واتە : بێهێزیی .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِذۡ يُرِيكُمُوهُمۡ إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا وَيُقَلِّلُكُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ لِيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗاۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴾ ، یاد بکەنەوە کاتێك کە بە یەك دەگەیشتن ، ئەوانی بە کەم دەخستە بەرچاوی ئێوە ، وە ئێوەشی لە چاوی ئەواندا کەم دەکردەوە ، بۆ ئەوەی کارێك کە خوا بڕیاری داوە ، بێتە دی ، وە سەرەنجامو گەڕانەوە هەر بۆ لای خوایە .

لێرەدا پرسیارێکی دیکە لێرەدا دێتە پێش :

ئایا چۆن خوای کاربەجێ لە کاتی بەرەنگاربوونەوەکەدا ، سوپای هەر کام لە مسوڵمانانو کافرانی ، بە کەم پێشانی ئەوی دیکە داوە ؟!

زانایان بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ، زۆر وەڵامیان داونەوە ، بەڵام من پێم وایە ، ئەوەی کە لە هەموویان زیاتر بە دڵەوە دەنووسێ ، ئەوەیە : کافرەکان بەهۆی لە خۆبایی بوونیانەوە ، مسوڵمانانیان کەم کەوتۆتە بەرچاو ، هەڵبەتە مسوڵمانان هەر خۆشیان ژمارەیان کەم بوو ، لەبەرچاوی کافرەکان ، وە بە

پێچەوانەوە : مسوڵمانانیش بەهۆی پشت بە خوا بەستنیانەوە ، کافرەکانیان بە کەم دەبینی ، بەڵێ دەیانزانی کافرەکان سێ هێندەی وانن ، بەڵام بە کەم دەهاتنە بەرچاویان ، هاوەڵان گوتوویانە : ئنجا یەك بە سێ چییە ؟! ئەوان وا پێدەچێ لەو حاڵەتە ئیمانییە دا بووبن ، کە خوا دەربارەیان دەفەرموێ : ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾﴾الأنفال ، واتە : ئەگەر بیستی خۆڕاگر لە ئێوە هەبن ، بە سەر دوو سەددا زاڵ دەبن ، وە ئەگەر سەدی خۆڕاگرتان هەبێ ، بەسەر هەزاردا زاڵ دەبن ، واتە : یەك بە دە ، بۆیە ئەو کاتە گوتوویانە : یەك بە سێ کەمە ، یانی : کەمیان کەوتوونە بەرچاو ، لەبەرئەوەی لە حاڵەتێکی ئیمانییو ڕووحیی بەرزدا بوون ، ئەوان ئەگەر یەك بە دەش بوونایە ، بەرەنگاریان دەبوونەوە ، بۆیە یەك بە سێیان پێ کەم بووە .

وە دەشگونجێ مەبەست ئەوە بووبێ کە (ابن كثير) لە تەفسیرەکەی خۆیدا گوتوویەتی ، کە لە هەمان کاتدا دەیەوێ وەڵامی پرسیارو ئیشکالێکی دیکەش بداتەوە ، دەڵێ : (وَمَعْنَى هَذَا : أَنَّهُ تَعَالَى أَغْرَى كُلاًّ مِنَ الفَرِيقَيْنِ بِالآخَرِ ، وَقَلَّلَهُ فِي عَيْنِهِ لِيَطْمَعَ فِيهِ ، وَذَلِكَ عِنْدَ المُوَاجَهَةِ ، فَلَمَّا التَحَمَ القِتَالُ وَأَيَّدَ اللهُ المُؤْمِنِينَ بِأَلْفٍ مِنَ المَلاَئِكَةِ مُرْدِفِينَ ، بَقِيَ حِزْبُ الكُفَّارِ يَرَى حِزْبَ الإِيْمَانِ ضِعْفَيْهِ ، كَمَا قَالَ تَعَالَى : ﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ ۚ وَاللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَن يَشَاءُ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُولِي الْأَبْصَارِ ﴿١٣﴾﴾آل عمران ، وَهَذَا هُوَ الجَمْعُ بَيْنَ هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ ، فَإِنْ كُلاًّ مِنْهَا حَقٌّ وَصِدْقٌ ، وَللهِ الحَمْدُ وَالمِنَّة)[1] .

---

١) المِصْبَاحِ المُنِيرِ فِي تهذيب تفسير ابن كثير ، ص ٥٤٢ .

واتە : وە مانای ئەمە ، ئەوەیە كە خوای بەرز هەر كام لەو دوو كۆمەڵەی لە دژی یەكدی هانداوەو ، بەرانبەرەكەی لەبەرچاوی ئەوی دیكە كەم كردوە ، تاكو تەماعی تێبكات ، ئەوە لە كاتی بە یەكگەیشتندا ، بەڵام دوای ئەوەی تێكرژان بووو ، جەنگەكە روویدا ، وە خوا ئیماندارانی بە هەزار لە فریشتەكان كە ئیدیكەشیان بە دوادا دەهات ، پشتگیر كردو هاوكاریان بوو ، كافرەكان سوپای مسوڵمانانیان دوو هێندەی خۆیان دەبینی ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِي فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَـٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ ۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِي ٱلْأَبْصَـٰرِ ﴿١٣﴾ ﴾ آل عمران ، واتە : بە راستی لە دوو كۆمەڵدا كە بەرەنگاری یەكدی بوونەوە ، نیشانەیەك ی گەورە بۆ ئێوە هەیە ، كۆمەڵێكیان لە رێی خوادا دەجەنگیو یەكیشیان بێبڕوا بوو ، كە بە دیتنی چاو ، دوو هێندەی خۆیانیان دەیانبینین ، وە خواش بە یارمەتی خۆی هەر كەس بیەوێ ، پشتگیریی دەكات ، بێگومان لەوەدا پەندێكی گەورە بۆ خاوەن عەقڵان هەیە .

دیارە بەو شێوەیەش هەردووك ئایەتەكە كۆدەبنەوە ، كە بێگومان هەردووكیان هەقو راستن ، ستایشو چاكەش هەر هی خوایە .

منیش دەڵێم : دیارە واقیعی رواڵەتی مسوڵمان كەم بووە ، بۆیە ئەگەر كافرەكان وەك خۆیان مسوڵمانانیان بینبێ ، ئاساییە ، كە خوا دەفەرموێ : ئێوەم لە چاوی ئەوان دا كەم دەكردەوە ، واتە : وەك واقیعی خۆیان بینیوویانن ، وە بە نسبەت كافرەكانیش بەڵێ زۆر بوون ، بەڵام خوای كارزان بە كەمیی خستوونیە بەرچاوی مسوڵمانان ، واتە : خوای پەنهانزان تەنیا بەشێكیانی خستوونە بەرچاوی مسوڵمانان ، یاخود مسوڵمانان لە ئەنجامی ئەوەدا كە خاوەن مەعنەوییاتێكی بەرز بوون ، ـ وەك گوتم ـ كافرەكانیان بە كەم بینیوە ، وە خوای بە بەزەیی واقیعی راستەقینەی كافرەكانی خستۆتە بەرچاویان ، كە

هەرچەندە بە ژمارە زۆر بوون ، بەلاَم هێزو پێزێکی وایان نەبووە ، دیارە حیکمەتی هەموو ئەوەش ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا﴾ ، بۆ ئەوەی کارێك کە خوا بڕیاری داوە ، بێتە دی ، واتە : خوا کارێکی کردوە ، کە هەردوولا سووربن لەسەر ئەنجامدانی جەنگەکە ، هیچ کامیان لەوی دیکە نەترسێو پاشەکشە نەکات ، بەڵکو خۆیان پێکدابدەن ، تاکو سەرەنجام ئەو حیکمەتو ئامانجە کە خوا بۆ مسوڵمانان ویستوویەتی ، بێتە دی ، کە بریتی بووە لە شکاندنی لووتی کافرە خۆ بەزل گرەکان ، وە سەرەنجام هاتە دی .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ ، وە بێگومان سەرەنجامی کارەکان بۆ لای خوایە ، واتە : خوا چۆنی بوێ ، کارەکان بەو ئاقارەدا دەبات ، بەلاَم لە ڕێی یاساکان (سنن)ی دا ، کە لە بوونەوەرو ژیانی مرۆڤ دا دایناون .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەوتەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لە دە (١٠) ئـایەت پێك دێ ، ئـایەتـەكـانی : (٤٥ تـا ٥٤) ، سـەرەتا بـۆ جـاری شـەشـەمو كۆتـایی لـەم سوورەتـەدا ، خـوای كاربـەجێ ، بـە نازنـاوی ئیمـان : چ ó Ó æ چ ، ئـەی ئـەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە ! مسـوڵمانان دەدوێنـێو ، پێیـان دەفـەرموێ : كـە لـە كـاتی بـەرەنگاربوونـەوەی دوژمنانیـاندا ، چەسـپاوبنو زۆر یـادی خـوا بكـەن ، ئـەگەر دەیانـەوێ سـەركـەوتووبـن .

پاشـان چـەند ئـامۆژگـارییو ڕێنمـاییەكی گرنگیـان لـە بـواری جـەنگو جیهـاددا ئـاڕاستـە دەكـات ، وەك :

١- فـەرمانبـەرییو خـواو پێغـەمبـەر .

٢- پێكـەوە ناكـۆك نـەبوون .

٣- خۆڕاگـریـی .

٤- وە وەك كـافران نـەچوونـە دەر ، بـە فیـزو لـە خۆبـایی بـوونو خۆڕانـوانـدنو ، خەڵك گیـڕانـەوەوە لـە ڕێی خـوا .

پاشـان بـاسی هـەڵوێستی سـوپایەكـەی كـافرانی مەككـە دەكـات ، كـە چۆن شـەیتان كردەوەكـانیـانی بۆ ڕازاندبوونـەوەو خوتخوتـەی بۆ كردبوون ، كـە هیچ كـەس پێیـان ناوێرێو ، ئـەویش هاوكـاریانـە ، كـەچی لە كـاتی لێك وەدەركـەوتنی دوو سـوپایەكـەدا ، لەسـەر پاژنـە پێیەكـانی كشـاوەتـەوەو پێـی گـوتوون : مـن لێتـان بـەریـیـمو ئـەوەی مـن دەیـبینـم ، ئێـوە نایـبینـن ، وە من لە خـوا دەترسـمو ، خـوا سزای سـەختـە !

ئنجا خوا باسی هەڵوێستی دەغەڵو دڵ نەخۆشەكان دەكات ، كە گوتوویانە : ئایینەكەیان فریوی داون ! لە حاڵێكدا كە هەر كەس پشت بە خوا ببەستێ ، زایە نابێ ، چونكە خوا زاڵی كارزانە .

دوایی باسی حاڵەتی سەرەمەرگی كافرەكان دەكات ، كە فریشتەكان لە ڕوویانو پشتیان دەدەن ، كە دیارە ئەوەش كردەی دەستی خۆیانەو خوا ستەم لە بەندەكانی ناكات .

ئنجا سەرەنجامی شوومی كافرەكان ، بە حاڵی دارو دەستەی فیرعەونو ئەوانەی پێش وان دەشوبهێنێ ، دەفەرموێ : سەرەنجامی ئەو كافرانەی ڕۆژگاری ئێوەش ، وەك سەرەنجامی دارو دەستەی فیرعەونو ئەوانەی پێش دارو دەستەی فیرعەون ، دەبێ .

دواتر خوا یاسایەكی دادگەرانەی خۆی ڕادەگەیەنێ، كە هەرگیز چاكەیەك كە لەگەڵ خەڵكێكی كردوە ، لێیان ناگۆڕێ ، تاكو ئەوان خۆیان بەرەو خراپە نەگۆڕن .

وە لە كۆتایی دا : جارێكی دی حاڵو واقیعی كافرەكان ، بە نیزیكانی فیرعەونو ئەوانەی پێش وان دەشوبهێنێ ، كە سەرەنجام سەریان بە فەتارەت چووە ، بەهۆی بە درۆ دانانی ئایەتەكانی خواو ستەمكارییانەوە .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْۖ وَٱصْبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٤٧﴾ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْۗ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٥١﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۚ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٥٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٣﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَۚ وَكُلٌّ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾

# مانای وشــه بە وشـەی ئایەتەكـان

}ئـەی ئـەوانـەی بڕواتان هێنـاوە ! هـەر كـات بـەرەنگاری كۆمەڵێـك لـە (بێبـڕوایـان) بوونـەوە ، چەسپاوبـن ، وە زۆر یـادی خـوا بكـەن ، بـەڵكـو سـەرفراز (و سـەركـەوتوو) بـن ﴿٤٥﴾ وە فەرمانبـەریی خـواو پێغەمبـەرەكـەی بكـەنو ، لـە نێـو خۆتانـدا ناكـۆك مەبـن ، (ئـەگـەرنا) دەدۆڕێنو هێـزو پێزتان نامێنـێ ، وە خۆڕاگربن ، بـە دڵنیـایی خـوا خۆڕاگرانـی خۆشـدەوێن ﴿٤٦﴾ وە وەك ئـەوانــە مەبــن كــە بــە لـە خۆبـایی بـوونو خۆڕانـواندنــەوە بـۆ خەڵــك ، بـۆ جـەنگ چوونــە دەر ، وە خەڵكیــان لـە ڕێـی خــوا دەگێڕایــەوە ، وە خــوا دەوروەدەری ئـەوەیــە كــە دەیكــەن ﴿٤٧﴾ (وە یــاد بكەنــەوە !) كاتێك شـەیتان كـردەوە (خراپە)كانیـانی بـۆ ڕازاندنـەوەو پێـی گـوتن : ئـەمـڕۆ هـیچ كەس لـە خەڵكی پێتان نـاوێرێ ، وە مـن هاوكـار (و پـەنادەر)تانم ، بـەڵام كاتێـك دوو كۆمـەڵەكە لـە یـەك وەدەركـەوتن ، لەسـەر دوو پاژنـەكـانی كشـایەوەو گوتـی : مـن لـە ئێـوە دوورم ، ئـەوەی مـن دەیـبینـم ، ئێـوە نایـبینـن ، مـن لـە خـوا دەترسـم ، وە خـوا سـزای تونـدە ﴿٤٨﴾ (یـاد بكـەنـەوە !) كـاتێك دەغەڵەكـانو ئـەوانـەی دڵیـان نـەخۆشـیی تێدایـە ، دەیـانگوت : ئـەو (بـڕوادار)انـە ئـایینـەكـەیـان فریوی داون ، بـەڵام هـەر كـەس پشـت بـە خـوا ببەسـتێ ، ئـەوە بـە دڵنیـایی (سـەردەكـەوێ ، چونكـە) خــوا زاڵـی كـارزانـە ﴿٤٩﴾ وە ئـەگـەر فریشـتـەكـان ببینی كـە گیـانی ئـەوانـەی بێبـڕوان دەكێشـن : لـە ڕوویـانو لـە پشـتیـان دەدەن ، وە (پێیـان دەڵێن :) ئـازاری سووتێنـەر بچێـژن (دیمەنێكی سامنـاكت دەدی) ﴿٥٠﴾ ئـەو (سـزای)ـەش بـەهـۆی ئـەو (كردەوانـ)ـەوەیە كـە دەستـەكانتان پێشكەشیـان كردوە ، وە مسۆگەر خوا بـەرانبـەر بـەندەكـانی ستـەمكـار نیـە ﴿٥١﴾ (حاڵـەتی كافـران) وەك نـەریتی شوێنكەوتووانی فیـرعـەونو ئـەوانـەی پـێش وانـە : بـە ئـایەتـەكانی خـوا بێبـڕوا بوون ، خـواش بـەهـۆی گوناهـەكانیـانـەوە گرتنـی ، بــە دڵنیــایی خــوا بـەهــێزی ســزا سـەختــە ﴿٥٢﴾ ئــەو (سـزادانـ)ــەش لـە سـۆنگـەی ئـەوەوەیە كـە (یـاسـایـەكی خـوایە) خـوا چاكـەیەك كـە لەگەڵ كۆمەڵـێكی دا كـردوە ،

لێیـان (بـە سـزاو بـەڵا) ناگـۆڕێ ، تاکـو ئـەوان حاڵـەتی خۆیـان (لـە چاکـیيەوە بـۆ خراپیی) نـەگۆڕن ، وە بێگومـان خـوا بیسـەری زانایـە ﴿٥٣﴾ (حاڵـەتی بێبـڕوایـان) وەك نـەریتی شـوێنکـەوتووانی فیـرعەونو ئـەوانـەی پـێش ئـەوانـە : ئـایەتـەکـانی پەروەردگـاریـان بـە درۆ دانـا ، ئێمەش بـەهـۆی گوناهـەکانیانـەوە ، لـە نێومـان بـردن ، وە (فیـرعەون)و پەیـڕەوانی فیـرعەونمـان (لـە دەریـادا) خنکـاندن ، وە هـەمووشیـان (بـەرانبـەر ، بـە خـۆیـان) سـتـەمکار بوون ﴿٥٤﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(إِذَا لَقِيتُمۡ ) : پێشتریش گوتوومانە ، (لقي) واتە : پێیگەیشت ، بەلاَم زیاتر بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوولایەنی دوژمن یان زیاتر بەکاردێ ، (لَقِيَهُ لِقاءً وَتِلْقاءً ، اسْتَقْبَلَهُ وَصادَفَهُ) .

واتە : پێیگەیشتو پێشوازیی لێکرد ، بەلاَم زیاتر بۆ بەرەنگاربوونەوەی شەڕ بەکاردێ .

(فِئَةً ) : (الفِئة : الجَمَاعَةُ المُتَظاهِرَةُ الَّتِي يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلى بَعْضٍ فِي التَّعَاضُدْ).

(فِئة) کۆمەڵێکن کە پشتی یەکدی دەگرن ، هەندێکیان بۆ لای هەندێك دەگەڕێنەوە ، پشتی یەك دەگرن‌و بۆ یەکدی هاوکارن .

(فَٱثۡبُتُواْ ) : واتە : بچەسپێن ، (الثَّباتُ : ضِدُّ الزوَالِ : ثَبَتَ يَثْبُتُ ثَباتاً) .

(ثَبات) واتە : مانەوە ، پێچەوانەی لاچوونە ، دەگوترێ : (ثَبَتَ يَثْبُتُ ثَباتاً) واتە : چەسپا ، دەچەسپێ ، چەسپین ، وە دەگوترێ : (رَجُلٌ ثَبْتٌ وَثَبِيْتٌ فِي الحَرْب) پیاوێك كە لە جەنگدا نەجووڵێ‌و نەلەخشێ ، سەنگەر چۆڵ نەکات ، پشت لە دوژمن نەکات ، پێی دەگوترێ : (ثَبْت و ثَبَيت).

(لَعَلَّكُمۡ ) : وشەی (لَعَلَّ : طَمَعٌ وإشْفَاقٌ) .

واتە : ئومێدەوارییە بە بوونی شتێك‌و ترسانیشە لە نەبوونی ، جا دیارە ئەوە بە نسبەت خوای بێ وێنەوە ، گونجاو نیەو نابێ ، بۆیە هەندێك لە توێژەروان گوتوویانە : (لَعَلَّ : مِنَ اللهِ وَاجِبٌ) واتە : هەرکاتێ خوا فەرمووی : (لَعَلَّ) ئەوەتان بۆ بکەم ، مانای وایە ئەو شتە خوا لەسەر خۆی واجبی دەکات ، لە بنەڕەت دا (لَعَلَّ) یانی : ئومێد وایە ئەو شتەتان بۆ بکرێ ،

ئومێد وایە كە ئەنجامەكەی وابێ ، بەڵام كە لە قورئان دا بەكاردێ ، ئەو ئومێدبوونە پەیوەندیی بە مرۆڤەكانەوە هەیە ، واتە : ئەگەر ئێوە وا بكەن ، ئومێدەواربن كە ئەو شتەتان بۆ دێتە دی .

(وَلَا تَنَٰزَعُواْ) : واتە : پێكەوە ناكۆك مەبن ، (التَنَازُعُ والمُنَازَعَةُ : المجاذَبَة وَيَعْبَّرُ بِهِمَا عَنْ المُخَاصَمَةِ وَالمُجادَلَة .

واتە : (تَنَازُعُ) و (مُنَازَعَة) ئەوەیە كە هەر كامێكیان ئەوی دیكە ڕابكێشێ ، وە مەبەست پێی شەڕە قسەو مشتومڕە .

(فَتَفۡشَلُواْ ) : (الفَشَلُ : ضَعْفٌ مَعَ جُبْن ، وَتَفَشَّلُ المَاءُ : سالَ) .

واتە : (فَشَلْ) بریتییە لە بێهێزیی لەگەڵ ترساندا ، وە دەگوترێ : (تَفَشَّلُ المَاءُ) واتە : ئاوەكە ڕژا .

(وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡ) : واتە : باتان نامێنێ ، لە كوردەوارییش دا ، دەگوترێ : (بای كێیە ؟) واتە : كێ سەركەوتوو دەبێ ، دەڵێ : (الرِّيحُ : قَدْ يُسْتَعَارُ لِلغَلَبَة) ، وشەی (ریح) دەخوازرێتەوە بۆ زاڵ بوون ، ئەگەرنا (ریح) لە ئەسڵدا بە مانای (با) ، وە (بۆن) دێ .

(بَطَرًا ) : (البَطَرُ : دَهَشٌ يَعْتَرِي الإنْسانَ مِنْ سوءِ احْتِمَالِ النِّعْمَةِ وَقِلَّةِ القِيامِ بحَقِّهَا ، وَيُقَارِبُ البَطَرَ : الطَّرَبُ) .

وشەی (بَطَر) حاڵەتێكی سەرسامییە بۆ ئینسان دێتە پێش لەبەرئەوە كە نیعمەتو چاكەیەكی پێ دەدرێ ، تەحەمولی ناكات ، پێی لەخۆبایی دەبێ ، وە (بَطَر) و (طَرَب) لێك نیزیكن ، (بَطَر) زۆر خۆشحاڵ بوونو كەیف بەخۆهاتن ، بە كوردیی دەبێتە لە خۆبایی بوونو لە خۆ دەرچوون ، (طَرَب)یش مانایەكەی لەوەوە نیزیكە : (الطَّرَبُ : خِفَّة تصيبُ الإنسانَ لِشدة حُزنٍ أو سرور)، مختار الصِّحاح ، ص ٣٨٩ .

(وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ ) : (أي : مُرَاءَاةً وَتَشَبُّعاً) .

واتە : ڕیابازیی‌و خۆڕانواندن لەبەرچاوی خەڵك .

(وَيَصُدُّونَ ) : (الصُّدُودُ وَالصَدُّ ، قَدْ يَكونُ انْصِرَافاً عَن الشيءِ وَامْتِنَاعاً ، وَقَدْ يَكونُ صَرْفاً وَمَنْعاً) .

(صُدُودُ ، صَدّ) دەگونجێ بریتی بێ لەوەی كە ئینسان خۆی واز لە شتێك بێنێ‌و ، ڕووی تێنەكات‌و دەستبەرداریی بێ ، وە دەشگونجێ بریتی بێ لەوە خەڵك لابدەی‌و پێشگیریی لە خەڵك بكەی ، لەوەی بەرەو هەق بچن ، جا لێرەدا كە خوا وای فەرمووە ، مەبەستی ئەوەیە ئەوانەی لە ڕێی خوا لادەدەن ، یان خەڵك لادەدەن .

(جَارٌ لَّكُمْ ) : (الجارُ : مَنْ يَقْرُبُ مَسْكَنُهُ مِنْكَ ، وَأَجارَهُ وَهُوَ جارٍ لَهُ) .

وشەی (جار) كەسێكە كە خانووەكەی لە تۆ نیزیكە ، وە (أَجارَهُ) واتە : پەنای دا ، وە (هُوَ جارٍ لَهُ) واتە : پەنادەریەتی .

(تَرَآءَتِ ) : واتە : لێك وەدەركەوتن ، (تَقَارَبَتْ وَتَقَابَلَتْ حَتَّى صارَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بحَيْثِ يَتَمَكَّن مِن رُؤيَةِ الآخَر) .

لێك نیزیك كەوتن‌و بەرانبەر یەك بوون ، هەتا هەر كامێكیان توانی ئەوی دیكە ببینێ .

(نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ ) : (النُّكوصُ : الإحْجامُ عَنِ الشيءِ ، وَالعَقِبُ : مُؤخَّر الرِّجْل) .

(نكوص) بریتیە لەوە كە ئینسان بێتە دوایە ، وە (عَقِب) بە پاژنەپێ دەگوترێ .

(غَرَّ ) : ( غَرَرْتُ فُلاَنَاً : أَصَبْتُ غِرَّتَهُ وَنِلْتُ مِنْهُ مَا أُرِيدُه ، وَالغِرَّةُ : غَفْلَةٌ فِي اليَقْظَةِ) .

كە دەگوترێ : (غَرَرْتُ فُلاَنَاً) واتە : لە كاتی بێئاگایی دا زەفەرم پێبرد ، وە (غِرَّة) دەڵێ : بێئاگاییەكە لە كاتێكدا كە كابرا بێداریشە .

(يَتَوَفَّى ) : (عُبِّرَ بِهِ عَنِ المَوْتِ وَالنَّوْمِ) .

واتە : (توفّي) تەعبیرێکە بەکاردێ لە جیاتی مردنو خەوتن ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا ... ﴿٤٢﴾ ﴾ الزمر ، واتە : خوا گیانەکان دەکێشێ لەکاتی مردنیان دا ، وە ئەوەی نەمردبێت لە کاتی خەوتنی دا ... ، کە دیارە ئەوەی یەکەمیان مەبەست پێی مردنە ، ئەوەی دووەمیش مەبەست پێی خەوە .

(وَذُوقُواْ ) : (الذّوقُ : وُجُودُ الطَّعْمِ بالفَمِ ، وَكثر اسْتِعْمَالُهُ فِي العَذَابِ) .

(ذوق) بریتیە لەوەی کە ئینسان بە زار شتێك بچێژێ ، بەلاّم بە زۆریی بەکاردەهێنرێ لە سزادا .

(ٱلْحَرِيقِ ) : (الحَرِيقُ : النَّارُ ، يُقَالُ : أحْرَقَ كذَا فَاحْتَرَقَ) .

(حريق) واتە : ئاگر ، وە بە مانای سووتێنەریش دێ .

(بِظَلَّٰمٍ ) : ( الظُّلْمُ : وَضْعُ الشيءِ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ المُخَصَّصِ بِهِ ، إما بنقصانٍ أو بزيادَة ، وإما بعدول عَنْ وَقْتِهِ ومَكانِهِ) .

(ظُلْم) بریتیە لەوە : شتێك لەو شوێنە تایبەتییەی کە بۆی دانراوە ، دانەنرێ ، یان بەوە کە لێی کەم بکرێ ، یان لێی زیاد بکرێ ، یاخود لە کاتو شوێنەکەی لابدرێ .

(كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ ) : (الدأبُ : إدَامَةُ السَّيْرِ ، وَالعَادَةُ الْمُسْتَمِرَّةُ دَائِمَاً عَلَى حَالَةٍ) .

واتە : (دأْب) بریتیە لە بەردەوامبوون لەسەر رۆیشتن ، وە هەر نەریتێکی بەردەوام کە لەسەر یەك شێوە بڕوا ، دیارە کە وشەی (دَأب) بە عادەتو بە سوننەتیش تەفسیر کراوە .

(ءَالِ فِرۡعَوۡنَ) : واتە : دارو دەستەی فیرعەون ، یاخود شوێنکەوتووانی ، یان نیزیکانی چونکە دەڵێ : (الآلُ : يُسْتَعْمَلُ فيمَنْ يُخْتَصُّ بالإِنْسان اختِصاصاً ذَاتِيا إِمَّا بِقَرَابة قَرِيبة أَو بِمَوالاَةٍ) .

واتە : (آل) بەکاردەهێنرێ بۆ کەسانێك کە تایبەتن بە ئینسانەوە ، بە شێوەیەکی خودیی ، یان بەهۆی خزمایەتییەکی نیزیکەوە ، یاخود بەهۆی شوێنکەوتنەوە .

# مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خــوای پەروەردگــار ســەرەتا لـەم دە ئـایەتــەدا ، بـۆ جـاری شەشـەمو کۆتـایی لـەم سوورەتـــەدا بـــە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ ، مســـوڵمانان دەدوێنـــێ ، وە چـــەند ئــەدەبێکی بــەرزی جـەنگو جیهادیــان فێــر دەکـات ، هــەروەها سـەرەنجامی شــوومی کـافران دەخاتـەڕوو ، هەروەهـا سـەرنجی هـەموو لایـەك ڕادەکێشــێ بـۆ ڕابـردوو ، کـە خـوا چۆن مامەڵەی کردوە لەگەڵ کەسانێك دا ، کە دژایەتیی خوای و کتێبەکانیو پێغەمبەرەکانییان کردووەو دەکەن ؟ سەرەتا دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ ﴾ ، ئـەی ئـەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە ! هــەر کـات بـەرەنگـاری کۆمەڵێك لە جەنگاوەرانی بێبڕوا بوونـەوە ، کـە شـەڕیـان پێفرۆشـتن ، چەسپاوبـن ، دامەزراو نـەلـەخشـاو بـن ، ﴿ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ ، وە زۆر یـادی خـوا بکـەن ، بـەڵکـو سـەرفـرازو سەرکـەوتوو بـن ، کـە لـێرەدا وشـەی (فلاح) واتــە : سـەرفرازیـی ، وە مەبـەسـت لـە سـەرفـرازیـیش لـێرەدا ، بریتیـە لـە زاڵ بـوونو سـەرکـەوتن بـەسـەر دوژمــن دا .

پـاش ئـەوەی فـەرمانیـان پێدەکـات بـە چەسپاویی‌و نـەلەخشـاویی‌و زۆر یـادی خــوا کردن ، ئنجا فـەرمانێکی دیکەیان پێدەکات ، دەفەرموێ : ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾، وە فـەرمانبـەریی خــواو پێغـەمبـەرەکـەی بکـەن ، واتــە : پابــەند بـن ، بــە ئـاڕاسـتـەو ڕێنماییەکانی خـواوە ، کـە لە قوڕئـاندا بـەرجەستـەن ، وە بە ئـاڕاسـتـەو ڕێنماییەکانی پێغـەمبــەری خــواوە ، کــە لـە سوننـەتەکـەی دا بەرجەســتــەن ، وەك زۆر جــاری دیکەش گوتوومانـە : سوننــەتیش هــەر بریتیـە لـە جێبـەجێکـردنو پڕاکـتیك کردنـی قوڕئـان ، لەسـەر ئـەرزی واقیـع .

ئنجا خـوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ ﴾ ، وە لـە نێـو خۆتانـدا ناکـۆك مەبـــن ، دووبـەرەکـــی‌و گـوریس پچڕکێنــە مەکــەن ، ئـەگــەرنا بێهــێز دەبــن ، یـــان

تێدەشکێن‌و دەترسێن دەدۆڕێن‌و هێزو پێزتان نامێنێ ، وە خۆڕاگربن ، بە دڵنیاییی خوا خۆڕاگرانی خۆشدەوێن .

وشەی (فشل) لە زمانی کوردییشدا هەر بەو مانایە بەکاردێ ، واتە : تێشکان ، دۆڕان ، ﴿وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡ﴾ ، وە (با)تان نامێنێ ، وشەی (ریح) لە ئەسڵدا بە مانای (با) دێ ، وە بە مانای بۆنیش دێ ، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ هێزو پێز ، لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن : (ئەرێ بای کێیە ؟) یان دەڵێن : (بای فلان لایەنە) ، واتە : با بە قازانجی ئەوانە ، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە هێزو پێزتان نامێنێ .

ئنجا خوا فەرمان بە بڕواداران دەکات‌و ، دەفەرموێ : ﴿وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ ، وە ئارام بگرن ، بێگومان خوا لەگەڵ خۆڕاگران دایە ، دوایی خوا شتێك لە بڕواداران قەدەغە دەکات ، کە بریتیە لەوەی ڕەفتارێك لە خۆیان بپشکوێننەوە ، بە شێوەیەك ڕەفتار بکەن ، کە هی کافرەکانە ، دەفەرموێ : ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ ، وە وەك ئەوانە مەبن ، کە لە ماڵ‌و حاڵی خۆیان هاتنە دەر ، بە فیزو دەمارەوەو ، بە لە خۆبایی بوون‌و خۆڕانواندنەوە لەبەرچاوی خەڵك ، کە مەبەست پێی سوپایەکەی کافرەکانی قوڕەیشە ، بە فەرماندەیەتیی ئەبو جەهل ، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین ، چۆن ئەبو جەهل گوتی : دەبێ بچینە سەرچاوەی بەدرو ، وە لەوێ شەڕاب بخۆینەوەو ، حوشتران سەرببڕین‌و خواردن بخۆین‌و ، خواردن بدەین بە خەڵك ، وە دەبێ ئافرەتانی گۆرانی بێژو هونەرمەند ، گۆرانییمان بۆ بڵێن ، کەیفو خۆشیی بکەین ، تاکو خەڵك لێمان بترسن ، واتە : مسوڵمانان‌و هۆزەکانی دیکەی عەرەبیش !

خوای تاك‌و پاك دەفەرموێ : ئێوە وەك ئەوان مەبن ، ئەی مسوڵمانینە !

ئنجا باسی ڕەفتارێکی دیکەیان دەکات ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ، وە خەڵکیان لە ڕێی خوا دەگێڕایەوە ، یاخود بۆخۆشیان لە ڕێی خوا لایان دەدا ،

﴿وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ﴾ ، وە خوا دەوروەدەری ئەوە بوو کە دەیانکرد ، واتە : لە چنگی دەستەڵاتی خوا دەرباز نەبوون .

ئنجا خوای کاربەجێ هەڵوێستێکی دیکەی هاوبەش بۆ خوادانەرەکانی مەککە ، کە هاتبوون شەڕ بە ئیسلام و مسوڵمانان بفرۆشن دەخاتە ڕوو ، دەفەرمویٚ : ﴿وَإِذۡ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ ، وە یاد بکەنەوە ! کاتێك شەیتان کردەوە خراپەکانیانی بۆ ڕازاندنەوەو ، لەبەرچاوی جوان کردن ، ﴿وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ ، وە پێی گوتن : ئەمڕۆ هیچ کەس لە خەڵکی پێتان ناوێرێ و تێکتان ناشکێنێ و ، هیچ کەس بەسەر ئێوەدا زاڵ نابێ .

دیارە شەیتان ویستوویەتی هانیان بداتو ، تیژیان بکات لە بەرانبەر ئیسلام و مسوڵماناندا ، وە مەعنەوییاتیان بەرز بکاتەوە ، ﴿وَإِنِّي جَارٞ لَّكُمۡ﴾ ، وە منیش داروسیٚ و هاوکارو پەنادەری ئێوەم ، دیارە دەربارەی ئەوە کە شەیتان وای پێگوتوون ، چۆنی پێگوتوون ؟ دوو بۆچوون هەن :

یەکێکیان دەڵێ : چۆتە سەر شێوەی سوراقە ، کە یەکێك بووە لە سەرۆك هۆزە ناودارەکان و ، لەسەر شێوەی وی قسەی بۆ کردوون .

هەندێکیش دەڵێن : خوتخوتەو دنەدانی شەیتان چووە دڵیانەوە ، کە ئێوە بە توانان و کەس پێتان ناوێرێ و ، منیش هاوکارتانم .

﴿فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلۡفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ﴾ ، بەڵام کاتێك دوو کۆمەڵەکە لێك وەدەرکەوتن ، یەکدییان بینی ، پاشەو پاش لەسەر دوو پاژنە پێیەکانی کشایەوەو ڕایکرد ، جاری وا هەیە ئینسان شتێك دەبینێ ، زۆری لێ دەترسێ ، فریا ناکەوێ وەرسووڕێ ، هەر یەکسەر پاشەو پاش دەکشێتەوە ، ﴿وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكُمۡ﴾ ، (شەیتان) گوتی : من لە ئێوە دوورم و حاشاتان لێدەکەم ، ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ﴾

ئـەوەی مـن دەیـبینم ئێـوە نایـبینن ، ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ﴾ ، مـن لـە خـوا دەترسم ، ﴿وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ ، وە بێگومان خـوا سـزای توندە .

ئنجـا هـەڵوێسـتێکی دیکـەی مونـافیقو دڵ نـەخۆشـەکـان دەخاتـەڕوو ، دەفـەرموێ : ﴿إِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ، یـاد بکەنـەوە ! کـاتێك دەغەڵەکانو ئـەوانـەی دڵیان نـەخۆشـیی تێدایـە دەیـانگوت : ﴿غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمۡ﴾ ، ئـا ئـەوانـە ، یـانـی : مسوڵـمانـان ، ئـایینـەکـەیان فریـوی داونو هـەڵیخـەڵـەتاندوون ، وە دەبنـە نێچیـرێکی تووك نـەرم ، بـە دەست سـوپای قوڕەیشـەوە .

دیـارە مونـافیقەکـان ، ئـەوانـە بـوون کـە بـە ڕواڵـەت خۆیـان بـە مسوڵـمـان پیشـانداوەو ، لە دڵـی خۆیـاندا کافـر بـوون ، ئـەوانـەش کـە دڵیـان نـەخۆشـی تێـدا بـووە ، دیـارە مسوڵمانانێـك بـوون ، کـە مونـافیق نـەبوون ، بـەڵام هـەندێ لـە سیفـەتـەکـانی مونافیقـانیـان تێـدا بـووە ، دڵیـان نـەخۆشـیی گومـانی تێـدا هـەبووە ، ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ ، وە هـەر کەسێکـیش پشـت بـە خـوا ببـەستێ ، ئـەوە بـە دڵنیـایی خـوا زاڵـی کارزانـە ، زاڵە هـەر کـەسـێك پشـتی پێ ببـەستێ ، سـەری دەخات ، وە کـارزانیشـە ، دەزانـێ چی بۆ دەکات .

ئنجا کـە دەفـەرموێ : ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ﴾ ، دیـارە وشـەی (لَـوْ) وەڵامێکـی دەوێ ، بۆ وێنـە : دەگـوترێ : (لَوْ زَارَنِي مُحَمَّدٌ لأَكْرَمْتُهُ).

واتـە : ئـەگەر موحەممـەد سـەردانم بکات ، ڕێـزی دەگـرم ، ڕسـتـەی : (ڕێـزی دەگـرم) وەڵامـی ڕسـتـەی : (ئـەگـەر موحـەممـەد سـەردانم بکـات)ە ، بـەڵام وشـەی : ئـەگـەر (لَـوْ) لێرەو لە زۆر شـوێنی دیکـەی قورئـانیش دا ، وەڵامەکـەی لابراوە ، لەبـەرئـەوەی بەهـۆی سیاقـەوە ، سـەلیقـە وەڵامەکـەی دەزانـێو ، پێویسـت بـە گوتـنـێ ناکـات ، لێـرەش کـە دەفـەرموێ : ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ، ئـەگـەر تـۆ

فریشتەکان ببینی ، کاتێك کە گیانی ئەوانەی بێبڕوان دەکێشن : ﴿يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَـٰرَهُمْ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾ کە لە ڕوویانو پشتیان دەدەن ، وە پێیان دەڵێن : ئازاری سووتێنەر بچێژن ، یانی : سزای ئاگر ، (لَوْ) وەڵامەکەی قرتێنراوە ، واتە : ئەگەر تۆ ئەوە ببینی ، دیمەنێکی زۆر سامناك دەبینی .

ئنجا یان فریشتەکان پێیان دەڵێن ، یان خوای پەروەردگار پێیان دەفەرموێ : ﴿ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ ، ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە کە دەستەکانتان پێشیان خستوە ، واتە : بەهۆی کردەوەکانی خۆتانەوەیە ، کە ئەنجامتان داوە ، بۆیەش باسی دەستەکانیان دەکات ، چونکە زۆربەی کردەوەکانی مرۆڤ بە دەستی ئەنجام دەدرێن ، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّـٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ ، وە بێگومان خوا بەرانبەر بەندەکانی ستەمکار نیە .

وشەی (ظلاَّم) واتە : زۆر ستەمکار ، دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا ڕوونی دەکەینەوە ، کە بۆچی ئەو تەعبیرە بەکارهاتوە ؟

﴿كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ ۙ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ ، یانی : ئەی پێغەمبەر ! ئەی مسوڵمانان ! وە ئەی هەموو بەشەر ! حاڵەتو سەرەنجامی کافرەکانی ڕۆژگاری ئێوە ، وەك نەرێتی شوێنکەوتووانی فیرعەونو ئەوانەیە ، کە لە پێشیانەوە بوون ، یاخود عادەتی کافرانی ڕۆژگاری ئێوەو ، پەیڕەوانیانو ، هی ئەوانەی پێش ئەوانیش هەر یەکە ، چونکە لەسەر یەك ڕێ دەڕۆن ، عادەتیان چ بوو ؟ ﴿كَفَرُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ ، بە ئایەتەکانی خوا بێبڕوا بوون ، تەسلیمیان نەبوون ، دەشیانزانی هەقن ، ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾ ، خواش بەهۆی گوناهەکانیانەوە گرتنی ، گرتنی خواش واتە : سزای دان ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ ، بە دڵنیاییی خوا بەهێزی سزا سەختەو تۆڵەی توندە .

دوایی خوا حیکمەتی ئەو سزادانە بۆ کافران و حیکمەتی پشتیوانیی کردنی و بەرگریی کردنی لە ئیمانداران دەخاتەڕوو ، دەفەرموێ : ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمۡ يَكُ مُغَيِّرٗا نِّعۡمَةً أَنۡعَمَهَا عَلَىٰ قَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ﴾ ، ئەو سزادانەش لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە یاسایەکی خوایە ، عادەتی خوایە ، خوا چاکەیەك کە لەگەڵ کۆمەڵێکی دا کردوە ، لێیان بە خراپەو سزاو بەڵا ناگۆڕێ ، تاکو ئەوان حاڵەتی خۆیان لە چاکییەوە بۆ خراپیی نەگۆڕن .

خوا چاکە لەگەڵ ئەوانە دەکات کە چاکن ، لەبەر چاکییان ، ئنجا ئەو چاکەیەی کە لەگەڵیدا کردوون ، لێیان ناستێنێتەوەو لێیان وەرناگرێتەوەو بۆیان ناگۆڕێ بە خراپە ، تاکو ئەوان خۆیان نەگۆڕن ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ، وە بێگومان خوا بیسەری زانایە ، قسەکانی هەمووتان دەبیستێ ، وە نهێنییەکانی هەموو لایەك دەزانێ ، تەنانەت ئەوەی لە دڵو سینەکانیشتان دایە .

دووبارە خوای زاناو شارەزا ئەو یاسایەی پێشتر باسی کردبوو ، بە جۆرێکی دیکە ، باسی دەکاتەوە ، دەفەرموێ : ﴿كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ عادەتی کافرانی ڕۆژگاری ئێوە ، وەك عادەتی شوێنکەوتووان و نیزیکانی فیرعەون و ئەوانەی پێش ئەوانە ، یان : سەرەنجامی کافرانی ڕۆژگاری ئێوە ، وەك سەرەنجامی فیرعەون و نیزیکانی فیرعەون و کافرەکانی ڕۆژگاری ئەوانە ، کە چۆن بوو ؟ ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ ، ئایەتەکانی پەروەردگاریان بە درۆ دانا ، ﴿فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ﴾ ، ئێمەش بەهۆی گوناهەکانیانەوە لە نێومان بردن ، بە گشتی ، وە نیزیکان و شوێنکەوتووانی فیرعەونیش بە تایبەتی ، وە فیرعەون و پەیڕەوانی فیرعەونمان لە دەریادا خنکاند ، کە لەسەر ڕای زۆربەی توێژەرەوان ، مەبەست پێی دەریای سوورە ، ﴿وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ﴾ ، وە هەمووشیان بەرانبەر ، بە خواو خەڵك و خۆیان ، ستەمکار بوون ، وە هەر کامێك لەوانە کە ستەمکار بوونە ، خوا بەهۆی ستەمکارییەکەیانەوە سزای داون .

## ضـةند مةســةلةيةكـى طرنـط

**مەسەلەی یەکەم :**

### حەوت ڕێنمایی گەورەو گرنگ بۆ جەنگاوەرانی ڕێی خوا

خوا دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٤٥ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ٤٦ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ٤٧ ﴾ ، خوای گەورە لەم سێ ئایەتەدا حەوت ڕێنمایی گرنگ دەربارەی جەنگو جیهادو بەرەنگاربوونەوەی دوژمنان ، ئاراستەی مسوڵمانان دەکات ، سەرەتا بانگیان دەکات دەفەرموێ : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! هەر کاتێك بە کۆمەڵێکی تۆکمەو توندو تۆڵو پشت پێك بەستوو ، گەیشتن :

١ / ﴿ فَٱثۡبُتُواْ ﴾ ، چەسپاو بن ، یەکەمین شتێك کە پێویستە بۆ مرۆڤ لە کاتی جەنگو جیهادو بەرەنگاربوونەوەی دوژمندا ، ئەوەیە کە چەسپاوبێ ، مرۆڤ ئەگەر لەرزۆك بوو ، شەڕی بۆ ناکرێ ، وە زۆر کەس لە کاتی هەڵاتنی دا سەلامەت نابێو زەبری پێدەکەوێ ، بەڵام لە بەرەنگاربوونەوەو بەرگریی کردنی دا سەلامەت دەبێ ، بۆیە خوا دەفەرموێ : چەسپاوبن ، وە لە فەرمایشتێکدا ، پێغەمبەر فەرموویەتی : ﴿واعلموا أنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ﴾ }أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، برقم : (٢٨٠٤) ، وَصَحَّحَهُ شعيب الأرنؤوط{ .

واتـە : وە بـزانـن بێگومـان سـەرکـەوتن لەگـەڵ ئـارامگـرییـی دایـە ، وە هـەروەها گوتراوە : (النَّصْرُ صَبْرُ ساعَةٍ) .

واتـە : سـەرکـەوتن خۆڕاگـریـی سـەعـاتێکـە ، واتـە : تۆ سـەعـاتێك لە بـەرانبـەر دوژمنـەکـەت دا خۆڕاگـرییو دامەزراوییـت زیـاتر بـێ ، سـەردەکـەوی ، وەك کوردەواریـی خۆمـان دەڵـێن : (هـەموو کـەس پشـتی دێشـێ ، غـیـرەت داسـە دەکێشـێ) ، (داس) دروێنـەی پـێ دەکرێ ، هەموو کەس پشتی دێشـێ لـە کاتـی دروێنـەدا ، بـەڵام مرۆڤ دەبـێ تین بداتـە بـەرخـۆی ، وە فشار لە خـۆی بکات ، وە تۆ کە تینـت لەسـەرەو ترست لەبـەرەو ، ماندووبووی‌و برسییو تینـوو بـووی ، وە مەترسیی مـەرگو بریندار بوونـت هـەیە ، بـەرانبـەرەکەشـت هـەروایـە ، بـەڵام ئـەگەر تۆ لـەو خۆڕاگـرتـر بووی ، تۆ سـەرکـەوتوو دەبـی ، بۆیـە خـوا لـە ئـایەتی کۆتـایی سـووڕەتی (آل عمران)دا دەفـەرموێ : ﴿ ř Ř ô Ô Ř ŗ Ù ù Û û Ş ﴾ ، واتـە : ئـەی ئـەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە ! خـۆڕاگـربن لـە زاتـی خۆتانـدا ، وە خـۆڕاگرتربن لـە بـەرانبـەر دوژمنانتانـدا ، وە چەسـپاو نـەلـەخشـاوبن ، لـە سـەنگەران دا ، وە پارێزکـاربن ، بۆ ئـەوەی سـەرفـرازبنو لە جـەنگدا بیبنـەوەو سـەرکـەوتووبـن .

٢ / ﴿وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا﴾ ، زۆر یـادی خـوا بکـەن ، ئـایـا دەگونجـێ مرۆڤ لە کاتی جـەنگدا ، یـادی خـوا بکات ؟ بـەڵـێ ، بێگومـان ، چونکـە تـۆ بـە ڕواڵـەت لە مەرگـەوە نیزیکتـری ، لـە گـەیشـتن بـە دیـداری خـوا نیزیکتـری ، کـەواتـە : زۆر یـادی خـوا بکـە ، کـە مـەرج نیـە ئـەو یـادی خـوا کردنـە ، بـەس بـە زمـان جـووڵانـدن بـێ ، دەگونجـێ بـە دڵ بـێ ، ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ، بـەڵکـو سـەرفـرازبـن ، وشـەی (لَعَلَّ) دەڵـێ : (طَمَعٌ وَإِشْفَاق) واتـە : ئومێـد وایـە ، ڕەنگـە سـەرکـەوتووبـن ، ئـنجا هـەندێك لـە توێژەرەوانـی قورئـان گوتوویـانـە : ناگونجـێ بۆ خـوای زانـاو شـارەزا ، کـە بفـەرموێ: ڕەنگـەو لـەوانـەیەو ئومێـد وایـە ، دیـارە ئـەوە بـە نسبـەت خـوای پەروەردگـارەوە ڕاستـە ، بـەڵام خـوای کـاربـەجێ مەبـەسـتی لـە بـەکـارهێنانی (لَعَلَّ) بـۆ مرۆڤەکـانـە ، واتـە : ئێـوە ئـەگـەر

خۆڕاگربن‌و ، چەسپاو نەلەخشاوبن‌و ، زۆر یادی خوا بکەن ، ئومێدەوار بن کە سەرکەوتووبن .

٣ / ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ﴾ ، گوێڕایەڵی خوا بکەن ، بەهۆی پابەندیی بە کتێبەکەیەوە .

٤ / ﴿وَرَسُولَهُۥ﴾ ، وە فەرمانبەریی پێغەمبەرەکەشی بکەن ، ئەویش بەوە کە شوێن پێی هەڵبگرن ، وە پابەندبن بە ڕێبازەکەیەوە ، کە ڕێبازی پێغەمبەری کۆتایی جگە لە بەرجەستەکردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع ، شتێکی دیکە نیە ، دیارە سوننەتەکەیشی زیاتر بۆ ڕوونکردنەوەی قورئانە ، وە هەر شتێك کە پێویستیی بە ڕوونکردنەوەی بووبێ ، پێغەمبەری خوا تیشکی خستۆتە سەری : چ بە کردەوەکانی ، چ بە فەرمایشتەکانی ، چ بە دانپێداهێنانەکانی .

٥ / ﴿وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ﴾ ، وە لە نێوخۆتان دا ناکۆك مەبن ، زیانگەیەنەرترین شت لە کاتی جەنگدا ، بریتیە لە ناکۆکیی‌و دووبەرکیی‌و ، مشت‌ومڕو یەکدەنگ نەبوونی جەنگاوەران ، بۆیە خوا دەفەرموێ : ناکۆك مەبن ، ئەگەرنا بێهێز دەبن ، دەترسێن ، یان تێدەشکێن ، وە هێزو پێزتان نامێنێ .

٦ / ﴿وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ ، وە خۆڕاگربن ، بێگومان خوا لەگەڵ خۆڕاگران دایە ، ئنجا ئایا : خۆڕاگربن ، لەگەڵ ئەوەی کە فەرمووی : ﴿فَٱثۡبُتُواْ﴾ ، هەر یەکن ؟ نەخێر ، ﴿فَٱثۡبُتُواْ﴾ ، واتە : سەنگەر چۆڵ مەکەن ، پشت لە دوژمن مەکەن ، وە ﴿وَٱصۡبِرُوٓاْ﴾ ، واتە : خۆڕاگربن : لەسەر برسیەتی ، لەسەر تینوویەتی ، لەسەر گەرما ، لەسەر سەرما ، لەسەر ئەوە کە هۆکارەکانی مەرگتان لێ نیزیك دەکەوێتەوە ، لەسەر برینداربوون ، لەسەر هەڕەشەی دوژمن ، کەواتە : چەمکی خۆڕاگریی ، ماناکەی زۆر فراوانترە ، بەڵام وشەی ﴿فَٱثۡبُتُواْ﴾ ، ماناکەی دیاریی کراوە ، واتە : سەنگەر چۆڵ مەکەن‌و ، پشت لە دوژمن مەکەن .

کە دەفەرمویٚ : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ ، بێگومان خوا لەگەڵ خۆڕاگران دایە ، ئەوەش یاسایەکی خوایە ، کە هەر کەسێك خۆڕاگر بێ ، خوا لەگەڵی دایە ، ئەگەر کافریش بێ ، بابایەکی کافری خۆڕاگر سەردەکەوێ بەسەر بابایەکی مسوڵمانی خۆڕانەگردا ، چونکە یاسای خوا لە بەرژەوەندیی خۆڕاگران دایە ، وە هەرکەس بە پێی یاسای خوا ، ڕەفتار بکات ، ئەوا ڕەفتارەکە لە بەرژەوەندیی ئەودا دەبێ .

هەڵبەتە ئەو خۆڕاگرییەش زۆر جۆرە :

١ - خۆڕاگریی لەسەر فەرمانی بەرپرس و فەرمانده .

٢ - خۆڕاگریی لەسەر ناڕەحەتییەکانی جەنگ ؛ شەونخوونیی ، گەرما ، سەرما .

٣ - خۆڕاگریی هەندێکیان لەسەر هەندێکیان کە یەکدی تەحەممول بکەن و ، لەگەڵ یەکدی بە حەوسەڵە بن ، تەنگە پرێسکە نەبن و ، زوو هەڵنەچن ، هەمووی دەگرێتەوە .

٧ / ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ ، وە وەك ئەوانە مەبن ، کە لە ماڵ و حاڵی خۆیان دەرچوون ، لێرەدا سێ سیفەتیان لێ هەڵدەدات :

(بَطَرًا)[١] : زۆر خۆشحاڵ بوون و ، کەیف بەخۆهاتن و ، لەخۆبایی بوون و ، لەخۆ دەرچوون .

(وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ) :ڕیابازیی و خۆڕانواندن و فیزو کەشخەکردن لەبەرچاوی خەڵك .

(وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ) : خۆیان لە ڕێی خوا لایان دەدا ، وە خەڵکیشیان لە ڕێی خوا لادەدا .

---

١) بَطِرَ فلانٌ يَبْطَرُ بَطَراً : نَشِطَ وغَلا في المَرَحِ والزَّهْوِ وبَطِرَ : دَهِشَ و حارَ فيه ، وبَطَرَ النِّعمة : استَخفَّها فكفرها . المعجم الوسيط ، ص ٦١.

﴿وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ﴾ ، وە خـوا دەوردەدەری ئـەوەیە كـە ئـەنجامیـان دەدا ، وە لە سـزای خـوای دادگـەر دەربـاز نـابـن .

ئنجا لێرە دەمەوێ ئاماژە بە هەندێ قسەی زۆر جوانی (البَغَوِي) بكەم ، كە لە تەفسیرەكەی خۆیدا هێناونی ، دیارە (البَغَوِي) بە (نَاصر السنة) ناودارە ، دەڵێ :

(نَزَلَتْ فِي الْمُشْرِكِينَ حِينَ أَقْبَلُوا إِلى بَدْرٍ وَلَهُمْ بَغِيٌ وَفَخْرٌ ، فَقَالَ رَسول اللهِ : ﴿اللَّهُمَّ هَذِهِ قُرَيْشٌ قَدْ أَقْبَلَتْ بِخُيَلَائِهَا وَفَخْرِهَا ، تُحَادُّكَ وَتُكَذِّبُ رَسولَكَ ، اللَّهُمَّ فَنَصْرَكَ الَّذِي وَعَدْتَنِي﴾[1] ، قَالوا : وَلَمَّا رَأَى أَبُو سُفْيَانَ أَنَّهُ قَدْ أَحْرَزَ عِيرَهُ أَرْسَلَ إِلَى قُرَيْشٍ : إِنَّكُمْ إِنَّمَا خَرَجْتُمْ لِتَمْنَعُوا عِيرَكُمْ ، فَقَدْ نَجَّاهَا اللّهُ ، فَارْجِعُوا ، فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ : (وَاللهِ لا نَرْجِعُ حَتَّى نَرِدَ بَدْرًا ) وَكَانَ بَدْرٌ مَوْسِمَاً مِنْ مَوَاسِمِ الْعَرَبِ ، يَجْتَمِعُ لَهُمْ بِهِ سوقٌ كُلّ عَام (فَنُقِيمُ عَلَيْهِ ثَلاثَاً ، فَنَنْحَرُ الْجُزُرَ ، وَنُطْعِمُ الطَّعَامَ ، وَنَسْقِي الْخَمْرَ وَتَعْزِفُ عَلَيْنَا الْقِيانُ ، وَتَسْمَعُ بِنَا الْعَرَبُ ، فَلا يَزَالُونَ يَهَابُونَنَا أَبَدًا) فَوَافَوْهَا فَسُقُوا كُؤُوسَ الْمَنَايَا مَكَانَ الخمْرِ ، وَنَاحَتْ عَلَيْهِمُ النَّوَائِحُ ، مَكَانَ الْقِيَانِ ، فَنَهَى اللهُ عِبَادَهُ الْمُؤْمِنِينَ أَنْ يَكُونُوا مِثْلَهُمْ ، وَأَمَرَهُمْ بِإِخْلَاصِ النِّيّةِ وَالحِسْبَةِ فِي نَصْرِ دِينِهِ وَمُؤَازَرَةِ نَبِيّه )[2] .

واتـە : ئـەم ئـایەتانـە دەربـارەی هاوبـەش بۆ خـوادانـەرەكان هاتنـە خـوار ، كـاتێك كـە بـەرەو ناوچـەی بـەدر هـاتن ، بـە دەستدرێـژیی كـردنو شـانازیی بـە خۆكـردنو لـەخۆبـایی بوونـەوە ، پێغـەمبـەری خـوا ، فـەرمـووی : ئـەی خـوایە ! ئـەوە قورەیشـە ، بـە فیـزو كەشـخەو خۆڕانواندنـەوە هـات ، دژایەتیی تـۆ دەكـات ، پێغـەمبـەرەكەی تۆ بـە درۆ دەزانێ ، ئـەی خـوایە ! ئـەو یـارمـەتیی‌و سـەرخستـنـەی كـە بـەڵێنـت پێداوم ، بمدەیـە .

گوتوویانـە : كـاتێك كـە ئـەبو سوفیـان كـە تـەماشـای كـرد ئـەوە كاروانـەكـەی دەربـاز كـردوە ، نـاردی بـۆ لای قـورەیش ، گـوتی : ئێـوە بۆیـە هاتبوونـە دەر ، تاكـو

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِم ، برقم : ١٧٦٣.

٢) معالم التنزيل ، للبغوي ، ج ٣ ، ص ٣٦٥ و ٣٦٦.

بەرگریی لە کاروانەکەتان بکەن ، ئەوە خواش کاروانەکەی دەرباز کردوە ، بەلاّم ئەبو جەهل گوتی : سوێند بە خوا ، ناگەڕێینەوە تاکو نەچینە سەر سەرچاوەی بەدر ـ کە دیارە لەوکاتەدا عەرەب لەو شوێنە بازاڕێکیان ساز دەکرد لە لای بەدر ـ ئنجا حوشتران سەر دەبڕین ، وە خواردنێ دەخۆین و خواردن دەدەین بە خەلّك ، وە شەرابیش دەخۆینەوەو دەیدەین بە خەلّکیش ، وە سێ شەو سێ ڕۆژان لەوێ دەبین ، ئافرەتانی گۆرانی بێژ ئامێری گۆرانییمان بۆ لێدەدەن (ئنجا ئەگەر تەپڵ و دەفە ، زوڕنایە ، شمشاڵە هەرچی هەبووە ئەو کاتە) وە دەبێ عەرەبەکان گوێبیستی ئەم دەرچوونەی ئێمەو ئەو پاڵەوانێتییەی ئێمە ببن ، بۆئەوەی هەتا هەتایە لێمان بترسێن ، (واتە : هەم مسوڵمان و هەم غەیری مسوڵمانانیش ، کەس نەتوانێ جارێکی دی ، ڕێ بە کاروانی ئێمە بگرێ) .

ئنجا بەغەویی دەڵێ : چوون بۆ ئەو شوێنە ، بەلاّم لە جیاتی پەرداخی شەراب ، پەرداخی مردنییان پێ نۆشرا ، وە لە جیاتی ئەوەی ئافرەتانی هونەرمەندو گۆرانی بێژ گۆرانییان بۆ بڵێن و ئامێری گۆرانییان بۆ لێ بدەن ، شینگێڕ بەسەریان دا گریان ، بۆیە خوا بەندە بڕوادارەکانی خۆی قەدەغە کرد ، لەوەی کە وەك ئەوان بن ، وە فەرمانی پێکردن کە دڵی خۆیان ساغ بکەنەوە ، وە مەبەستیان پێ خوا بێ ، لە سەرخستنی دینەکەیداو لە پشت گرتنی پێغەمبەرەکەیدا .

**مەسەلەی دووەم :**

## ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی شەیگان لە حەوت بڕگەدا

خوا دەفەرموێ : ﴿ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ ۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ ۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ ﴾ ، خوا باسی هەڵوێستی شەیتان دەکات ،

چۆن خوتخوتەی بۆ سوپایەكەی قورەیش دەكاتو پاشان لە تەنگانەدا پشتیان بەردەدات ، لە حەوت بڕگەدا باسی دەكات :

١ / ﴿وَإِذۡ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾ ، وە یادبكەوە كاتێك شەیتان كردەوەكانیانی بۆ ڕازاندنەوە ، ئەو كردەوە خراپانەیان كە بریتی بوون لە : شەڕ فرۆشتن بە مسولْمانان ، مسولْمانانێكی ڕەشو ڕووت كە ویستوویانە كاروانەكەیان بگرن ، وەك قەرەبوویەك بۆ ئەو ماڵو موڵكو سامانەی كە لێیان زەوت كرا بوو ، لەلایەن كافرەكانی قورەیشەوە ، دوای ئەوەی بەجێیان هێشت ، وە بۆ ئەوەی كەلێنێكی ئەو ئاتاجیو نەدارییەی خۆیانی پێ پڕ بكەنەوە ، بەلاّم ئەوان سوپایەكی هەزار نەفەریان هێنا ، دوای ئەوەی كاروانەكەشیان دەرباز بوو ، كەچی ئەبو جەهل گوتی : نەخێر ، دەبێ بچین ، وەك چاوشكاندنێك بۆ مسولْمانانو غەیری وانیش ، سێ شەوو سێ ڕۆژان لە سەرچاوەی بەدرو ئەو ناوچەیەدا بمێنینەوە ، كە لە نیزیك مەدینەیە ، بۆ ئەوەی كە لەوێ شەراب بخۆینەوەو ، ئاواو ئاوا بكەین ، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا .

٢ / ﴿وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ ، وە پێشیگوتن : ئەمڕۆ بەو هێزو سوپایەوە كە هاتوون ، هیچ كەس بە ئێوە ناوێرێ ، واتە : چ قورەیشی بن ، وەك كۆچكەرەكان ، چ پشتیوانەكان بن ، وەك ئەوسو خەزرەجییەكان ، چ هەر كەسێكی دی ، ئاوا شەیتان كلاّوی لەسەر نانو صابوونی لە بنی پێیاندا .

٣ / ﴿وَإِنِّي جَارٞ لَّكُمۡۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلۡفِئَتَانِ﴾ ، وە پێیگوتن : من دراوسێی ئێوەم ، یاخود پەنادەری ئێوەم ، یاخود پشتیوانی ئێوەم ، بەلاّم كاتێك دوو كۆمەڵە جەنگاوەرەكە لێك وەدەركەوتنو لێك ئاشكرا بوون چی كرد ؟ لە بڕگەی چوارەم دا باسی دەكات .

٤ / ﴿نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ﴾ ، یەكەمجار كردەوەكانی بۆ جوان كردبوون ، دوایی هانیدانو گوتی : كەس پێتان ناوێرێ ، ئنجا گوتی : من هاوكارتانمو پشتیوانیتان لێدەكەم ، كەچی كە دوو كۆمەڵەكە لێك وەدەركەوتن ، ﴿نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ﴾ ،

دەڵێ : (النُّكوصُ : الإحْجامُ عَنِ الشيءِ ، وَالعَقِبُ : مُؤَخَّرُ الرِّجْلِ) ، (نكوص) بریتیە لەوە کە ئینسان پێشی بەرەو شتێك بچێ ، دوایی پێیەکانی بکشێنەوەو بەرەو دوا بگەڕێتەوە ، وە (عَقِب)یش بە پاژنە پێ دەگوترێ ، جا ئینسان کاتێك تووشی ترسێك دەبێ ، جاری وایە پێڕاناگات یەکسەر ڕوو لە پشتەوە بکات ، بەڵکو هەر یەکسەر لە شوێنی خۆی پاشەو پاش دەکشێتەوە .

٥ / ﴿وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكُمۡ﴾ ، گوتی : من لە ئێوە دوورمو حاشاتان لێدەکەم ، هیچ پەیوەندییتان بە منەوە نیە .

٦ / ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ﴾ ، گوتی : ئەوەی من دەیبینم ، ئێوە نایبینن ، مەبەستی پێ فریشتەکان بوون ، چونکە شەیتانو جندەکان فریشتە دەبینن .

٧ / ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ﴾ ، گوتی : من لە خوا دەترسم .

وە کە دەفەرموێ : ﴿وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ ، وە خوا تۆڵەو سزای توندە ، دەگونجێ ئەوە قسەی شەیتان بێ ، وە دەشگونجێ ئەو فەرمایشتی خوای پەروەردگار بێ .

ئنجا هەر لەوبارەوە با تەماشای ئەم دەقە بکەین :

(عَنِ ابْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ، قَالَ : ﴿وَإِذۡ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾، لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ ، سارَ إِبْلِيسُ بِرايَتِهِ وَجُنُودِهِ مَعَ الْمُشْرِكِين ، وَأَلْقَى فِي قُلُوبِ الْمُشْرِكِين : أَنَّ أَحَداً لَنْ يَغْلِبَكُمْ ، وَإِنِّي جارٌ لَكُمْ ، فَلَمَّا الْتَقَوا ، وَنَظَرَ الشَّيْطانُ إِلى إِمْدَادِ الملائِكة ، نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ ، قَالَ : رَجَعَ مُدْبِراً ، وَقَالَ : ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ...﴾)[1].

---

١) الطبري ، ج ١٠ ، ص ١٤ ، وابن أبي حاتم فِي تفسيره ، برقم : ٩١٥٧ ، وابن المنذر فِي تفسيره ، كما فِي الدر المنثور ، ج ٤ ، ص ٧٧ ، والبيهقي في (دلائل النبوّة) ، ج ٣ ، ص ٧٨ و٧٩ ، وَقَالَ مؤلفا (الإستيعاب) ، ج ٢ ، ص ٢٤١ ، قلنا : وَهَذَا إِسنَادٌ حَسَنٌ.

واتە : عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ ، دەربارەی ئەوە كە خوا دەفەرموێ : ﴿وَإِذۡ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ ...﴾ ، تا كۆتایی ، دەڵێ : لە ڕۆژی جەنگی بەدردا ، ئیبلیس بە ئالایەكەیەوەو بە سەربازەكانیەوە ، لەگەڵ هاوبەش بۆ خوادانەرەكان هات ، وە خستیە دڵی هاوبەش بۆ خوادانەرەكان (وەك : خوتخوتەو وەسوەسە) كە هیچ كەسێك ئەمڕۆ پێتان ناوێرێ ، وە منیش هاوكارو یارمەتیدەرو دراوسێی ئێوەم ، وە كاتێك پێك گەیشتن‌و شەیتان تەماشای پشتیوانی كردنی فریشتەكانی كرد لە مسوڵمانان ، پاشەو پاش كشایەوە ، وە گوتی : ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ﴾ ، واتە : ئەوەی من دەیبینم ئێوە ، نایبینن .

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش : ئایا ئەم هەڵوێستەی شەیتان حاڵەتێكی بەرهەستی هەبووە ، یاخود هەر خوتخوتەو دنەدانێكی مەعنەویی بووە ؟

لە ڕاستییدا هەردوو بۆچوونەكان هەن :

١) هەندێك دەڵێن : تەنیا وەسوەسە بووە ، كە ئەمە ڕای ئیبنو جەریری تەبەرییە كە لە ئیبنو عەبباس‌و حەسەنی بەسرایی یەوە هێناویەتی ، هەروەها زەمەخشەریی‌و بەیضاویی لە تەفسیرەكانی خۆیان دا ، هێناویانەو هەڵیانبژاردوە .

٢) هەندێكی دی دەڵێن : نەخێر ، ئەمە حاڵەتێكی بەرهەستی هەبووە ، كە ئەویش پشت بە گێڕانەوەیەك دەبەستێ هەر لە ئیبنو عەبباسەوە ، ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ، قَالَ : إِنَّ إِبْلِيسَ خَرَجَ مَعَ قُرَيْشٍ فِي صُورَةِ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ ، فَلَمَّا حَضَرَ الْقِتَالَ وَرَأَى الْمَلَائِكَةَ ، نَكَصَ عَلَى عَقِبَيْهِ ، وَقَالَ : إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكُمْ ، فَتَشَبَّثَ بِهِ الْحَارِثُ بْنُ هِشَامٍ فَنَخَرَ فِي وَجْهِهِ ، فَخَرَّ صَعِقاً ، فَقِيلَ لَهُ : وَيْلَكَ يَا سُرَاقَةُ ، عَلَى هَذِهِ الْحَالِ تَخْذُلُنَا وَتَبَرأُ مِنَّا ؟ فَقَالَ : ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ﴾[1] .

---

١) رواه ابن جرير ، بڕوانە : تفسير القرآن الحكيم ، ج ١٠، ص ٢٦.

واتە : عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ ، دەڵێ : ئیبلیس لەگەڵ (سوپای) قوڕەیشییەکان دەرچوو ، لەسەر شێوەی سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم (کە یەکێك بووە لە سەرۆك هۆزەکان) ، دەڵێ : کاتێك کە ئامادەی جەنگ بوون ، وە فریشتەکانی بینی ، لەسەر پاژنە پێیەکانی کشایەوە ، گوتی : ئەوەی من دەیبینم ، ئێوە نایبینن ، حارسی کوڕی هیشام داوای لێکردو دەستی لەبەر پشتێندی نا ، یان دەستی گرتو گوتی : بۆ کوێ بەجێمان دەهێڵی ؟ ئەویش بە دەمو چاویدا قیڕاندیو یەکسەر حارسی کوڕی هیشام کەوتو بێ هۆش بوو ، ئنجا پێی گوترا : (واتە : کافرەکان گوتیانە سوراقە) بێ قەزا بی ! لەسەر ئەم حاڵەش پشتمان بەردەدەیو خۆتمان لێ بە دوور دەگری ؟ ئەویش گوتی : ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن .

ئەو دوو بۆچوونە هەردووکیان هەن ، دەربارەی چۆنیەتی لێکدانەوەی ئەم ئایەتە .

وە من بە ڕاستیی ڕای یەکەمم دەچێتە دڵو عەقڵەوە ، کە هاوکارییکردنی شەیتان شتێکی مەعنەویی بووە ، خوتخوتەو دنەدان بووە بۆ کافرەکان .

وە مەبەستیش لەوە کە دەفەرموێ : ﴿فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ﴾ ، (محمد رشید رضا) دەڵێ : (المُرَادُ : أَنَّهُ كَفَّ عَنْ تَزْيينهِ لَهُمْ وَتَغْرِيرِهِ إياهُمْ ، فَخَرَجَ الكلاَمُ مَخْرَجَ التَّمْثِيلِ بتَشبيه وَسوسِتهِ بِمَا ذُكِرَ ، بحَال المُقبلِ عَلَى الشيء ، وتركِهَا ، بحَال مَنْ يَنكُصُ عَنْهُ وَيُوَلِّيه دُبُرَهُ)[1] .

واتە : مەبەست پێی ئەوەیە کە وازی لە جوانکردنی کردەوەکان بۆ کافرەکانو وازی لە فریودانیان هێنا ، جا ئەم قسەیە لەسەر شێوەی نواندنو وێچواندن ، هاتووە ، کە خوتخوتەو دنەدانی ئیبلیس بەوە چوێنراوە کە ببینرێ ، وەك ئەوە

١) تفسير القرآن الحكيم ، ج ١٠، ص ٢٦.

کە کەسێك بێ بڵێ : ئێوە ئاوا بکەنو ئاوا بچنو ، ئێوە کەس پێتان ناوێرێ ، بەڵام هەمووی خوتخوتە بووە ، وە وازهێنانیشی لە خوتخوتە بۆ کردنیشیان ، چوێنراوە بە حاڵی کەسێکەوە ، کە پشتی تێدەکاو لەسەر پاژنە پێیەکانی دەکشێتەوە .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ ۗ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾﴾ ، یاد بکەوە ! کاتێك کە دەغەڵەکانو ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدا بوو ، دەیانگوت : ئەوانە ، (مسوڵمانان) ئایینەکەیان فریوی داونو هەڵیخەڵەتاندوون ، }بە تەمای ئیسلام تێکەوتوون { بەڵام خوا دەفەرموێ : وە هەرکەسێك پشت بە خوا ببەستێو ، خوا بکاتە هەمەکارەی خۆی ، بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیە ، زاڵە مسوڵمانان سەر دەخاتو ، دوژمنیان بۆ دەشکێنێ ، مادام شایستە بن ، وە کاربەجێشە دەزانێ چییان بۆ دەکاو ، کەی بۆیان دەکاو ، چۆنیشیان بۆ ئەنجام دەدات .

ئایا مونافیقەکان لێرەدا کە باسکراون ، مەبەست پێی کێیە ؟ مونافیقەکان ئەوانەن کە : (يُظْهِرُونَ الإِسْلاَمَ وَيُبْطِنونَ الكُفْرَ) ئیسلامەتیی دەردەخەن ، وە کوفر لە دڵی خۆیاندا پەنهان دەکەن ، وە (منافق) هەر ئەو پێناسەیەی هەیە ، کە پێشتریش باسمان کردوە : کە یان لە (نفق)ەوە هاتوە ، وەك چۆن نەفەق دوو سەری هەیە ، یاخود لە (نافقاء)ەوە هاتوە ، ئەو کونەی کە جورج لە بیاباندا لێی دەدا ، مونافیقانیش لەلای مسوڵمانان دەڵێن : مسوڵمانین ، لە لای کافرانیش دەڵێن : لەگەڵ ئێوەین ، دوو ڕوویان ، بۆیە لە کوردییدا (منافق) بە دەغەڵ ، یان دووڕوو ، مانا کراوە .

وە کە دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ، واتە : ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە ، بەڵام نەخۆشییەکە هێندە ڕۆنەچووە ، ببێتە نیفاقو لە بازنەی ئیسلامو ئیمانیان بەرێتە دەر .

﴿غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمۡ﴾ ، واتە : ئەوانە دینەكەیان فریوی داون ، وە بە تەمای دینەكەیان تێكەوتوون ، كە دینەكەیان دەڵێ : خوا لە پشتتانەو ، خوا فریشتان دەنێرێ‌و ، خوا دوژمنتان بۆ تێكدەشكێنێ ، بە تەمای ئەوە هەڵخەڵەتاون ! مونافیق‌و دەغەڵەكان پێش ئەوەی جەنگی بەدر بقەومێ ، وایان دەگوت ، بەڵام دوایی دەركەوت كە نەخێر مسوڵمانان دینەكەیان هەڵینەخەڵەتاندوون ، بەڵكو ئەوەی كە خوای بەخشەر بەڵێنی پێدابوون ، لەسەر ئەرزی واقیع بۆی هێنانە دی .

ئنجا ئایا ئەو دڵ نەخۆش‌و مونافیقانە كێ بوون ؟

توێژەرەوانی قورئان زۆر قسەیان لەسەر كردوە ، هەندێك گوتوویانە : جوولەكە بوون ، هەندێك گوتوویانە : كافرەكانی مەككە بوون ، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوەی كە دێتە بەرچاو ، ئەوەیە كە هەر ئەو كافرانەی مەدینە بوون ، جا چ مونافیقەكان كە لە ڕیزی مسوڵمانانـدا بوون‌و ، خۆیان بە مسوڵمان داناوە ، چ كەسانێكی ئیمان بێهێز ، كە خوای پەروەردگار بە دڵ نەخۆش وەسفیان دەكات .

هەڵبەتە لێرەدا پێویستە ئەوە ڕوون بكەینەوە ، كە خوا دەفەرموێ : ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ ، ئایا پشت بە خوا بەستن‌و خوا كردنە وەكیلی خۆمان ، مانای وایە گوێ نەدەینە هۆكارەكان ؟ نەخێر ، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەكەوێ : ﴿عَنْ أنَسِ بْنَ مَالِكٍ قَالَ : جَاءَ رَجُلٌ إلى النَّبِيّ وَأرَادَ أنْ يَتْرِكَ نَاقَتَهُ ، وَقَالَ : أأعْقِلُهَا وَأتَوَكَّلُ ، أوْ أُطْلِقُهَا وَأتَوَكَّلُ ؟ فَقَالَ النَّبِيّ : إعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ﴾ {أخْرَجَهُ ابْنُ حِبانَ ، برقم : (٧٣١) ، والتِّرمِذِي ، برقم : (٢٦١٧) ، وَابْنُ مَاجَه ، برقم : (٤١٦٤) ، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط : حَدِيثٌ حَسَن ، وَحَسَنهُ الألباني} .

واتە : ئەنەسی كوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ویستی حوشترەكەی بەڕەڵڵا بكات (لە دەرێ) ، وە بە پێغەمبەری گوت : ئایا بیبەستمەوەو ، پشت بە خوا ببەستم ، یاخود بەرهەڵدای بكەم‌و ، پشت بە خوا ببەستم ؟ پێغەمبەر فەرمووی : بیبەستەوەو پشت بە خوا ببەستە .

کەواتە : بەستنەوە ، پێچەوانەی پشت بە خوا بەستن نیە ، بەڵکو ئەگەر پشتت بە خوا بەست ، دەبێ دڵت بە خواوە پەیوەست بێ ، بەڵام دەبێ دەستت بە هۆکارەکانەوە بێ ، پێغەمبەری خوا      وای کردوە ، کەواتە : ئەوەی کە هەندێ لە ئەهلی تەریقەتو تەصەووف بە هەڵە تێیگەیشتوونو ، پێیان وایە کە بابای پشت بە خوا بەستوو (متوكل على الله) کەسێکە کە هۆکارەکان وێل بکات ! ئەوە هەر لە بنچینەدا لە مانای (تَوَكّل) حاڵی نەبوون ، چونکە کەسێك دەستی بە هۆکارەکانەوە نەبێ ، ڕاست ناکات بڵێ : دڵی بە خواوە پەیوەستە ، چونکە ئەو خوایەی کە دڵت پێوەی پەیوەستە ، ئەو پێت دەفەرموێ : هۆکارەکان ڕەچاو بکە ، وەك پێشتریش گوتمان خوای بەرزو بێ

هاوتا دەربارەی (ذو القرنين) دەفەرموێ : ﴿ ʐ Ȧ ȧ     Ḝ Ō

ō     Ȍ ō     Ȯ ȯ ǀ     ɨ ƙK     ɨ     ʌɯNɈ ŋ

ɵ ơ ơ ʠ ƣ ﴾ الكهف ، واتە : پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (ذو القرنين) پێیان بڵێ : هەواڵی ئەوتان بۆ دەخوێنمەوە : ئێمە ئەومان دەستەڵاتدار کردبوو لە زەویدا ، وە بۆ هەموو شتێك هۆکارێکمان پێدابوو ، جا بە دوای هۆکارەکە دەکەوت .

کەواتە : پشت بە خوا بەستن ، لەگەڵ پەنا بۆ هۆکار بردن دا ، نەك هەر ناکۆك نین ، بەڵکو تەواوکەری یەکدین ، چونکە ئینسان تەنیا لایەنە مەعنەوییەکەی نیە ، هەروەك تەنیا لایەنە جەستەییەکەش نیە ، بە لایەنە جەستەییەکەی هۆکار پەیدا دەکاتو ، بە لایەنە مەعنەوییەکەشی دڵ پەیوەست دەکات بە خواوە .

**مەسەلەی چوارەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٥١﴾ ﴾ ، لێرەدا وەڵامی

(لو) قرتێنراوە ، لەبەر ئەوەی کە سیاقەکە دەیگەیەنێ ، خوا دەفەرموێ : ئەگەر تۆ فریشتەکان ببینی ، کە گیانی ئەوانەی بێبڕوان دەکێشن ، کە لە ڕوویان دەدەنو لە پشتیان دەدەن ، وە پێیان دەڵێن : بیچێژن سزای سووتێنەر ، (ئەوە دیمەنێکی سامناك دەبینی) ، بەڵام وەڵامەکەی بۆیە قرتێنراوە ، چونکە سیاقەکە بۆ خۆی دەیگەیەنێ .

کە دەفەرموێ : ﴿يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ﴾ ، لە دەمو چاویانو لە پشتیان دەدەن ، یانی : لە پێشەوە ، لە ڕوویان دەدەن ، بەهۆی ئەوەوە ، کە ڕوویان کردۆتە قەدەغەکانی خوا ، وە لە پشتیان دەدەن ، لەبەرئەوەی کە پشتیان کردۆتە فەرمانەکانی خوا ، بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکان .

یاخود کە دەفەرموێ : ﴿يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ﴾ ، واتە : لە هەموو شوێنەکانیان دەدەن .

﴿وَذُوقُواْ عَذَابَ﴾ ، دەڵێ : (ذَاقَ الطَّعَامَ : اخْتَبَرَ طَعْمَهُ ، وَذَاقَ الشيءَ : جَرَّبَهُ وَاخْتَبَرَهُ ، وَذَاقَهُ أَحَسَّهُ) .

دەگوترێ : (ذَاقَ الطَّعَامَ) واتە : خواردنەکەی تامکردو تاقی کردەوە بزانێ چۆنە ، هەروەها (ذَاقَهُ) واتە : هەستی پێکرد .

وە وشەی : ﴿ٱلۡحَرِيقِ﴾یش بە مانای ئاگر ، یان بە مانای سووتێنەر ، دێ .

ئنجا خوا دەفەرموێ : ﴿ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ﴾ ، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە دەستەکانتان پێشیان خستوە ، (یانی : ئەنجامتان داوە) ، وە بێگومان خوا ستەمکار نیە لە بەندەکانی .

بۆیەش باسی دەستەکانی کردوە ، چونکە زۆربەی کردەوەکانی مرۆڤ کە ئەنجامیان دەدات ، لە ڕێی دەستەکانیەوەیە ، ئەگەرنا کردەوە : بە چاو ، یان گوێ ، یان زار ، یان پێیەکانیش بکرێ ، کردەوەی باش هەر باشەو ، هی خراپیش هەر خراپە .

ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ﴾ ، بۆچی خوا وشەی (ظَلاّم)ی بەکارهێناوە ، ئایا خوا کەم ستەم دەکات ، تاکو بفەرموێ : زۆر ستەمکار نیم ؟ بێگومان نەخێر ، وە زانایان چەند هۆکارێکیان باس کردوون ، بۆ بەکارهێنانی ئەم وشەیە :

دەڵێن :

١ - لەبەرئەوەی ئەگەر خوا ستەمی لە بەندەکانی کردبایە ، وە ستەم کردن یەکێك بووایە لە سیفەتەکانی خوا ، دەبوو زۆری ستەم کردبایە ، چونکە سیفەتەکانی خوا هەموویان لەوپەڕی دان : ئەوپەڕی بەزەیی هەیە ، ئەوپەڕی بەخشندەیی هەیە ، ئەوپەڕی زانیاریی هەیە ، ئەوپەڕی حیکمەتی هەیە ، ئەوپەڕی دەستەڵاتی هەیە ، ئنجا ئەگەر ستەمیش یەکێك بووایە لە سیفەتەکانی خوا ، دەبوو خوا زۆری ستەم کردبایە .

٢ - بۆیە ئەو وشەیەی بەکارهێناوە ، چونکە بەندەکانی خوا زۆرن ، ئەگەر ستەمیان لێ بکات : لەو هەندێکو ، لەو هەندێکو ، لەو هەندێك ، هی هەمووان کۆبکەیەوە دەبێتە زۆر .

٣ - یان وشەی (ظلاّم) هەر بە مانای (ظالم)ە ، کە بە مانای ستەمکارە ، بەلاّم بەو وشەیە هاتوە .

ئەگەرنا خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (النساء)دا دەفەرموێ : ﴿ 2 5 5

چNj NJ lj LjLJdžDžDž ! چ ڃ p ѕ

واتە : بێگومان خوا بە قورسیی گەردێك لە سزاداندا ستەم ناکات ، بەلاّم ئەگەر چاکە بێ پاداشتی چەند بەرانبەر دەداتەوەو ، لەلایەن خۆیەوە پاداشتێکی مەزن (بە چاکەکاران) دەبەخشێ .

هەروەها لە فەرمایشتێکی قودسیی دا هاتوە ، کە پێغەمبەر لە خوای پەروەردگارەوە دەیگێڕێتەوە ، کە فەرموویەتی : ﴿يـا عِبـادِي ! إِنِّـي حَرَّمْـتُ الظُّـلْـمَ عَلَـى نَفْسِي، وَجَعَلْـتُهُ بَيْنَـكُمْ مُحَرَّمًـا ، فَلا تَظالَـمُوا﴾ }أَخْرَجَـهُ مُسْلِمٌ ،

بـرقم : (٢٥٧٧) ، وَابْـنُ حِبـانَ ، بـرقم : (٦١٩) ، وَالحَـاكِمُ ، بـرقم : (٧٦٠٦) ، وَقَـالَ : صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ عَنْ أَبِي ذَرٍّ } .

واتـە : ئـەی بـەندەکانم ! من لەسـەر خۆمم قەدەغـە کـردوە کـە سـتـەم بکـەم ، وە لە نێو ئێوەشـدا بـە قەدەغەم دانـاوە ، بۆیە سـتـەم لە یەکدی مەکەن .

**مـەسـەلەی پێنجەم** : کـە دەفـەرموێ : ﴿ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ ۙ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٥٢﴾ ﴾ ، (راغب الأصـفهاني) دەڵـێ : (الـدَّأْبُ : إِدَامَـةُ السَّيْرِ ، وَالعَـادَةُ الْمُسْتَمِرَّةُ دَائِمَـاً عَلَـى حَالَـةٍ) .

واتــە : (دَأْب) بریتیــە لــە بـەردەوامبــوون لەســەر ڕۆیشــتن ، وە هــەر نـەریتــێکی بـەردەوام کـە لەسـەر یـەك شـێوە بـڕوا ، وە ئـالـی فیـرعەونو داروودەسـتـەکەی ، وەك ئـەوانـەی پێش خۆیـان بـەردەوام لەسـەر یـەك ڕێچکە دەڕۆن .

یـاخــود سـەرەنجــامی ئـــەو کافرانـــەی ڕۆژگـــاری ئێـــوە ، وەك سـەرەنجــامی فیـرعەونو داروودەستـەی فیـرعـەونو ئـەوانـەی پێش وانیشــە .

یـاخـود شێوەی مامەڵەکـردنی خـوای کـارزان لەگەڵ کـافرەکـانی ڕۆژگـاری ئێـوەدا ، وەك مامەڵــەکردنیەتی ، لەگــەڵ نیزیکــانو دارو دەسـتــەی فیــرعەونو کـافرەکـانی پـێش وانـیش دا ، چونکـە ﴿ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ ، سـەرجەم کـافرەکـانی دیکـەی پێشـوو دەگـرێتـەوە .

لـە سـوورەتی (آل عمـران)دا بــە تۆزێـك جیـاوازییـەوە ، هـەمان ڕسـتــە هــاتوە ، دیـارە جیـاوازییەکانیش[١] لەبـەر جیـاوازیی ئــەو سیـاقانــەن کــە تێیــاندا هـاتوون ، کـە سیـاقەکـان جیـابوون ، بـابـەتـەکان جیـابوون ، تـەعبیـرەکەش جیا دەبـێ ، لـەوێ دەفـــــــــەرموێ : ﴿ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا

---

١) واتـە: ئەو جیـاوازییـانەی کە لـەو بـوارەدا ، لە تەعبیـرەکانی قورئـان دا هـەن ، بەگشتی.

فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿١١﴾ ﭼ ، واتـــــه : وەك نـەرێتـــــی دارودەستـــەی فیرعـــەونو ئـەوانـــەی پـێش وان ، ئـایەتـەکانمانیـــان بـــەدرۆ دانـا ، خـواش بـەهـۆی گوناهەکانیانـەوە گرتنـی ، وە خـوا سـزای تونـدە .

کـــە دەفـــەرموێ : ﭽكَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٥٢﴾ ﭼ ، یـــان مەبـــەست پێـــی ڕستـەکـــانی قورئـانـــە ، کـــە دەخوێنرێنـەوە ، یـان مەبـەست پێـی دیمەنـە دروستکراوەکانـە ، یـان مەبـەسـت پێـی موعجیزەکـانی پێغەمبەرانــە ، وەك لـە سـوورەتی (الذاریـات)دا دەفـەرموێ :

ﭽ Ᵽ ɋ Ɋ ơ Ơ ɵ ɳ Ɲ Ɯ ƛ ƚ ƙ Ƙ ƚ l ﭼ

ƥ Ʀ ƨ Ƨ Ʃ ƪ ƫ ﭼ ، واتـە : ئـەوانـە هـەر وابـوون ، ئـەوانـەی پێشێـش هیچ پێغەمبـەرێکیان بۆ نەهاتوە ، مەگـەر گوتوویانـە: یان جـادووگـەرە ، یان شـێتە ، ئـایا یەکدییـان ڕاسپاردوە ، بەڵکو هۆکـارەکەی ئەوەیە هەموویان یـاخیین لە خـوا ، کە یـاخین لە خـوا ، بـەو شێوەیەش مامەڵە دەکـەن لەگەڵ پێغـەمبـەرانی خـوادا .

پێغـەمبــەری خــوا لەوبــارەوە فـەرموویەتی : ﴿إِنَّ اللهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ ، فَإِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ ، بـرقم : (٤٤٠٩) ، وَمُسْلِمٌ ، بـرقم : (٢٥٨٣) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، بـرقم : (٣١١٠) ، وَقَالَ : حَسَنٌ صَحِيحٌ ، وَابْنُ مَاجَهْ ، بـرقم ٤٠١٨) ، وَالنَّسَائِيّ فِي (الكُبْرَى) بـرقم : (١١٢٤٥) ، والبـزار ، بـرقم : (٣١٨٣) ، وأبـو يعلى ، برقم : (٧٣٢٢)}.

واتـە : بێگـومان خـوا ڕسـت بۆ بـابـای سـتـەمکار درێـژ دەکـات ، هـەتا کـاتێك کـە گرتـی ، دەربـازی نـاکـاتو جـەبی نـادات .

**مەسەلـــەی شەشــــەم** : کـــە دەفـــەرموێ : ﭽذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمۡ يَكُ مُغَيِّرٗا نِّعۡمَةً أَنۡعَمَهَا عَلَىٰ قَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٥٣﴾ ﭼ ، ئـــەوەی کـە ڕابـرد ، هۆکـارەکـەی ئـەوەیە کـە خـوا چاکـەیەك کـە لەگەڵ کۆمەڵێکـدا

کردوویەتی ، بۆیان ناگۆڕێ بە بەڵاو گرفتاریی ، تاکو ئەوان خۆیان نەگۆڕن ، لە چاکەوە بۆ خراپە ، وە بێگومان خوا بیسەری زانایە ، قسەکانیان دەبیستێ ، وە نهێنییەکانی دڵو سینەشیان دەزانێ .

ئەمە دیارە یاسایەکی دیکەی خوای کاربەجێیە لە ژیانی بەشەردا ، کە خوا چاکەکەی بە بەڵاو ، نیعمەتەکەی بە نیقمەت ناگۆڕێ ، تاکو خەڵك لە چاکەوە نەگۆڕێن بۆ خراپە ، بەڵام کاتێك کە ئەوان لە چاکەوە بۆ خراپە خۆیان دەگۆڕن ، واتە : خۆیان وا لێدەکەن شایستەی سزادان بن ، خوای دادگەر ئەو کاتە سزایان دەدات ، وە بۆ خۆیان پڕ بە پێستە ، ئاوا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات ، بۆیەش دەفەرموێ : ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ، واتە : خوا هەم ڕواڵەتیان ئاگادارەو ، هەم پەنهانیان ، قسەکانیان کە دەیانکەن ، دەیانبیستێ ، وە نیازو مەبەستو خوتخوتەو خولیاکانیشیان کە لە دڵو دەروونو سینەیاندا هەن دەیانزانێ ، بۆیە بە پێی ئەوە کە هەڵدەگرنو شایستەیانە ، مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات .

هەڵبەتە ئەوە پەندێکی گەورەی لێوەردەگیرێ ، ئەویش ئەوەیە کە ئینسان دەبێ لە خۆی وریا بێ ، شایستەی سزادانی خوای دادگەری خۆی نەبێ ، بەڵکو خۆی وا لێبکات ، کە خوا هەر بە فەزڵو چاکەو بەخششی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکات ، نەك بە دادگەریی ، چونکە فەزڵو چاکەو بەخششی خوا ، ئینسانی خۆی هەیە ، ئنجا هەر کەسێکیش خوا بە فەزڵ چاکەی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا نەکرد ، بێگومان ئەو کاتە بە دادگەریی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات ، بۆیە لە دوعادا هاتوە : (خوایە ! بە دادگەریی خۆت مامەڵەمان لەگەڵدا مەکە ، بە فەزڵی خۆت مامەڵەمان لەگەڵدا بکە) .

**مەسەلەی حەوتەم** : کە دەفەرموێ : ﴿كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ ۙ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ ۚ وَكُلٌّ كَانُوا۟ ظَـٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ ، وەك عادەتی پەیڕەوانو دەستەو دایەرەی فیرعەونو ئەوانی

پێش وانیش ، واتە : مامەڵەی خوا لەگەڵ كافرەكانی ڕۆژگاری ئێوەش دا ، وەك مامەڵەیەتی لەگەڵ واندا ، یاخود عادەتو نەریتو هەڵوێستی كافرەكانی ڕۆژگاری ئێوەش ، هەروەك هی نیزیكانو دەستەو دایەرەی فیرعەونو نیزیكانی فیرعەونە ، كە چییان كرد ؟ ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَۚ وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴾ ، ئایەتەكانی پەروەردگاریانیان بە درۆ دانا ، ئێمەش بەهۆی گوناهەكانیانەوە فەوتاندمانن ، بە گشتی ، وە بە تایبەت نیزیكانی فیرعەونو دەستەو دایەرەكەیو خۆیشی ، ئەوانمان لە ئاودا خنكاند ، وە هەر كامێك لەوانە ستەمكار بوون ، واتە : بەهۆی ستەمەكەیانەوە ، سزاماندان .

دیارە ئەم ئایەتە موبارەكە لەگەڵ ئایەتەكەی پێشیّ دا كە خوا لە یەك سیاقدا هێناونی ، لە ئایەتەكەی پێشیّ دا دەفەرمویّ : ﴿كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٥٢﴾﴾ ، بەڵام لەمەیان دا دەفەرمویّ : ﴿كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَۚ وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾﴾.

ئەو دوو ئایەتە چەند جیاوازییەكیان لە نێوان دا هەن :

١) جیاوازییەكیان لە ڕستەی : ﴿كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ، و ڕستەی : ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ ، دایە .

ئنجا ﴿كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ، واتە : ئایەتەكانی خوایان بۆ هاتوون ، بەڵام بڕوایان پێنەكردن ، بەڵام : ﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ ، واتە : ئەوە هیچ كە بڕوایان پێنەكردن ، بەڵكو بە درۆشیان داناون ، درۆو دەلەسەشیان پاڵداوەتە لای ئایەتەكانی خوای دادگەر .

٢) ئنجا لەوێ فەرمووی : ﴿بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ، لێرەش دەفەرموێ : ﴿بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ ، ئەمەش مانایەکەی ئاوایە : ئەو خوایە هەرچەندە بەخێوکەرو ڕۆزیدەرو مشوورخۆریشیانە ، کەچی ئایەتەکانی نەك هەر بڕوایان پێ نەهێنان ، بەڵکو بە درۆشیان دانان .

٣) ئایەتی پێشێ فەرمووی : ﴿فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡ﴾ ، واتە : خوا بەهۆی گوناهەکانیانەوە گرتنی ، لێرەش دەفەرموێ : ﴿فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ﴾، بەهۆی گوناهەکانیانەوە ، فەوتاندمانن ، چونکە هەر کەسێك خوا بیگرێ ، واتە : خوا لێی تووڕە بووەو ، سزای داوە ، ئەو کاتەش دەفەوتێ .

٤) ئنجا لە ئایەتی پێشێ دا ، باسی سەرەنجامی ئالی فیرعەونی نەکردوە ، بەلآم لێرەدا دەفەرموێ : ﴿وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ﴾ ، بە تایبەت وابەستەو نیزیکانی فیرعەونمان خنکاند ، واتە : لە دەریای سووردا .

٥) لە ئایەتی پێشێ دا فەرمووی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ ، واتە : خوا بەهێزە ، وە تۆڵەی توندە ، بەلآم لەمەیان دا باسی ئەوەی نەکردوە ، بەلآم دەفەرموێ : ﴿وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ﴾ ، واتە : هەر کامێك لەوانە ستەمکار بوون ، دیارە بۆیە خوا هێزو تۆڵەی خۆی لەگەڵ بەکارهێناون ، چونکە ستەمکار بوون .

## حیكمەتێكی گەورەی خوا ، لە سزادانی خەڵكی خرا پەكاردا

لەم دوو ئایەتەو پێكەوە بەراودكردنیان دا ، حیكمەتێكی گەورەو گرنگمان بۆ دەردەكەوێ ، ئەویش ئەوەیە كە خوای پەروەردگار ئەو كۆمەڵگەو نەتەوانە ، كە خوای كاربەجێو دادگەر سزای داون ، بە دوو قۆناغان سزای داون :

قۆناغی یەكەم : بەوە سزای داون ، كە بەڵای بۆ ناردوونو نارەحەتی كردوونو گرفتاری كردوون ، بۆ وێنە : لە سوورەتی ئەعراف لە ئایەتەكانی (١٣٠ تا ١٣٣)دا ، خوا باسی ئالی فیرعەون دەكات ، كە سزای داون ، بە كۆمەڵێك سزا ، كە حەوتیانی باس كردوون ، دووانیان بریتی بوون لە ساڵی گرانییو كەمیی بەروبووم ، وە پێنجەكانی دیش باس دەكاتو دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣١﴾ وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾ ، واتە : وە بە دڵنیاییەوە دارو دەستەی فیرعەونمان بە ساڵانی گرانییو كەمیی بەروبووم ، گرت (سزادا) بەڵكو بیریان بكەوێتەوە (و پەند وەربگرن) .

ئنجا كاتێك خۆشییو چاكەیەكیان بۆ دەهات ، دەیانگوت : ئەوە هەر شایستەی ئێمەیە ، بەڵام كە ناخۆشییو خراپەیەكیان بەسەر دەهات ، بە نەگبەتیی مووساو ئەوانەی لەگەڵیدان ، لێكیان دەدایەوە ، بزانن ! نەگبەتییەكەیان لەلایەن خواوەیە ، وە گوتیان : ئەی مووسا ! هەر نیشانەیەكمان بۆ بێنی ،

تاکو بەهۆیەوە جادووومان لێ بکەی ، ئێمە هەر بڕوات پێ ناهێنین . ئنجا ئێمەش لافاوو کوللەو گەنە (یان کێچو ئەسپێ) ، وە بۆقو خوێنمان (وەك بەلا) بۆ ناردن ، کەچی هەر خۆیان بە زلگرتو کۆمەڵێکی تاوانبار بوون .

کەواتە : خوای کاربەجێ لە قۆناغی یەکەمدا ، حەوت جۆرە سزای بۆ ناردوون ، بەڵکو بگەڕێنەوە .

ئنجا ئایا ئەم ئایەتانە چەند بوون ؟ وە چیو چی بوون ؟ خوای پەنهانزان لە سوورەتی (النمل)دا ، بۆمان ڕوون دەکاتەوە ، دەفەرموێ : ﴿... فِي تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾﴾ ، واتە : ... }ئەی مووسا ! بچۆ بۆ لای فیرعەونو گەلەکەی{ بە نۆ بەڵگەو نیشانەوە ، بێگومان ئەوان کۆمەڵێکی لارێن .

وە لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ : ﴿ DzDZ ǰ ǯ Ǯ
ǿ Ǿ ǽǼ ǻǺ ǹ Ǹǹ Ƕǵ Ǵǳ ǲ Ǳ ﴾ ، واتە : (ئەی موحەممەد !) بێگومان نۆ نیشانەمان بە مووسادان ، کە هەموویان بەڵگە بوون لەسەر ئەوەی کە مووسا پێغەمبەری خوایە ، لەوبارەوە لە بەنی ئیسرائیل بپرسە .

ئنجا وەك دوایی لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف) دا باسمان کردوە : من لە پەیمانی کۆندا هێناومە ، ئەو موعجیزانەی کە خوا لە قورئاندا باسی کردوون ، ئێستاش لەگەڵ تۆزێك جیاوازیی دا ، لە کتێبەکانی ئەهلی کیتاب دا دەبینرێن ، لەگەڵ ئەو هەموو دەستکارییەش کە کراون ، ئێستاش با وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە : ئایا ئەو نۆ (٩) ئایەتو نیشانانە چی بوون ؟

خوای پەنهانزان لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی (١٣٠) وە (١٣٣)دا دەفەرموێ : ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾﴾ ، دوایی دەفەرموێ : ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ

﴿وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾﴾ ، ئەوە حەوت ، دوایی لە سوورەتی (النمل) لە ئایەتی (١٠)دا دەفەرموێ : ﴿وَأَلْقِ عَصَاكَ ...﴿١٠﴾﴾ ، وە گۆچانەکەت بهاوێ ، وە لە ئایەتی (١٢) دەفەرموێ : ﴿وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ فِي تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِ ﴿١٢﴾﴾ ، دەست بخە باخەڵت بە درەوشاوەیی دێتە دەرێ ، بێ ئەوەی کە نەخۆش بێ ، دیارە دەستەکەش یەکێکە لە نۆ نیشانەکان .

ئنجا بە کورتیی نۆ نیشانەکان ئەمانەن :

١/ ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَا ءَالَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِينَ﴾ ، ئالی فیرعەونمان سزادا بە ساڵانی گرانیی (سنین) ، لە زمانی عەرەبییدا وشەی (السنة) واتە : ساڵی گرانییو قاتو قڕیی ، وە (السنین) واتە : ساڵەکانی گرانییو قاتو قڕیی .

٢/ ﴿وَنَقْصٍ مِّنَ الثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ ، وە کەمیی بەرووبووم ، بۆ ئەوەی پەند وەربگرنو بگەڕێنەوە .

٣/ ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ﴾ ، تۆفانمان بۆ نارد ، واتە : ئاو هەڵدەستاو بەرز دەبۆوە ، زەوییەکانیانی هەموو دادەپۆشیین .

٤/ ﴿وَالْجَرَادَ﴾ ، وە کوللەمان ناردەسەریان .

٥/ ﴿وَالْقُمَّلَ﴾ ، وە ئەسپێمان ناردەسەریان ، هەندێکیش دەڵێن : (القُمّل) گەنەو قڕنوویە ، ئەوەی بە ڕەشەوڵاخ و وڵاخی سپییەوە دەنیشێ ، دەیمژێو نەخۆشی دەکات .

٦/ ﴿وَالضَّفَادِعَ﴾ ، وە بۆقەکانمان ناردەسەریان .

٧/ ﴿وَٱلدَّمَ﴾ ، وە خوێنمان بۆ ناردن : لووتیان دەپژا ، خوێن لە زارو دەمو گوێیان دەهاتەدەر ، وە هەندێك لە زانایان دەڵێن : ئاویان دەبوو بە خوێن ؛ واتە : قاپیان لە ئاوێ هەڵدەدا ، خوێنی سوور بوو .

٨/ گۆچانەکەی بوو .

٩/ دەستی بوو ، کە دەیخستە بن باخەڵی و دەریدەهێنا ، دەدرەوشایەوە .

کەواتە : ئەو نۆ موعجیزەو نیشانەیەی مووسای پێیانەوە ڕەوانە کرابوو ، بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی ، ئەوانە بوون .

دیارە کە قۆناغی یەکەم نەیهێناونە سەر ڕێ ، خوا لەگەڵی گواستنوونەوە بۆ قۆناغی دووەم .

قۆناغی دووەم : هەمیشە ئەم قۆناغە بریتی بووە لە فەوتێنران ، وەك خوای کارزان لە سوورەتی ئەعراف دا دەفەرمووێ : ﴿فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ١٣٦﴾ ، واتە : بۆیە ئێمەش تۆڵەمان لێ ستاندن و لە دەریادا نوقممان کردن ، بەهۆی ئەوەوە کە بە نیشانەکانی ئێمە ، بێبڕوا بوون و لێیان بێ ئاگا بوون .

دیارە کافرەکانی پێشووتریش ، واتە : پێش گەلی فیرعەونیش بە هەمان شێوە ، سەرەتا خوای میهرەبان موعجیزەی بۆ ناردوون ، یاخود گرفتاریی کردوون بە بەڵایەکەوە ، ئنجا ئەگەر گەڕابنەوە ، ئەوە خوای بەخشندە گەڕاوەتەوە سەریان ، وە ئەگەر هەر لەسەر خراپەکەشیان بەردەوام بووبن ، ئەوە خوا لەگەڵی گواستوونەوە بۆ قۆناغێکی دیکە ، کە بریتیە لە قۆناغی لەنێوبردن و فەوتاندن ، دیارە کاتی خۆی هەر کەسێك هەر پەند وەرنەگرێ و نەگەڕێتەوە سەر ڕێی ڕاست ، حیکمەتی خوا وای خواستوە ، کە سەر زەوی لەو جۆرە کەسانە پاك بکاتەوە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ .

# دەرسی هەشتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە نۆ (٩) ئایەت پێك دێ ، ئایەتەكانی : (٥٥ تا ٦٣) ، سەرەتا خوای زانا ڕایدەگەیەنێ : كە بێبڕوایان خراپترین پێڕۆن ، ئەوانەی پیشەیان پەیمان شكێنییە .

وە فەرمان بە پێغەمبەر دەكات ، كە هەر كات لە كاتی جەنگدا ، لێی هەڵكەوتن ، زەبری وایان لێبدات كە دوژمنانی دیكەشیان پێ پەرِاگەندە بكات ، پاشان پێی دەفەرموێ : كە هەر كات پەیمان شكێنیی لە كۆمەڵێك هەبوو ، بە ئاشكرا پەیمانەكەیان لەگەڵ هەڵبوەشێنێتەوە ، وە ڕایدەگەیەنێ : كە بێبڕوایان قوتار نابن .

دوایی فەرمان بە بڕواداران دەكات ، كە هەرچی لە توانایان دایە ، با لە هێزو هۆكارەكانی جەنگ بۆ دوژمنانی خواو خۆیان بە ئاشكراو پەنهانەوە ، ئامادە بكەنو ، لە سامان خەرج كردنیشدا كەمتەرخەمیی نەكەن ، چونكە خوا پاداشتیان زایە ناكات .

پاشان فەرمان بە پێغەمبەر دەكات كە هەر كات دوژمنە شەڕ فرۆشەكان ، لای ئاشتییان گرت ، ئەویش لەگەڵ ئاشتیی دا بێ‌و ، پشت بە خوا ببەستێ .

وە لە كۆتایی دا ڕایدەگەیەنێ : كە ئەگەر كافرەكان بیانەوێ لە پەنای ئاشتیی دا فێڵ بكەن ، ئەوە خوا بۆ پشتیوانیی بەسە ، كە پێغەمبەری خۆی بە یارمەتیی خۆی‌و بە بڕواداران بەهێز كردوە ، وە بە جۆرێك دڵیانی پێكەوە گرێ داون ، كە بە بەخشینی هەموو سامانی دنیا ، ئاوا پێكەوە جۆش نەدەدران .

﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٥٥ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ ٥٦ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ٥٧ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةٗ فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ ٥٨ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْۚ إِنَّهُمۡ لَا يُعۡجِزُونَ ٥٩ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ٦٠ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٦١ وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٢ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٦٣﴾.

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

}بـە دڵنیـایی خراپتـرین (ژیـانداری) پێـڕۆ ئـەوانـەن کـە کـافر بـوون ، بۆیـە بـڕوا نـاهێنن ، ﴿٥٥﴾ ئـەوانـەی پـەیمانت لەگـەڵ بـەسـتوون ، ئنجـا هـەموو جـارێ (کـە دەرفەتیـان لـێ هەڵکـەوێ) پەیمانـەکـەیان هـەڵدەوەشـێننـەوەو پارێـز ناکـەن ﴿٥٦﴾ ئنجا هـەر کـات لـە جەنگـدا ئـەو (پەیمـان شـکێن)انـەت لـێ هەڵکـەوتن (زەبـری وایـان لێبـدە) ئـەوانـەی لە پشتیانـەوەن بـەهۆیانـەوە (تـەمبـێ‌و) پـرژو بـڵاو بکـەی ، بـەڵکو بیـریان بێتـەوە (و پەنـد وەربگـرن) ﴿٥٧﴾ وە هـەر کـات مەترسیی پەیمـان شـکێنییـت لە کۆمەڵێـك هـەبوو ، بـە شـێوەیەکی یەکسـان (کـە هـەردووك لاتـان بزانـن) بۆیـان فڕێ بـدە (ئـاگاداریـان بکـەوە کە پەیمانتـان لـە نێوانـدا نـەمـاوە) ، بـە دڵنیـایی خـوا پەیمان شـکێنانی خۆشـناوێن ﴿٥٨﴾ وە با ئـەوانـەی بێبـڕوان ، وانـەزانن پێشدەکـەونـەوە (قوتـار دەبـن) بێگومان ئـەوان دەستـەوسانکـەر نین ﴿٥٩﴾ وە هـەرچی دەتوانـن لـە هێـزو لـە ئەسـپانی ڕاگیـراو ، بۆیـان ئامـادە بکـەن ، دوژمنـی خـواو دوژمنـی خۆتـانی پـێ بتـرسێنن ، وە کەسـانێکی دیکە جگە لـەوان ، کـە ئێـوە نایـانزانن‌و خـوا دەیـانزانـێ ، وە هـەر شـتێك لە ڕێی خـوادا خەرجی بکـەن ، بـە تـەواویی پاداشـتتان دەدرێتـەوە ، وە ئێـوە ستـەمتان لـێ ناکـرێ ﴿٦٠﴾ وە ئـەگـەر (دوژمنانتان) لای ئـاشـتیی یـان گـرت ، تـۆش پشـت بـە خـوا ببـەستـەو لای ئـاشـتیی بگـرە ، بێگـومان ئـەو (خـوا) بیسـەری زانـای ڕاستـەقینـەیە ﴿٦١﴾ وە ئـەگـەر بشیـانـەوێ (لە پەنـای ئـاشـتیی دا) فریـوت بـدەن ، ئـەوە خـوات بـەسـە ، هـەر ئـەو بـە یـارمەتیی خـۆی‌و بـەهـۆی بڕوادارانـەوە ، پشتگیـریی کـردووی ﴿٦٢﴾ وە (بـە جـۆرێـك) دڵیـانی پێکـەوە گـرێ داوە ، کـە هـەرچـی (مـاڵ‌و سـامان) لە زەویدایـە بـەخشیبـات ، ئـاوا دڵیـانت پێکـەوە جـۆش نـەدەدا ، بـەڵام خـوا پێکـەوەی بـەستوون ، بـە دڵنیـایی ئـەو زاڵـی کـارزانـە ﴿٦٣﴾{ .

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ٱلدَّوَآبِّ) : كۆی (دابة)یە ، (الدَّابة : يُسْتَعْمَلُ فِي كُلّ حَيْوَانٍ ، وَالدَّابة جَمْعٌ لِكُلّ شَيءٍ يَدُبُّ عَلَى الأَرْض) ،

(دابة) بەكاردەهێنرێ بۆ هەموو ژیاندارێك ، وە بۆ هەموو شتێك بەكاردێ كە لەسەر زەوی دەڕوات ، (دَبَّ) واتە : پێی بە زەوی دادا ، دەببابە بۆیە وای پێ گوتراوە ، چونكە زنجیرەكانی بە زەویدا دەكوتێ .

(يَنقُضُونَ) : واتە : هەڵدەوەشێننەوە ، (النَّقْضُ : انْتِشَارُ العَقْدِ مِنَ البِنَاءِ وَالحَبْلِ ، وَالعَقْدِ وَهُوَ ضدّ الإبرَام) .

(نقْضُ) واتە : بلاوكردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی گرێیە ، چ خانوو بێ ، چ گوریس بێ ، چ گرێدانێك بێ ، چ پەیمانێك بێ ، ئەویش پێچەوانەی (إبرام)ە ، (إبرام) واتە : گرێدان ، (نَقَضَهُ) واتە : هەڵیوەشاندەوە .

(تَثْقَفَنَّهُمْ) : (الثَّقَفُ : الحِذْقُ فِي إدْرَاكِ الشيءِ وَفِعْلِهِ) .

وشەی (ثَقَفْ) ئەوەیە كە بە لێزانیو كارامەیی ئینسان بگاتە شتێك ، یاخود شتێك ئەنجام بدات .

(فَشَرِّدْ بِهِم) : (شَرَدَ البَعِيرُ : نَدَّ ، وَشَرَّدْتُ فُلاَنَاً فِي البِلاَدِ وَشَرَّدْتُ بِهِ ، أَي : فَعَلْتُ بِهِ فِعلَةً تُشَرِّدُ غَيرَهُ أَنْ يُفعَلَ فِعْلُهُ) .

(شَرَدَ البَعِيرُ) واتە : حوشترەكە ڕۆیی ، (شَرَّدْتُ فُلاَنَاً فِي البِلاَدِ) واتە : فلان كەسم دەربەدەر كرد لە ولاتو دوورم خستەوە ، (شَرَّدْتُ بِهِ) واتە : كارێكم پێكرد ، كە غەیری وی بلاو بكات ، واتە : غەیری وی دوور بخاتەوە ، لەوەی كە هەمان ڕەفتاری ئەو ئەنجام بدات .

(فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ ) : (النَّبذُ : إِلْقَاءُ الشيءِ وَطَرْحُهُ لِقِلَّةِ الإعْتِداد بِهِ) .

(نبذ) ئەوەیە كە شتێك فڕێ بدەی ، وە بیهاوێی ، لەبەر ئەوە كە لات كەم بایەخە ، ئەو پەیمانە كە بە نسبەت ئەوانەوە بێ بایەخە ، ئەوەندە دەیشكێنن ، بۆیان فڕێ بدەوە ، وەك شتێكی بێ بایەخ .

(عَلَىٰ سَوَآءٍ ) : واتە : بە یەكسانیی ، (مَكانٌ سوىً وَسواء : وَسَط ، وَيُقَالُ : سواءً وَسِوىً وَسُوىً ، أي : يَسْتَوِي طَرَفَاهُ) .

یانی : ئەوە كە پەیمانتان لە نێواندا نەماوە هەردووك لاتان یەكسانن ، دەگوترێ : (مَكانٌ سوىً) یانی : زەوییەكی ڕاست ، یان شوێنێكی نێوەڕاست ، دەگوترێ : (سواءً وَسِوىً وَسُوىً) واتە : شتێك كە هەر دوولای وەك یەك بن ، نێوەڕاست .

(سَبَقُوٓاْ ) : (أَصْلُ السَّبقِ : التَّقَدُّمُ فِي السَّيْرِ ، ﴿ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْ ﴾ .

لا یفوتونه) وشەی (سبق) لە ڕیشەدا ئەوەیە لە ڕۆیشتنیدا كەسێك پێش بكەوێتەوە ، كە دەفەرموێ : ﴿ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْ ﴾ ، با ئەوانەی بێبڕوان ، پێیان وانەبێ پێش كەوتوونەوەو ڕۆیشتوونو ڕزگاریان بووە ، واتە : لە دەستی قوتار نابن .

(لَا يُعۡجِزُونَ ) : (أَعْجَزْتُ فُلاَنَاً وَعَجَّزْتُهُ وَعاجَزْتهُ : جَعَلْتُهُ عَاجِزَاً) .

واتە : لە زمانی عەرەبیی دا دەگوترێ : (أَعْجَزْتُ فُلاَنَاً وَعَجَّزْتُهُ وَعَاجَزْتهُ) هەر سێكیان واتە : دەستەوسانم كرد ، وام لێكرد بەرانبەرم دەستە پاچە بێ ، هیچی بەرانبەرم پێ نەكرێ ، با كافرەكان وانەزانن خوای پەروەردگار بەرانبەر ئەوان هیچی پێناكرێ .

(وَأَعِدُّواْ لَهُم ) : واتە : وە بۆیان ئامادە بكەن ، (الإِعْدَادُ : مِنَ العَدِّ كالإِسْقَاءِ مِنَ السَّقِي ، أَعَدَّهُ لَهُ : هَيَّأَهُ لَهُ ...) .

(إِعْدَادُ) لە (عَدّ)ەوە هاتوە ، (عَدّ) واتە : ژماردن ، وەك (إِسْقَاء) لە (سَقِي)ەوە هاتوە ، (سَقِي) واتە : ئاو پێدان ، ئاودان ، (أَعَدَّهُ لَهُ) واتە : بۆی ئامادە بکە .

(قُوَّةٍ) : (القُوَّةُ : ضِدُّ الضُّعْفِ) هێز پێچەوانەوەو دژی بێهێزییە .

(رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ) : (رباط) هەم بە مانای نەجوولاّنو لە شوێنی خۆ چەسپین دێ ، وە هەم بە مانای پێکەوە پەیوەست بوونیش دێ ، دەگوترێ : (رَبْطُ الفَرَسِ : شَدُّهُ بِالْمَكَانِ لِلْحِفْظِ) .

واتە : ئەسپەکەی بەستەوە بەو شوێنەوە کە پێوەی دەبەستریێتەوە ، بۆ ئەوەی کە پارێزگاریی لێ بکات ، (وَالرِّبَاطُ : اسْمٌ لِلْمَكَانِ الَّذِي يُرَابِطُ فِيهِ) وە (رباط) بەو شوێنە دەگوترێ کە کەسێك لەوێدا خۆی دا دەنووسێنێ ، یان خۆی دەپێچێ‌و دەچێتە سەنگەرەوە ، (وَالرِّبَاطُ مَصْدَرُ : رَبَطْتُ وَرَابَطْتُ ، وَالْمُرَابَطَةُ كَالْمُحَافَظَةِ) دەگوترێ : (رَبَطْتُ وَرَابَطْتُ) کە (مُرَابَطَةُ) وەك (مُحَافَظَةِ) وایە ، واتە : پارێزگاریی لێکردن‌و مانەوە لە شوێنی خۆ !

(تُرْهِبُونَ بِهِۦ) : (رَهِبَ : خَافَ ، أَرْهَبَهُ فَاسْتَرْهَبَهُ : أَخَافَهُ) .

وشەی (رَهِبَ) واتە : ترسا ، سام چووە دڵی ، (أَرْهَبَهُ فَاسْتَرْهَبَهُ) هەردووکیان واتە : ترساندی‌و وای لێکرد ، کە سامی لێ بکات .

(يُوَفَّ إِلَيْكُمْ) : واتە : بە تەواویی پاداشتتان دەدرێتەوە ، (وَفِيَ الشيءُ يَفِي وُفِياً : تَمَّ وَكَثُرَ ، وَفَّاهُ تَوْفِيَةً : أَعْطَاهُ وَافِياً) .

چونکە (وَفِيَ الشيءُ يَفِي وُفِياً) بە مانای ئەوە دێ ئەو شتە زۆرە ، وە تەواو بوو ، (وَفَّاهُ تَوْفِيَةً) ، واتە : بە تەواویی پێیدا ، وە مراندن کە خوا بە (وفاة)ی ناوهێناوە ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ... ﴿٤٢﴾ ﴾ الزمر .

واتە : خوا گیانەکان دەکێشێ لە کاتی مردنیان دا ، وە ئەوەی نەمردبێ ، لە کاتی خەوتنی دا ، دیارە لە کاتی مردن دا ڕووحی مرۆڤ بە تەواویی لە جەستەکەی دێتە دەرێ .

(جَنَحُواْ) : (جَنَحَ : مَالَ) واتە : خوار بوّوەو لار بوّوە بە لای ئاشتیی دا .

(لِلسَّلْمِ ) : (السَّلْمُ : الصُّلْحُ ، وَالسِّلْمُ : المُسالمَة) .

(سَلْم) بە مانای پێکهاتنو ئاشتیی دێ ، وە (سِلْم)یش واتە : پێکەوە ئاشت بوونو تەبا بوون .

(يَخْدَعُوكَ ) : واتە : هەڵتخەڵەتێنن ، فێڵت لێ بکەن ، (الخِدَاعُ : إنْزَالُ الغَيْرِ عَمَّا هُوَ بِصَدَدِهِ بِامْرٍ يُبْدِيهِ عَلَى خِلاَفِ مَا يُخْفِيهِ) .

(خِدَاع) بریتیە لەوە کە تۆ کەسێك بەتەمای کارێکە شتێکی پێشان بدەی ، پێچەوانەی ئەوەی ئەو مەبەستیەتی ، واتە : فریوی بدەیو کڵاوی لەسەر بنێی .

(حَسْبَكَ ٱللَّهُ) : واتە : خوا بوّ توّ بەسە ، (حَسْب : يُسْتَعْمَلُ فِي مَعْنَى الكِفَايَة ، حَسْبُنَا أي : كَافِينا) .

وشەی (حَسْب) بە مانای (كِفَايَة) بەکاردێ ، (كِفَايَة) واتە : ئەو شتە بەسە بوّ ئەوە ، یاخود ئەو شتە بەشی ئەوە دەکات ، کەواتە : (حَسْبُنَا) واتە : (كَافِينا) ، یانی : بوّ ئێمە بەسە.

(أَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ) : دڵی پێکەوە پەیوەست کردنو گرێدان ، (أَلَّفَ بَيْنَ شَيْئَيْنِ ، أي : جَمَعَ ، وَأَلَّفَ الشيء : وَصَلَ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ ، إئْتَلَفَ النَّاسُ : اجْتَمَعُوا وَتَوَافَقُوا) .

چونکە (أَلَّفَ بَيْنَ شَيْئَيْنِ) واتە : دوو شتی پێکەوە کوّکردنەوە ، (أَلَّفَ بَيْنَ شَيْئَيْنِ) واتە : هەندێك لە بەشەکانی ئەو شتەی پێکەوە پەیوەست کردن ، وە دەگوترێ : (إئْتَلَفَ النَّاس) واتە : خەڵکەکە خڕبوونەوەو پێکهاتن ، وە کەسێك کە کتێب دەنووسێ پێی دەگوترێ : (مُؤَلِّف) لەبەرئەوەی چەند ڕستەیەكو چەند ماناو مەبەستێك پێکەوە کوّدەکاتەوە .

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا لەم نۆ ئایەتانەدا ، سەرەتا باسی بێبڕوایان دەکات بە گشتی ، وە بە تایبەت پەیمان شکێنەکان ، دەفەرموێ : ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ، بێگومان خراپترین پێڕۆ لەلای خوا ، خراپترین شتێك كە لەسەر زەوی دەڕوات ، ئەوانەن كە بێبڕوان ، بۆیە بڕوا ناهێنن ، واتە : خراپترین شتن لە لای خوا ، بۆیە بڕوا ناهێنن ، خراپییەكەیان بۆتە هۆی ئەوەی بڕوا نەهێنن ، ئنجا ئەوە كە بە گشتی بێبڕوایان خراپترین زیندەوەرن ، خراپترین ژیاندارن ، دوایی زیاتر باسی دەكەین بۆچی خوای زانا بە خراپترین شت وەسفی كردوون ؟ بەڵام لە نێو بێبڕوایانیش دا ، بە تایبەت ئەوانەی كە پەیمان شكێنن ، لە هەمووان خراپترن .

دەفەرموێ : ﴿ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِى كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ﴾ ، ئەوانەی پەیمانت لەگەڵ بەستوون ، پاشان هەموو جارێ پەیمان دەشكێننو پارێزگاریی لە پەیمانەكەیان ناكەن ، كە دەفەرموێ : هەموو جارێ ، واتە : هەر جارێك كە دەرفەتیان لێ هەڵكەوت ، وە بەرژەوەندیی خۆیان لەوەدا بینیەوە ، كە پەیمانەكەیان بشكێنن ، دەیشكێنن ، ئەگەر لە بەرژەوەندیی خۆشیاندا ببینن نەیشكێنن ، نایشكێننو پێوەی پابەند دەبن ، كەواتە : ئەوانە هیچ بەهاو ڕەوشتێك نیە بیان بەستێتەوە ، جگە لە بەرژەوەندییەكانی خۆیان .

﴿فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِى ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ﴾ ، تۆش هەر كاتێك لە جەنگدا بە كارامەیی زەفەرت پێبردن ، دەرفەتت لێ بینین ، ئەوە كارێكیان پێ بكە ، ئەوانەی لە پشتیانەوەشن پرژو بڵاو بن ، واتە : ئەگەر لە جەنگدا لەگەڵیان ڕووبەڕووبوویەوە ، زەبرێكی وا لەو كافرە پەیمان شكێنانە بدە ، كە ئەوانەی لە

پشتیانەوەشنو ، هانیان دەدەن بۆ پەیمان شکێنیی ، یاخود ئەو دوژمنانەش کە لە پشتەوەنو تۆ نایانبینی ، ئەوانیش تەمبێ بکە ، ﴿لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ ، بەڵکو پەند وەربگرن ، واتە : هەم پەیمان شکێنەکان پەند وەربگرن ، جارێکی دی پەیمان شکێنیی نەکەن لەگەڵ کەس ، وە هەم ئەوانەی پشتیان پەند وەربگرنو ، بزانن کە ئەگەر بێتو ، ئەوانیش پەیمان بشکێننو غەدرو خیانەت بکەنە پیشە ، هەمان سەرەنجامو چارەنووس کە بەسەر ئەوانەی پێش وان هاتوە ، چاوەڕێی ئەوانیش دەکات ، بۆیە گوتراوە : (السَّعِيدُ مَنِ اعْتَبَرَ بِغَيْرِهِ) .

واتە : بەختەوەر ئەو کەسەیە پەند لە غەیری خۆی وەردەگرێ ، نەك شت تاکو بەسەر خۆی نەیەت پەندی لێ وەرنەگرێ .

ئنجا دەفەرموێ : ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ﴾ ، وە هەر کاتێك مەترسیی پەیمان شکێنییت لە کۆمەڵێك هەبوو ، بە یەکسانیی پەیمانەکەیان بۆ فڕێ بدەو بۆیان هەڵدە ، واتە : ئێوەو ئەوان وەك یەك بن ، یەکسان بن لەوەدا کە دەزانن پەیمانتان لە نێواندا نەماوە ، چونکە ئەهلی ئیسلام نابێ ، وەك ئەهلی کوفر لە پەنای پەیماندا ، زەبر لە دوژمنانیان بدەن ، ئەگەر ئەوان وایان کردوە ، ئێوە وا مەکەن .

لەوبارەشەوە ئەم فەرمایشتە هەیە ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ : ﴿أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ ، وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ﴾ }أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم : (٣٥٣٥) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (١٢٦٤) ، وَقَالَ : حَسَن غَرِيبٌ ، وَالحَاكِمُ برقم : (٢٢٩٦) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، وَقَالَ : صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم ، وَوَافَقَهُ الذَّهَبِي ، وَصَحَّحَهُ الألبَانِي{ .

واتە : کەسێك کە تۆی بە ئەمیندار داناوە ، سپاردەکەی بدەوە ، وە خیانەت لە کەسێك مەکە ، کە خیانەتی لە تۆ کردوە .

تۆ سپاردەت لەلای کەسێك داناوە ، ئەو بزری کردوە ، ئەگەر سبەینێ ئەویش سپاردەیەکی لە لای تۆ دانا ، تۆش ئەمانەتەکەی بزر نەکەی ، بڵێی : تۆڵە بە تۆڵە ! ئەگەر ئەو ئەمانەتی تۆی بزر کردوە ، بۆت هەیە لە ڕێی شەرعییەوە ، لە ڕێی یاساییەوە دەعوای لەسەر تۆمار بکەیو ، هەقی خۆت وەربگریەوە ، بەڵام بۆت

نیە ئەو خیانەتی كردوە ، تۆش خیانەت بكەی ، ئەگەر ئەو خیانەت لە خۆی دەوەشێنێتەوە ، تۆ نابێ لە خۆتی بوەشێنیەوە ، بەڵكو دەبێ ئەو هەقەی خۆت بە شێوەیەكی دیكە وەربگریەوە .

هەروەها لە فەرمایشتێكی دیكەیدا پێغەمبەری خوا دەفەرموێ : ﴿لا ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ﴾ }أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، برقم : (٢٨٦٧) ، وَابْنُ مَاجَهْ ، برقم : (٢٣٤١) ، وَالطَّبَرَانِيُّ ، برقم : (١١٥٧٦) عَنِ ابْنِ عَباسٍ ، وَقَالَ شُعيب الأرنؤوط : حَدِيثٌ حَسَن{ .

واتە : زیان لێدان ڕاستەوخۆ ، زیان لێدان لە بەرانبەر زیاندان دا ، لە ئیسلامدا نیە ، واتە : بۆت نیە بە بێ دەستدرێژیی لایەنی بەرانبەر ، زیانی لێبدەی ، وە بۆشت نیە لە بەرانبەر زیان لێدانی ئەودا ، زیانی لێبدەیەوە ، بەڵكو دەبێ داوای هەقی خۆت بكەیەوە ، ئنجا ئەوەش زۆر جێی سەرنجە .

خوا بە مسوڵمانان دەفەرموێ : ئەگەر خەڵك ستەمی لە ئێوەدا كرد ، شتی خراپی كرد ، خیانەتی كرد ، دەستدرێژیی كرد ، ئێوە بۆتان نیە وابكەن ، چونكە ئێوە مسوڵمانن ، وە دەبێ بە بەها بەرزەكانو ڕەوشتە بەرزەكانەوە پابەندبن ، ئەگەر ئەوان خراپەو غەدرو زوڵمو دەستدرێژیی لە خۆیان دەوەشێننەوە ، ئێوە نابێ لە خۆتانی بوەشێننەوە .

جا ئایا بۆچی ئەگەر مەترسییت هەبوو ، لە كۆمەڵێك كە پەیمان بشكێنن ، پێویستە پەیمانەكەیان وێبدەیەوە بە یەكسانیی ؟ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾ ، چونكە بێگومان خوا پەیمان شكێنانو خیانەتكەرانی خۆشناوێن ، بۆیە نابێ ئەی مسوڵمانینە ! ئێوە سیفەتێك لە خۆتان بوەشێننەوەو بێننەدی ، كە بریتیە خیانەتو دەستدرێژیی ، كە سەرەنجام ببنە بوغزێنراوی خوا ، وە خوا خۆشی نەوێن .

﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْ﴾ ، وە با ئەوانەی بێبڕوان ، پێیان وانەبێ ، تێپەڕیونو ڕەتبوون ، خوا نایانگاتێو ناتوانێ سزایان بدات ! ﴿إِنَّهُمۡ لَا يُعۡجِزُونَ﴾ ، بێگومان ئەوان خوا دەستەوسان ناكەن ، هەڵبەتە ئەوە خوێنراویشەتەوە (وَلاَ تَحْسَبَنَّ) ئەو كاتە واتە : ئێوە پێتان وانەبێ ، كە بێبڕوایەكان تێپەڕیونو قوتار

دەبنو ، خوا دەستەوسان دەکەن ، بێگومان ئەوان خوا دەستەوسان ناکەن ، هەردوو خوێندنەوەکان هاتوون .

پاشان دەفەرموێ : ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ﴾ ، وە هەرچی لە تواناتاندا هەیە لە هێز بۆیان ئامادە بکەن ، هێزی جەنگ ، هێزێك کە شەڕەکەی پێ ببەنەوە ، ئنجا بەشێك لەو هێزە دیاریی دەکات ، دەفەرموێ : ﴿وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ﴾ ، وە لە ئەسپی بەستراوە ، ئەسپێك کە ئامادە کراوەو بەستراوەتەوە هەر چاوەڕێ دەکات : یەکێك بچێتە سەر پشتیو بچێ بۆ جەنگ ، هەڵبەتە کاتی خۆی ئەسپو ، وڵاخە بەرزە ، دەوری زۆری بینیوە لە جەنگ دا، وە جەنگاوەری سەر ئەسپ ، ئەگەر ئازا بووبێ ، توانیویەتی زەبری زۆر باش لە دوژمنەکەی بدات ، هەر بۆیەش زۆر لە زانایان گوتوویانە : کاتێك کە دەستکەوتی جەنگی بەش دەکرێ ، پێویستە ئەسپ سوار سێ پشکی هەبن ، پیادەو پێڕۆ پشکێکی هەبێ ، بۆچی ؟ چونکە دیارە ئەو ئەسپەش مەسرەفو خەرجیی دەوێ ، وە جەنگاوەرێکیش کە بە سواری ئەسپ شەڕ دەکات ، مەترسیی زیاتری لەسەرە ، تیری لێ بدرێ ، چونکە زیاتر دەبێتە ئامانج ، دیارە ئێستا دەببابەو سەیارەو تەیارە شوێنی ئەسپیان گرتۆتەوە ، بەڵام ئەو کاتە ئەسپ هەبووە ، بۆیە خوا باسی ئەوی کردوە .

ئنجا بۆچی مسوڵمانان هێز ئامادە بکەن ؟ ﴿تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ﴾ ، تاکو دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن ، وە کەسانێکی دیکەش جگە لە دوژمنە بەرچاوو بەرهەستەکان ، کە ئێوە نایانزانن و نایانناسن ، بەڵام خوا دەیانزانێ و دەیانناسێ .

ئنجا دەفەرموێ : ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾ ، وە هەر شتێك لە ڕێی خوادا ببەخشن ، بە تەواویی پاداشتتان دەدرێتەوە، هیچ ستەمتان لێ ناکرێ .

ئنجا لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ ، وە ئەگەر باڵیان بۆ ئاشتیی دانەواند ، لای ئاشتییو صوڵحیان گرت ، تۆش لای ئاشتیی بگرەو پشت بە خوا ببەستە .

﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ ، بێگومان خوا بیسەری زانایە ، هەر لە بنەڕەتدا ئیسلام ئایینی ئاشتییو سەلامەتییە ، ئایینی پێکەوە ژیانە ، ئەوەی کە ئەهلی ئیسلام ناچار دەکات ، هێز ئامادە بکەن ، هەڕەشەی دوژمنانە ، ئەدی ئەگەر دوژمنان لای ئاشتییان گرت ؟ ئەوە مسوڵمانان عەوداڵی ئاشتیین ، چونکە ئیسلام بەرنامەو پەیامێکە لە جەوی ئاشتییو ئارامدا ، لە جەوی صولحو صەفادا ، باشتر قەدری دەزانرێ ، وە لە ڕاستییدا ئەوە دزە ، کە بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ ، ئەوە ناهەقە کە لە پەناو پەسیواندا ، یاخود لە جەوی بەربەرەکانێو بەرەنگاربوونەوەدا ، دەیەوێ کڕیار بۆ خۆی پەیدا بکات ، بەڵام ئیسلام هەقێکە وەك ڕۆژی ڕوون ، هەتا زیاتر دنیا ئارام بێ باشتر دەزانرێو دەناسرێ ، ﴿وَإِن يُرِيدُوٓا۟ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُ﴾ ، وە ئەگەر ویستیان هەڵتخەڵەتێنن لە پەنای ئاشتییو صولحو صەفاو ، لە پەنای پەیمان بەستن لەگەڵ ئێوەدا ، تۆ دیسان ئاشتی ڕەت مەکەوە ، خوا بۆ تۆ بەسە ، ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ، هەر خوایە تۆی بەهێز کردوە بە یارمەتیی خۆیو بەهۆی بڕوادارانەوە ، کەواتە : تۆ پشتت بە خوا قاییم بێ ، وە پاش خوای پەروەردگار ئیماندارانیش پشتیوانی تۆن ، کەواتە تۆ نیشانەی پرسیار مەخە سەر خۆت ، وە ئاشتییو صولحو صەفاو پێکەوە ژیان ڕەت مەکەوە ، هەرچەندە ئەوانیش بە تەمای فێڵ بن ، بەڵام ئەوەندەیە لە خۆت وریا بە ، چونکە وەك لە عومەری کوڕی خەتتابەوە گێڕدراوەتەوە ، گوتوویەتی : (لَسْتُ بِخِبٍّ وَلا يَخْدَعُنِي الْخَبُّ)[1] .

واتە : فێڵزان نیم ، بەڵام فێڵزانیش نامخەڵەتێنێ ، بەڵام لە خۆوە لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای بەرانبەرەکانتان مەکەن ، وە لێیان لە بیانوو مەگەڕێن ،

---

١) الخَبُّ : بالفتح والكَسْر : الخدّاع ، مختار الصحّاح ، ص ١٦٧ .

بۆ ئەوەی ئاشتییان لەگەڵ دا نەكەن ، بەڵكو عەداڵو كڕیاری ئاشتیی بن ، وە لە خۆشتان وریابن .

ئنجا خوای زاڵو بەهێز ئەوەمان بۆ دەخاتەڕوو كە چۆن پێغەمبەری خۆی بەهۆی بڕوادارانەوە بەهێز كردووەو پشتگیریی كردوە ، دەفەرموێ : ﴿وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾ ، دڵیانی پێكەوە گرێ داوە ، پێكەوە جۆش داوە ، بە شێوەیەك دڵی پێكەوە جۆش داون ، ﴿لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾ ، ئەگەر هەرچی لەسەر زەوییە ، لە ماڵوساماں خەرجت كردبایە ، پێت دابانو بەسەرتدا بەخشیبانەوە ، نەتدەتوانی ئاوا دڵیان پێكەوە پەیوەست بكەی ، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ﴾ ، بەڵام خوا پێكەوەی پەیوەست كردوونو، ئەو خۆشەویستییەی لە نێوان دا داناون ، بەهۆی ئیمانو خواپەرستییەوە ، بەهۆی ئەو هەڵسوكەوتە جوانانەوە ، كە لە نێوان خۆیان دا ئەنجامیان دەدەن ، خوا دڵی پێكەوە گرێ داون ، ﴿إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ ، وە بێگومان خوا زاڵی كاربەجێیە ، واتە : خوا خاوەن دەستەڵاتەو زاڵە ، ئەگەر ئێوە لەگەڵی ڕاست بكەن ، ئەوە خوا پشتتان دەگرێ لە بەرانبەر دوژمناندا ، وە كاربەجێشە دەزانێ چیتان بۆ دەكاو ، چۆنتان بۆ دەكاو ، كەی بۆتان دەكا ؟

# ضەند مەسەلەیەكی طرنط

**مەسەلەی یەکەم** : کە دەفەرموێ : ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٥٥﴾ ، بێگومان خراپترین پێڕۆ لە لای خوا ، ئەوانەن کە بێبڕوان ، بۆیە بڕوا ناهێنن ، ئنجا خراپترین پێڕۆ بوونیان لە لای خوا ، هۆکاری بڕوا نەهێنانیانە ، خراپترین پێڕۆن بۆیە بڕوا ناهێنن .

کەواتە : ئیمان شایستەی هەموو کەس نیە ، تەنیا شایستەی ئینسانی چاکە ، ئینسانە خراپەکان ناتوانن ئیمان بێنن ، لەبەر خراپییەکەیان ، چونکە خراپییەکەیان وایان لێدەکات کە بڕوا نەهێنن ، دیارە من لەو تەفسیرانەی لەبەردەستم دان ، نەمبینیوە ئاماژەیان بەم خاڵە کردبێ ، کە زۆر گرنگە ، ئەم (ف)ە ، (فاء الجزاء)ە ، یانی : لە ئەنجامی ئەوەدا کە خراپترینن لە لای خوا ، بۆیە بڕوا ناهێنن ، بڕوا نەهێنانەکەیان ، دەرەنجامی خراپتربوونەکەیانە ، کەواتە : ئەگەر کەسێك بیەوێ ئیمان بێنێ ، دەبێ هەوڵبدات : وردە وردە خۆی چاك بکاو بەرەو چاکیی بچێ ، ئنجا ڕێی لە ئیمان دەکەوێو ، شایستە دەبێ ئیمان بێتە نێو دڵو دەروونییەوە ، بەڵام هەتا خراپە لە دڵو عەقڵیدا هەبێ ، هەتا لەسەر خراپە بەردەوام بێ ، ئەوە لە ڕاستییدا ئیمان میوانێکە ناچێتە ماڵێکی پیسو پۆخڵەوە .

ئنجا پرسیار دەکرێ ، ئایا کافرەکان بۆچی خراپترین ژیانداری پێڕۆن ؟

وەڵامەکی ئەوەیە : لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەوان خۆیان بردۆتە ڕیزی ئاژەڵ ، وە ئاژەڵیش نین ، هەڵبەتە ئێمە پێشتریش ، لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (٢٢)ی ئەم سوورەتەدا باسمان کرد ، کە دەفەرموێ : ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ٢٢﴾ ، واتە : بێگومان خراپترین پێڕۆ (ژیاندار) لە لای خوا ئەو کەڕو لاڵانەن ، کە نافامن .

کەواتە : ئەوانەی بێبڕوان ، کەڕو لاڵو نەفامن ، چونکە : نە هێزی بیستنیان بۆ وەرگتنی هەق بەکاردێنن ، نە هێزی دەبڕینیان ، بۆ بەکارهێنانی تەعبیری هەقو ڕاست بەکاردێنن ، نە هێزی عەقڵیان بۆ تێگەیشتن لە ڕاستیی بەکاردێنن ، بەڵکو نە هێزی بینینیشیان بۆ بینینی هەق بەکاردێنن ، وەك لە ئایەتی (١٧٩)ی سوورەتی ئەعرافیشدا خوا باسیکردوە ، کە لە ئەنجامی ئەوەدا بێبڕوایەکان هەستەوەرەکانو ئەو هێزانەی کە خوا پێی داون ، بۆ ئەوەی کە مامەڵەیان پێ لەگەڵ دەوروبەریاندا بکەن ، وە خۆیانو دەوروبەرو خوای خۆیانیان پێ بناسن ، وە حیکمەتی دروست بوونی خۆیانیانیان پێ بزانن ، فەرامۆشیان کردوون ، بە ئاژەڵو بگرە خراپیریش دایناون ، وەك دەفەرموێ :

ﭽ ﮀ ﮁ ﮂ ﮃ ﮄ ﮅ ﮆ ﮇ ﮈ ﮉ ﮊ ﮋ ﮌ ﮍ ﮎ ﮏ ﮐ ﮑ ﮒ ﮓ ﮔ ﮕ ﮖ ﮗ ﮘ ﮙ ﮚ ﮛ ﮜ ﮝ ﮞ ﮟ ﮠ ﮡ ﮢ ﭼ .

واتە : وە بە دڵنیاییەوە زۆرێك لە جندو مرۆڤمان بۆ دۆزەخ دروست کردوون ، (چونکە) دڵیان هەن پێیان تێناگەن ، وە چاویان هەن پێیان نابینن ، وە گوێیان هەن پێیان نابیستن ، ئەوانە وەك ئاژەڵن ، بگرە گومڕاتریشن ، ئا ئەوانە بێ ئاگان .

ئەوانە لە ئەنجامی ئەوەدا کە بێئاگان لەوەی : کە کێ دروستی کردوون ؟ بۆچی دروستی کردوون ؟ لە کوێ هاتوون ؟ بۆچی هاتوون ؟ بۆ کوێ دەچن ؟ کەسێك کە هیچ کام لەو پرسیارانە بە شێوەیەکی ڕاستو دروستو لە ژێر ڕۆشنایی وەحی خوای بەرزو مەزن دا ، وەڵام نەداتەوە ، کە تەنیا وەحی خواش وەڵامی ڕاستو دروستی ئەو پرسیارانەی پێیە ، وەك لە بەرگی یەکەمی کتێبی : (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) بە ناوونیشانی : (الإسلام معرفة صحيحة بالخالق والخلق)[1] ، نیزیکەی پێنج سەد لاپەڕەمان بۆ ئەم بابەتە تەرخان کردوە ، لەوێدا جوان شیمان کردۆتەوە ، کە تاکە وەڵامی دروستی ئەم

---

١) لە چاپی دووەمی داو بە ناوی : (موسوعة الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) بووەتە : {الكتاب الأول : الإسلام معرفة صحيحة بالخالق والخلق} .

پرسیارە فەلسەفییانە ، تەنیا لە وەحی خوا دایە : ئەم بوونەوەرە چییە ؟ ئینسان چییە ؟ کێ دروستی کردوە ؟ بۆچی دروستی کردوە ؟ دەبێ چی بکات ؟ بۆ کوێ دەچێ ؟ ژیانی دنیا چییە ؟!

ئنجا ئەوانە لە ئەنجامی ئەوەدا ، کە وەڵامی هیچ کام لەو پرسیارانەیان ، بە شێوەیەکی ڕاستو دروست نەداوەتەوە ، مانای وایە خۆیان بردۆتە ڕیزی ئاژەڵ ، بگرە نزمتریش ، ئنجا بۆچی لە ئاژەڵ خراپترن ؟

چونکە دڕندەو ئاژەڵو چوار پێ ، خوای بە بەزەیی وای دروست کردوون کە ئەوانە دڕندەو ئاژەڵو چوار پێ بن ، بەڵام مرۆڤ خوا وای دروست کردوە ، بتوانێ مرۆڤ بێو ئاژەڵ نەبێ ، بۆیە مرۆڤێك وەك ئاژەڵ بژیو ، خۆی وەك ئاژەڵو دڕندە لێ بکات ، بێگومان لەوان خراپتر دەبێ ، هەڵبەتە ئەم ڕاستییە لە زۆر شوێنی دیکەی قورئانیش دا باسکراوە ، جگە لەو دوو شوێنەی سوورەتی **(الأنفال)** ، بۆ وێنە :

١/ لە سوورەتی (محمد)دا دەفەرموێ : **ﭽ...** Ƨ R þ P q

Ƨ Σ ǃ ţ T f ﭽ ، واتە : وە ئەوانەی بێبڕوان ، دەگوزەرێننو دەخۆن ، وەك چۆن ئاژەڵ دەگوزەرێنێو دەخوا ، وە ئاگر شوێنی حەوانەوەی ئەوانە .

کەواتە : ئەمە ڕاستییەکی زۆر گەورەو گرنگەو ، پێویستە باش سەرنجی لێبدەین ، لە ڕاستییدا ئینسان بەهۆی ئیمانەوە دەبێتە ئینسان ، وە بەهۆی ئیمانەوە ئەو ڕێزو حورمەتەی خوا لێیناوە ، لە خۆیدا دەیپارێزێ ، وە هەر بەهۆی ئیمانەوەیە ، ئینسان شایستەی ئەوە دەبێ پێی بگوترێ : جێنشینی خوا ، بەڵام لە کاتێکدا کە پشت لە خوا دەکاو لە خوا دوور دەکەوێتەوە ، دەبێتە شتێکی زۆر بێ نرخو بێ بەها .

٢ / خوای پەروەردگار دەفەرموێ : **ﭽوَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ١ وَطُورِ سِينِينَ ٢ وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ ٣ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ٤ ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ**

﴿٥﴾ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾﴾ التين ، واتە : سوێند بە هەنجیرو بە زەیتوون ، وە بە کێوی سینا ، وە سوێند بەو وڵاتە پڕ ئارامییە (واتە : مەککە) بێگومان مرۆڤمان لە باشترین شێوە پێکهاتندا دروست کردوە (لە ڕووی جەستەیی‌و لە ڕووی ڕووحییەوە) دوایی گێڕامانەوە بۆ هەرە ژێرەوەی نزمان ، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ، ئەنجام دەدەن ، (ئەوانە) پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیە .

کەواتە : بەهۆی ئیمانەوە ، مرۆڤ لە شۆڕبوونەوەو لێژبوونەوە ، بە کەندەڵانی بێ بەهایی‌و بێ نرخییدا ، دەپارێزرێ .

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾﴾ ، لەم دوو ئایەتە موبارەکەدا ، خوا بە پێغەمبەر دەفەرموێ : ئەوانەی کە پەیمانت لەگەڵ بەستوون ، دوایی هەموو جارێ کە دەرفەتیان لێ هەڵدەکەوێ ، پەیمانەکە هەڵدەوەشێننەوەو پارێز ناکەن ، ( پارێز لە خوا ناکەن ، وە پارێز لە پەیمان شکێنیی ناکەن) ، ئنجا هەر کاتێك لە جەنگدا لێت هەڵکەوتن ، ئەوە تۆ زەبرێکی وایان لێبدە ، ئەوانەی پشت وانیشی پێ بڵاو بکەی ، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن .

توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە : دەبێ مەبەست لەوانە کێ بێ ، کە هەمیشە پەیمان دەشکێنن ؟

١) هەندێك دەڵێن : جوولەکەکانن ، وەك (إبن الجوزي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ : (قَالَ المُفَسِّرُون كَانَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم قَدْ عَاهَدَ يَهُودَ قُرَيْظَةَ أَنْ لا يُحَارِبُوهُ وَلا يُعَاوِنُوا عَلَيْهِ ، فَنَقَضُوا العَهْدَ ، وَأَعَانُوا عَلَيْهِ مُشْرِكِي مَكة بِالسِّلاحِ ، ثُمَّ قَالُوا : نَسِينَا وَأَخْطَانَا ، ثُمَّ عَاهَدُوهُ الثَّانِيَةَ ، فَنَقَضُوا وَمَالَؤُوا الكُفَّارَ يَوْمَ الخَنْدَقِ ، وَكَتَبَ كَعْبُ ابْنِ الأَشْرَفِ إِلى مكة يُوَافِقُهُم عَلَى

مُخَالَفة رَسولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) [١].

واتــە : لێكـدەرەوانی ماناكـانی قورئـان گوتوویانــە : پێغەمبــەری خـوا پەیمـانی لەگـەڵ جوولەكـەكـانی بــەنی قورەیــزەدا بـەسـتبوو ، كـە نــە لـە دژی جەنــگ بكـەن ، وە نــە یارمــەتی كەسێكــیش بـدەن لــە دژی ، بــەڵام ئــەوان پەیمانیان هەڵوەشاندەوە ، وە هاوكاریی هاوبـەش بۆ خـوادانـەرەكانی مەككەیـان كـرد بــە چـەك ، دوایی گوتیـان : لـەبیـرمان چـوو ، هەڵــەمان كــرد ، دووبـارە پەیمانیان لەگەڵ بەستــەوە ، بـەڵام ئـەمجـارە لـە جـەنگی خەندەقدا ، هاوكـاریی كافرەكـانیان كردەوە ، وە كەعبـی كوڕی ئەشـرەف نامـەی نارد بۆ خەڵكی مەككە ، لەگەڵیـان دا هاوڕا بـوو ، لـە دژایـەتیی كردنـی پێغەمبـەری خـوادا .

٢) وە هـەندێـك دەڵێن : مەبـەست لەوانـە ، هاوبـەش بۆ خـوادانـەرەكانن .

٣) وە هـەندێكی دیكـە دەڵێن : مەبـەست ئـەوەیە كـە هـەر كـەسێك جوولـەكـە بـێ ، هاوبــەش بـۆ خـوادانــەر بـێ ، نـەصـرانیی بـێ ، كــە پابــەند نــەبێ بــە بـەڵـێن و پەیمانــەوە ، هەموویــان دەگرێتــەوە ، چونكـــە خـــوای پەنهانــزان دیــاریی نـەكردوون و نـاوی نـەهێنـاون .

وە من بـۆ چوونی سێیەمم پـێ ڕاستــە ، بۆیـەش هـەموو جـارێ وەك (ابـن جرير الطبـري) دەڵـێ : دەبـێ ئایەتـەكان كـە خوا بـە ڕەهایی فـەرموونی ، ئێمـەش هـەر بــە ڕەهایی بیـانهێڵینــەوە ، وە سنووردارییـان نـەكـەین ، بـێ ئــەوەی بـەڵگــەیەك ناچارمان بكات .

كـە دەفـەرموێ : ﴿وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ﴾ ، یـانی پارێـز ناكـەن لە پەیمان شكاندن ، یــاخود پارێــز ناكــەن لـە خــوا ، لــەوەدا كــە پابــەند بـن بــە بـەڵـێن و پەیمانــەوە ، چونكــە ئـەوانــە چ جوولەكــە بووبــن ، چ هاوبـــەش بـــۆ خـوادانـــەر بــووبن ، چ نـەصرانیی بووبـن ، هـەر كـەســێك بـووبن ، هـەموویان ئیددیعـای ئـەوەیـان كـردوە كـە خـوانـاس بوو ون .

---

١) زاد المسير في علم التفسير ، لإبن الجوزي ، ص ٥٥٩.

وە کە دەفەرموێ : ﴿ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ ﴾ ، (تَثْقَفَنَّهُمْ) یانی : (تَظْفَر بِهِم) ئەگەر بە کارامەییو لێزانی زەفەرت پێ بردن ، چونکە شەڕیش لێزانییو کارامەییو وردبوونەوەی دەوێ ، وە دوور بینیی دەوێ ، هەر کاتێك تۆ زەفەرت پێبردن لە جەنگدا ، ئەوانەش کە لە پشتیانەوەن ، پێیان بڵاو بکە ، واتە : زەبرێکی وایان لێبدە ، کە خەڵکی دیکەی کە لە پشتیانەوەن ، بترسنو دوور بکەونەوە .

ئنجا ئایا ئەوانەی کە لە پشتیانەوەن ، کێن ؟ دیارە یان ئەوانەن کە هانیان دەدەن ، یان ئەوانەن کە ئەوانیش وەك ئەوانەن کە دوژمنتانن ، یان ئەوانەن کە ڕاستە ئێستا بۆتان نەهاتوونە مەیدانی جەنگەوە ، بەڵام ئەوانیش لە بەرنامەیاندا هەیە دژایەتییتان بکەن .

﴿ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾ ، بەڵکو پەند وەربگرنو تەمبێ بن ، بۆ ئەوەی وەك ئەوانەی شەڕیان لەگەڵ کراوە ، پەیمان نەشکێنن .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾ ، وە هەر کات مەترسیی پەیمان شکێنییت لە کۆمەڵێك هەبوو ، بە شێوەیەکی یەکسان کە هەردووك لاتان بزانن ، بۆیان فڕێ بدە ، ئاگاداریان بکەوە ، کە پەیمانتان لە نێواندا نەماوە ، بێگومان خوا پەیمان شکێنانی خۆشناوێن .

ئەم ئایەتە لە چەند بڕگەیەك دا شیدەکەینەوە :

١) کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ ﴾ ، هەندێك گوتوویانە : (وَإِمَّا تَعْلَمَنَّ) واتە : هەر کاتێك زانیت ، وە هەندێك گوتوویانە : (وَإِمَّا تَتَوَقَّع مِنْهُمْ خِيانة) واتە : ئەگەر پێت وابوو .

بەڵام بە دڵنیایی لێرەدا مەبەست ئەوەیە : دەبێ بەڵگەی وا بە دەستەوە هەبێ ، کە لایەنی بەرانبەر بە کردەوە خەریکە پەیمان دەشکێنێ ، یاخود

خەریکە پەیمانەکە بشکێنێ ، ئنجا بۆت هەیە پەیمانەکەی وێ بدەیەوە ، نەك بە بڕو بیانوو گرتن .

بۆیە هەندێك لە زانایان وشەی : ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ﴾یان بە (وإمّا تعلَمَنَّ) لێکداوەتەوە .

گرنگ ئەوەیە دەبێ لە هەموو حاڵەتەکان دا ، بەڵگە بە دەستەوە هەبێ .

٢) ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ﴾ ، (النبذ : إلْقَاء الشيء وَطَرْحُهُ لِقِلّة الإعْتِدَاد بِهِ) .

(نَبْذ) بریتیە لەوە کە تۆ شتێك فڕێ بدەی ، وە بیهاوێی ، لەبەر ئەوەی کە بە کەم بایەخ تەماشای دەکەی‌و بەهای لە لات نیە .

٣) کە دەفەرموێ : ﴿عَلَىٰ سَوَآءٍ﴾ ، واتە : یەکسان بێ بۆ تۆو بۆ بەرانبەرەکەت ، کە ئەو پەیمانەتان لە نێواندا نەماوە ، لەوبارەوە ئەم شوێنەوارە گێڕدراوەتەوە :

﴿عَنْ سُلَيْم بْنِ عَامِرٍ قَالَ كَانَ مُعَاوِيَةُ يَسِيرُ بِأَرْضِ الرُّومِ وَكَانَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ أَمَدٌ ، فَأَرَادَ أَنْ يَدْنُوَ مِنْهُمْ ، فَإِذَا انْقَضَى الأَمَدُ ، غَزَاهُمْ ، فَإِذَا شَيْخٌ عَلَى دَابةٍ يَقُولُ : اللهُ أَكْبَرُ ، اللهُ أَكْبَرُ ، وَفَاءٌ ، لا غَدْرٌ ، إِنَّ رَسولَ اللَّهِ ، قَالَ : مَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَوْمٍ عَهْدٌ ، فَلا يَحِلَّنَّ عُقْدَةً ، وَلا يَشُدَّهَا ، حَتَّى يَنْقَضِيَ أَمَدُهَا ، أَوْ يَنْبِذَ إِلَيْهِمْ عَلَى سواءٍ ، فَبَلَغَ ذَلِكَ مُعَاوِيَةَ فَرَجَعَ ، وَإِذَا الشَّيْخُ عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ﴾ }أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ ، بِرقم : (١٧٠٥٦) ، وَأَبُو دَاوُدَ ، بِرقم : (٢٧٥٩) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، بِرقم : (١٥٨٠) وَقَالَ : حَسَنٌ صَحِيح ، وَالبَيْهَقِي فِي (شعب الإيمان) : برقم : (٤٣٥٩){ .

واتە : سولەیمی کوڕی عامیر دەڵێ : موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بەرەو سەرزەمینی ڕۆم ڕۆیشت ، پەیمانێکی ماوەدار لە نێوانیاندا هەبوو ، ویستی لێیان نیزیك بکەوێتەوە ، هەر کاتێك کاتەکەی تەواو بوو ، یەکسەر دەرفەتیان لێ ببینێ‌و زەبریان لێ بدات ، لەوکاتەدا پیاوێکی بەتەمەن بە سواری وڵاخێکەوە بەوێ داهات ، دەیگوت : (اللّهُ أَكْبَرُ ، اللّهُ أَكْبَرُ) خوا گەورەترە ، خوا گەورەترە ،

پـەیمان دەبـێ پابەنـدیی پێـوە بكـرێو نـابی بشـكێنرێ ، پێغەمبـەری خـوا فـەرموویـەتی : هـەر كـەسێك لە نێوان ئـەوو كۆمەڵێكدا پەیمـان هـەبـێ ، با ئـەو پەیمانـە هـەڵنـەوەشێنێتـەوەو پەیمانێكی دی نـەبـەستێ ، تاكـو ئـەو كاتـە تـەواو دەبێ ، یـاخود ئاگاداریان نەكاتەوە : كە ئەوە پەیمانمـان لە نێواندا نـەماوە ، ئـەوە قسـەیەش بـە موعـاویە گـەیشت ، ئـەویش گەڕایـەوە (زانـی دروسـت نیـە) ، ئنجـا ئەو پیـاوە (عَمْرُو بْنُ عَبَسَة) بوو كـە یەكێكە لـە هـاوەڵان خـوا لـێیان ڕازی بـێ .

كـەواتـە : دەبێ ئـەو پەیمانـە كـە هـەیە لە نێوانـدا پابـەندی پێـوە بكـرێ ، یـان ئـــەگەر زانیــت پابـــەندیی پێــوە نـــەكراوە ، دەبـــێ لایـــەنی بـەرانبـــەر ئـاگـــادار بكرێتـــەوە ، بـــە یەكســـانیی هـــەردوولا لێـــی ئاگـاداربن ، ئنجـا بـۆت هـــەیە كــە هـەڵسوكـەوتێكی جـەنگیـی لـە دژی ئـەو بـەرانبـەرەدا بكـەی .

٤) كـە دەفـەرموێ : ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ ۝٥٨﴾ بێگومان خـوا پەیـمانشـكێنـانی خۆشـــــناوێن ، واتـــە : ئێـــوەش وریـابـــن ! بەهـــۆی بـــێ بەڵێـنیـــیـو پەیـــمان شـكێنییـــەوە ، خۆتـــان نەكـەنــە بوغـزێنـــراوی خـــوا ، چونكـــە لـــە تـــەرازووی دادگەریـی ڕەهـای خـوادا ، خـاتـرگرتـنو بەمـلاولادا داشـــكاندن بوونـی نیـە .

**مەســـەلەی چـوارەم** : كـــە دەفـــەرموێ : ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَبَقُوا ۚ إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ ۝٥٩﴾ ، وشـەی : ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ﴾ ، بـە (وَلا تَحْسَبَنَّ)ش خوێنراوەتـەوە ، واتـە : ئەوانەی بێبـڕوان ، با پێیان وانەبێ كە تێپەڕیون ، بێگومان ئەوان دەستەوسان ناكـەن ، كـێ دەستـەوسـان ناكـەن ؟ خـوا دەستـەوسـان ناكـەن ، یـاخود دەگونجـێ مەبـەست ئـەوەبێ كە : مسوڵمانان دەستـەوسان ناكەنو دەربازو، قوتار نابـن .

هـەروەها كـە خوێنراویشتـەوە : (وَلا تَحْسَبَنَّ) ، واتـە : ئێـوە پێتـان وا نـەبێ ، كـە ئـەوانـەی بێبـڕوان ، تێپەڕیونو پـێش دەكەونـەوەو ڕەت دەبـنو ناگیـرێن لـە لایـەن خـوای بالادەستـەوە ، یـاخود لەلایـەن مسوڵمانانـەوە زەبریـان لـێ نادرێو، زەفـەریـان پـێ نابـردرێ .

هەڵبـەتە ئـەوەش یاساو سوننـەتێكی خوایە ، كە ئـەهلی كوفر لـە دەستـەڵاتـی خـوا دەربـاز نـابن ، هـەم لە دنیـادا ئـەگـەر ئـەهلـی ئیمـان هـەبـن ، خـوا بـە

دەستی ئەوان سزایان دەدات ، وە ئەوەی کە لە دنیاشدا نەگیرێ ، بە تەئکید لە دوارِۆژدا خوای دادگەر لە سزای پڕ بە پێستی دەداتو هەر چۆنێك بێ دەربازیان نابێ لە خوای زاڵی پایەدار .

بۆیە دەبێ لێرەدا باسی دوارِۆژیش بکرێ ، چونکە جاری وایە ئەهلی کوفر دژیەتیی ئیسلامو مسوڵمانانیش دەکەن ، بەلاَم مسوڵمانان ئەو هێزو پێزو دەستەلاَتەیان نیە کە خوای زاڵو توانا بەدەستی ئەوان سزایان بدات ، مەبەست ئەوەیە کە ئەوەی لە دنیا وەك بەرزەکی بانان بۆی دەربچێ ، بێگومان لە دوارِۆژدا دەربازو سەرفراز نابێ .

ئەمەش پەیامێكو نامەیەکی ئاراستەوخۆیە بۆ ئەهلی کوفر ، کە پابەندبن بە پەیمانەکانتانەوەو مەیانشکێنن ، چونکە ئەوەی کە پەیمان شکێنیی بکات ، دووچاری لێپرسینەوەو سزادان دەبێ ، وە دەربازیش نابێ لە چنگ خواو سەربازانی خوا ، کە مسوڵمانانی جەنگاوەرن .

**مەسەلەی پێنجەم** : کە دەفەرموێ : ﴿وَأَعِدُّوا[1] لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ۝٦٠﴾ .

## شیکردنەوەی ئایەتی ( ٦٠ ) لە حەوت بڕگەدا

١ / ﴿وَأَعِدُّوا لَهُم﴾ بۆیان سازو ئامادە بکەن ، بۆ کێ خۆیان ئامادە بکەن ؟ بە پێی سیاقی ئایەتەکان دیارە ، واتە : بۆ ئەهلی کوفر ، ئەهلی کوفرێك کە سەنگەر لە مسوڵمانان دەگرنو دژایەتییان دەکەن ، ئەگەر نا :

١) کافرێك لە ماڵی خۆی دانیشتوە .

٢) یان کافرێك پەیمانی لەگەڵ مسوڵمانان دا هەیەو پێیەوە پابەندە .

---

١) مختار الصحّاح ، ص ٤١٦ ، (أعدَّهُ لأمر كذا : هَيّأَهُ له ، و الإستعداد للأمر : التهيُّؤُ لَه).

٣) یان کافرێك بڕیاری تەبایی‌و ئاشتیی داوە لەگەڵ مسوڵمانان دا .

٤) یاخود بڕیاریشی نەداوە ، بەڵام بێلایەنەو وازی لە مسوڵمانان هێناوەو ، مسوڵمانانیش لێی گەڕاون .

ئەوە بێگومان ئەو خۆ ئامادەکردنە بۆ ئەوانە نیە ، بۆچی ؟ چونکە خوا دەفەرموێ : ﴿

ی　ی ﴾ الحج ، واتە : ئەوانەی لە دژتان دەجەنگن ، لە ڕێی خوادا لە دژیان بجەنگن ، بەڵام دەستدرێژیی مەکەن ، بێگومان خوا دەستدرێژکارانی خۆشناوێن .

٢ / کە دەفەرموێ : ﴿مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ﴾ ، واتە : ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز ، هێز یانی چی ؟ وشەی هێز (قوة) لێرەدا هەموو جۆرەکانی هێز دەگرێتەوە ، کەواتە : ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا بەشێك لە هێز ، یان کاریگەرترین جۆری هێز لە جەنگدا ، پێشانی ئێمە دەدات ، نەك بیەوێ بەو جۆرە پێناسەی هێزمان بۆ بکات ، کە ئایەتەکە مەبەستی بووە : دەقی فەرموودەکە ئاوایە :

﴿عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ يَقُولُ : سَمِعْتُ رَسولَ اللَّهِ　وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ : (وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ : أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، برقم : (١٧٤٦٨) ، وَمُسْلِمٌ ، برقم : (١٩١٧) ، وَأَبُو دَاوُدَ ، برقم : (٢٥١٤) ، وَابْنُ مَاجَهْ ، برقم : (٢٨١٣) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (٣٠٨٣)} .

واتە : عوقبەی کوڕی عامیر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ : گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ، لەسەر مینبەر دەیفەرموو : ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ﴾ ، ئاگاداربن ! هێز هاویشتنە ، ئاگاداربن ! هێز هاویشتنە ، ئاگاداربن ! هێز هاویشتنە .

هەر شتێك بهاویشترێ بۆ دوژمن‌و پێیانەوە بنرێ ، جا ئەوە هەر لە دەمانچەو تفەنگەوە ، هەتا بیەکەیسی‌و دۆشکەو ، هەموو ئەو هاوەن‌و تۆپو سارۆخە قورسانە ، دەگرێتەوە کە قارە برن ، وە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر دەیەوێ بۆمان باس بکات کە کاریگەرترین هێز بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن ، بریتیە لەوەی کە پێیانەوە دەنرێ‌و ، لە دوورەوە بەرەو روویان دەتەقێنرێ ، ئنجا بە فرۆکە بێ ، بە دەبابە بێ ، بە دەست بێ ، چەکی ورد بێ ، چەکی درشت بێ ، هەر شتێك بێ .

وە ئەمە وەك ئەو فەرموودەیە وایە ، کە دەفەرموێ :

﴿الْحَجُّ عَرَفَةُ﴾ }أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، برقم : (١٨٧٩٦) ، وَأَبُو دَاوُدَ ، برقم : (١٩٤٩) ، وَالتِّرمِذِيُّ ، برقم : (٨٨٩) ، وَالنَّسائِيُّ ، برقم : (٣٠٤٤) ، وَابْنُ مَاجَه ، برقم : (٣٠١٥) ، وَالحَاكِمُ ، برقم : (٣١٠٠) وَقَالَ : صحيح{ .

واتە : حەج کردن بریتیە لە عەرەفە ، واتە : راوەستان لە کێوی عەرەفە ، واتە : یەکێك لە پایە سەرەکییەکانی حەج ، راوەستانە لەسەر کێوی عەرەفە ، ئەگەرنا نە حەج کورت هەڵهاتوە لە وەستان لەسەر کێوی عەرەفەدا ، نە هێزیش لەوەدا کورت هەڵهاتوە ، کە بە دوژمنەوە دەنرێ‌و بەرەو روویان دەتەقێنرێ ، بەڵکو هێز (قوة) هەموو جۆرەکانی هێز دەگرێتەوە : هێزی سامان دەگرێتەوە ، هێزی لۆجیستی دەگرێتەوە ، هێزی بەشەریی دەگرێتەوە ، هێزی چەك‌و تەقەمەنیی دەگرێتەوە ، هێزی لێزانیی‌و کارامەیی‌و تاکتیکی جەنگ دەگرێتەوە ، هەموو جۆرەکانی هێز دەگرێتەوە .

٣ / کە دەفەرموێ : ﴿وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ﴾ ، واتە : لە ئەسپانی راگیراوو ئامادەکراو ، بۆ ئەوەی سوار چاك‌و جەنگاوەر ، یەکسەر سواری سەر پشتی بێ‌و بڕواتو ، بەرەو دوژمن هێرش بەرێ ، دەشگونجێ مەبەست لە (رِّبَاطِ) ئەو شوێنە بێ کە ئەسپی لێ دەبەسترێتەوە ، واتە : ئەسپانێك کە راگیراون لە تەویلە (رباط)دا ، هەروەك (رباط) بەو ئەسپانەش دەگوترێ ، کە بەستراونەوە (الخَيل المَربُوطَة) .

کە دیارە لەم ڕۆژگارەدا سەیارەو تەیارەو دەببابەو تانكو هەمەرو هەموو ئەو شتانەی کە ڕادەگیرێن بۆ گواستنەوەی نەفەرو ، وە مەدفەعو دۆشکەو چەکیان لەسەر دادەنرێ ، دەگرێتەوە ، بەڵکو فرۆکەو کەشتییو غەواصەی جەنگییش ، دەگرێتەوە .

زانایان دەڵێن : ئەو شتانەی خوای کارزان وەك ئامراز باسیان دەکات ، بە پێی گۆڕانی چاخو ئامرازەکان ، دەبێ ئەو ئامرازانەش بگۆڕێن ، کەواتە : ئەگەر کاتی خۆی ئەسپ بەکارهاتوە ، ئێستا سەیارەو کەشتی فرۆکەو غەواصەو دەببابەو تانك ، بەکاردێن .

٤ / بۆچی هێز ئامادە دەکرێ بۆ دوژمنان ؟ ئایا بۆ ئەوەی لەنێو ببرێنو لە کۆڵ بکرێنەوە ؟ یا بۆ ئەوەی ستەمیان لێ بکرێ ؟!

بێگومان نەخێر ، بەڵکو وەك خوا دەفەرموێ : ﴿وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡ﴾ ، تاکو بەو هێزە دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان بترسێنن ، وە کەسانێکیش جگە لەوان ، کە خوا دەیانزانێو ئێوە نایانزانن .

هەمیشە ئەوانەی کە دوژمنایەتیی ئەهلی ئیسلام دەکەن ، هەندێکیان ئاشکرانو ، هەندێکیان پەنهانن ، ئەوە لە لایەك ، دوایی کە دەفەرموێ :

(تُرۡهِبُونَ بِهِۦ) یانی : (تُخيفون)[1] ، واتە : دەترسێنن ، دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ دەترسێنن ، نەیفەرمووە ، دوژمنیان پێ لە نێو ببەن (تبیدون بە عدوّکم)، لە ڕاستییدا ئیسلام بۆیە هێز کۆناکاتەوە خەڵك قەلاچۆ بکات ، چونکە بە پێی یاسای خوا ، دەبێ لەسەر ئەم زەوییە ، کافرو مسوڵمان هەبن ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ ţ ƭ ƫ ť ɬ ﻶ ﻵ ٤﴾ التغابن ، واتە : خوا ئێوەی دروست کردوە ، هەتانە کافرەو

---

١) رَهَبَ : خافَ ... وأرْهَبَهُ واسترهَبَهُ : أخافَهُ، مختار الصحّاح ، ص ٢٥٩.

هەتانە بڕاوادارە ، ویستی خوا وای خواستوە کە کافرو مسوڵمان هەبن لەسەر ئەم زەوییە ، کەواتە : هیچ کاتێك مسوڵمانان هێز بۆ ئەوە پەیدا ناکەن ، کە هەموو کافرانی پێ لە بەین بەرن ، چونکە یاساو ویستو حیکمەتی خوا وای خواستوە ، کە دنیا وێڕای مسوڵمانان کافریشی تێدا هەبن .

ئێستاش لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا ، کاتی خۆی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو ، وە ئەمەریکا ، واتە : بلووکی ڕۆژهەڵاتو بلووکی ڕۆژئاوا ، هێزی نێوکیی‌و هێزێکی زۆریان بۆ یەکدی ئامادە کردبوو ، بەڵام ئەو هێزەشیان دژی یەکدی بەکارنەهێنا ، وە جوولەکە چەند ساڵە هێزی نێوکیی هەیە ، بەڵام بەکاری نەهێناوە ، هەروەها پاکستان‌و هیندستان‌و زۆر لە زلهێزەکان ، هێزی نێوکییان هەیە ، بەڵام تاکو ئێستا بەکاریان نەهێناوە ، تەنیا ئەمریکا لە شەڕی جیهانیی دووەمدا ، لە دژی دوو شاری یابانیی هێزی نێوکیی بەکارهێنا ، ئەوانیش هیرۆشیماو ناکازاکیی بوون ، کە نیزیکەی چارەگە ملیۆنێك خەڵکی لێ کوشتن .

کەواتە : ئەگەر مسوڵمانانیش هەرجۆرە هێزێکیان هەبێ ، بە چەکی نێوکیی (القوة النَّووية)یشەوە ، تاکو دوژمن تەماعیان تێنەکاتو بە نێچیرێکی تووك نەرمو بێ دڕك نەهێنە بەرچاوی ، شتێکی باشە ، مادام دەبێتە هۆی چاوترساندنی دوژمن ، بەو پێیەی کە ئێستا ئەگەر دەوڵەتێك هێزی نێوکیی نەبێ ، لە بەرانبەر دەوڵەتێك دا کە هێزی نێوکیی هەیە ، بە بێهێز دادەنرێ ، وە ڕەنگە دەوڵەتەکەی بەرانبەری چاوی لەوە بێ ، ستەمی لێ بکات ، زەختو فشاری لێ بکات .

کەواتە : مسوڵمانان نەك هەر دروستە ، بەڵکو پێویستە کە لەو جۆرە چەکەیان هەبێ ، وە کە هەشیان بوو ، مانای وانیە بەکاری بێنن ، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ : دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن ، وە لە ڕاستییدا ئەوەی لەم دنیایەدا ، توانای بەرگریی کردنی لە خۆی نەبێ ، ستەمی لێ دەکرێ ، چونکە حەیفی یاسای دەریا لە گۆڕێ دایە : ماسی گەورە ماسی گچکە دەخوات ، وە یاسای دارستان لە گۆڕێ دایە : دڕندەکان نێچیرە تووك نەرمەکان دەخۆن !

بۆیە ئەو مسوڵمانانەی وا بیردەکەنەوە کە : دەبێ مەسەلەی جەنگو جیهادو ئامادەکردنی جەنگ ، لە فەرهەنگی مێشکیان ببەنە دەر ، ئەوانە نە لە قورئان تێگەیشتوون ، نە لە دنیاو سروشتی بەشەرو ژیانیش تێگەیشتوون ، ئایا ئەمەریکاو زلهێزانی دیکە ، بەهۆی ئەوەوە کویخایەتیی بەسەر دنیادا دەکەن ، کە زۆر دیموکراسیینو ، زۆر لای ئاشتییان گرتوە ؟ یان بەهۆی ئەوەوە کە بنکەی سەربازییان لە هەموو شوێنەکان داناوە ، وە خاوەنی گەورەترین هێزی عەسکەریین ؟! بە تەئکید بەهۆی هێزەکەیانەوەیە کە کوێخایەتیی بەسەر زەوییدا دەکەن .

٥ / ئنجا کە دەفەرموێ : ﴿وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ﴾ ، وە کەسانێکی دیکەش جگە لەوان (دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانن) کە ئێوە نایانزانن و خوا دەیانزانێ .

توێژەرەوانی قورئان ڕاجیاییان هەیە لەسەر ئەوانە ، کە دەبێ کێ بن ؟

١) (الطبري) دەڵێ : مەبەست پێی جندە ، وە لەوبارەوە ئەم شوێنەوارە بە بەڵگە دێنێتەوە ، دەڵێ : «هُمُ الْجِنُّ ، قَالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : إِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَخْبُلُ وَاحِداً فِي دَارٍ فِيهَا فَرَسٌ عَتِيقٌ»[1] .

واتە : ئەوانە جندن ، پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : شەیتان کەسێك شێت ناکات ، کە لە ماڵیدا ئەسپێکی ڕەسەن بەستراببێتەوە .

٢) بەڵام (ابن کثیر) دەڵێ : ئەمە فەرموودەی پێغەمبەری خوا نیە ، چونکە نە سەنەدەکەی ڕاستە ، نە مەتنەکەی .

وە بێگومان قسەکەشی وایە ، وە ڕای ڕاست هەر ئەوەیە کە مەبەست لە : ﴿وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ﴾ ، هەر کەسێکە دوژمنایەتیی کۆمەڵی مسوڵمانان بکات : جوولەکەیە ، نەصرانییە ، بتپەرستە ، هەرچی هەیە هەموویان دەگرێتەوە .

---

١) أخرجه الطبراني في الكبير ، ج ١٧، ص ١٨٩، قال ابن كثير: هذا الحديث منكر، لا يصح إسناده ولا متنه.

٦ / وە کە دەفەرموێ : ﴿لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡ﴾ ، یانی : کەسانێکن لە دڵیاندا هەیە دژایەتیی‌و دوژمنایەتی مسوڵمانان بکەن ، خوا دەیانزانێ مسوڵمانان نایانزانن ، چونکە جارێ دوژمنایەتییەکەیان ئاشکرا نەبووە ، هەڵبەتە کە دەفەرموێ : ﴿لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡ﴾ ، واتە : ئەو کاتە پەنهان‌و نادیار بوون ، بۆ پێغەمبەرو مسوڵمانان ، دیارە ئێستاش بۆ مسوڵمانان هەروایە ، واتە : وێڕای دوژمنی ئاشکراو بەرچاو ، دوژمنی پەنهان‌و شێردراوەشیان هەن .

٧ / کە دەفەرموێ : ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ﴾ ، وە هەرشتێك خەرج بکەن ، وە ئەو شتە هەر چەند بێ ، مادام لە ڕێی خوادا خەرجی دەکەن ، ئەوە بە تەواویی پاداشتتان دەدرێتەوە ، وە ستەمتان لێ ناکرێ ، ﴿لَا تُظۡلَمُونَ﴾یش ، واتە : (لا تُنْقَصون) وەك لە سوورەتی (الكهف)دا خوای زاناو توانا دەفەرموێ : ﴿كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ٣٣﴾ ، واتە : هەردوو باغەکان بە تەواویی میوەی خۆیان دەرکرد ، وە هیچ کام لەو دوو باغە هیچ ستەمیان لە بەرو میوەکەیان نەکرد ، واتە : کەمیان میوە دەرنەکرد ، کەواتە : ﴿وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗا﴾ ، واتە : (وَلَمْ تَنْقُص مِنْهُ شَيْئاً) .

**مەسەلەی شەشەم** : کە دەفەرموێ : ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ ، وە ئەگەر ملیان دا بۆ ئاشتیی ، تۆش ملی بۆ بدە ، وە پشت بە خوا ببەستە ، بێگومان هەر ئەوە بیسەری زانایە .

وشەی (جَنَحَ : مَالَ) ، واتە : لایدا ، خوار بۆوە[1] .

---

١) المصباح المنير، للفيومي، ص ٦٢ .

وە (سَلْم) واتە : صولْحو سەفاو ئاشتیی[١] ، كەواتە : كە دەفەرمویٚ : ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ ، واتە : تۆ ئاشتییو تەبایيو صولْح هەلْبژێرەو پشتیشت بە خوا قایم بێ ، چونكە خوا بیسەری زانایە ، قسەكانتان دەبیستێ ، وە زانایە بە نهێنییەكانی ئێوەشو ئەوانیش .

## ئایا بناغەی پەیوەندیی دەوڵەتی ئیسلامیی و قەوارەكانی دیكە : ئاشتییە ، یان جەنگ ؟

پێم باش بوو لێرەدا ئاماژە بە شتێك بكەم ، كە زانایان ڕاجیاییان لەسەری هەبووەو هەیە ، ئەویش ئەوەیە : ئایا بناغە لە پەیوەندیی قەوارەو دەوڵەتی ئیسلامیی لەگەڵ قەوارەو دەوڵەتەكانی دیكەدا ، جەنگە ، یان ئاشتییە ؟

هەندێكیان گوتوویانە : بناغە جەنگە ، واتە : لە بناغەدا قەوارەی ئیسلامیی جاری جەنگ كردنی داوە ، دژی هەموو قەوارە سیاسییەكانی جگە لە خۆی ، مەگەر لەسەر بناغەی پێكهاتنێك ، ڕێكەوتنێك ، یان بە شێوەیەك لە شێوەكان ، لەگەڵ قەوارەی ئیسلامیی دا ئاشتەوایی بەرقەرار بكەن !

بەڵام من ئەو ڕایەم پێ ڕایەكی زۆر بێهێزە ، وە پێم وایە بناغەی پەیوەندیی قەوارەی ئیسلامیی لەگەڵ هەموو قەوارەكانی دیكەدا ، بریتییە لە ئاشتیی و تەبایی[٢] ، چونكە :

---

١) المصباح المنیر ، للفیومي ، ص ١٤٩، ١٥٠.

٢) ئەو بابەتەم بە درێژی لەم كتێبانەدا توێژیوەتەوە :

١/ الإسلام كما یتجلی في كتاب الله تعالی ، المجلد الثامن (الإسلام : نظرة سدیدة تجاه الناس ، وتعاملٌ صحیح معهم .

٢/ چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم ، چاپی شەشەم ، بەشی یەكەم : بنەمایەكانی تەبایيو پێكەوە ژیان لە قورئان دا.

٣/ هەڵوەشاندنەوەی بیرۆكەی پەرگیریی .

٤/ ئیسلامو دەوڵەتداریی ، بەرگی چوارەم .

١) ئێمە تەماشا دەکەین : لە هەموو جەنگەکانی پێغەمبەری خوادا ، ئەهلی کوفر دەست پێشخەر بوون ، یان ئەوان خۆیان کۆکردۆتەوە هێرش بکەن ، یاخود هێرشیان کردوە ، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا هیچ کات دەست پێشخەر نەبووە بۆ شەڕ کردن لە دژی هیچ لایەنێك .

٢) پاشان ئایەتەکان لەوبارەوە زۆر ڕوونن ، بۆ وێنە خوا دەفەرموێ :

چ

ى ى چالحـج ، واتە : وە ئەوانەی لە دژتان دەجەنگن ، لە ڕێی خوادا لە دژیان بجەنگن ، (ئەدی ئەوانەی لە دژیان نەجەنگن ؟ دەفەرموێ :) بەلاّم دەستدرێژیی مەکەن ، بێگومان خوا دەستدرێژکارانی خۆشناوێن .

واتە : شەڕ بە کەسێك مەفرۆشن ، کە ئەو شەڕتان لەگەلّ ناکات ، لێرەشدا کە دەفەرموێ : ﴿وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾﴾ ، لە سیاقێکدا هاتوە ، واتە : وە ئەگەر ئەوانەی کە جەنگتان لە دژ دەکەن ، ئامادە بوون ئاشتییتان لەگەلّدا بکەن ، ئاشتییان لەگەلّدا بکەن .

ئەدی ئەوەی شەڕت لە دژ ناکات ؟ ئەوە لە پێشترە کە تۆ ئاشتیی لەگەلّدا بکەی ، چونکە ئەوەی کە تاکو ئێستا جەنگیشی لەگەلّ کردووی ، ئەگەر ئەمڕۆ هاتو گوتی : وەرە لاپەڕەیەکی نوێ هەلّدەینەوە ، چیدی لە دژ یەکدی جەنگ نەکەین ، تۆ دەبێ وەلاّمی داوایەکەی بدەیەوەو ، پشت بە خوا ببەستی .

٣) ئنجا ئەگەر بگوترێ : دەولّەتی ئیسلامیی هەر لە بەراییەوە ، ئیعلانی جەنگی کردوە لە دژی هەموو لایەك ، ئەوە وەك عەرەب دەلّێن : (يَتَغَدَّونَ بِهَا قَبْلَ أَنْ تَتَعَشَّى بِهِم) .

واتە : پێش ئەوەی ئەو بیانکاتە نانی ئێوارە ، ئەوان دەیکەنە نانی نیوەڕۆ ، یانی : دەستپێشخەریی لە دژ دەکەنو ، دەلّێن : مادام ئیعلانی جەنگی کردوە ، پێش ئەوەی دەست بوەشێنێ ، با ئێمە دەستی لێبوەشێنین .

بۆیە ئەوە شتێكی نامەنتیقییە ، وە وەك گوتم : نە لە قورئاندا شتی وا هاتوە ، وە نە سوننەتو سیرەی پێغەمبەری خوادا ئاوا بووە .

بۆیە من لە كتێبی (ئیسلامو دەوڵەتداریی) دا گوتوومە : پێم وایە ئەو زانایانە لەبەرئەوە وایان گوتوە ، تەماشای واقیعی حاڵی خۆیانیان كردوەو ، ئەوەیان لێ هەڵێنجاوە ، كە بینیویانە دەوڵەتانی فارسو ڕۆمو دوژمنانی دیكەیان : هەمیشە بۆیان لە بۆسەدا بوون ، وە هەر دەرفەتیان بووبێ ، هەڵیان كوتاوەتە سەر دەوڵەتی ئیسلامیی و مسوڵمانان ، بۆیە ئەو زانایانە لە ژێر ڕۆشنایی ئەو واقیعەدا گوتوویانە : بناغە بریتیە لە جەنگ ، ئەگەرنا شتێكی نامەنتیقییە ئەسڵ لە پەیوەندیی دا بریتی بێ لە جەنگ !!

**مەسەلەی حەوتەم** : كە دەفەرموێ : ﴿ وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٦٢ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ۝٦٣ ﴾ ، وە ئەگەر بیانەوێ فێڵت لێ بكەنو هەڵت بخەڵەتێنن ، تۆ خوات بەسە ، خوا ئەو كەسەیە كە تۆی بەهێز كردوە ، پشتگیریی تۆی كردوە ، بە یارمەتیی تایبەتی خۆی ، وە بە هۆی بڕوادارانیشەوە .

واتە : تۆ لە ترسی فێڵو پیلانیان پاڵ بە صوڵحەوە مەنێو ، ڕەفزی مەكە ، هەمیشە با بژاردەی تۆ بریتی بێ لە صوڵحو تەبایی و ، ئاشتیی و ، پێكەوە ژیان ، وە بە بیانووی ئەوە كە ڕەنگە ئەوان بەتەمابن لە بن باڵی صوڵحدا فێڵ لە تۆ بكەن ، ئاشتیی و تەبایی، ڕەت مەكەوە ، وە ئەگەر بەڵگەیەكت هەبوو ، كە ئەوانە دەیانەوێ فێڵت لێ بكەن ، تۆش دەبێ لە خۆت وریا بی .

ئنجا كە دەفەرموێ : ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ ، واتە : ئەو (خوا) ئەو كەسەیە كە بە یارمەتیی تایبەتی خۆی : پشتیوانیی لە تۆ كردوە، (ئنجا چ بە هۆكارە مەعنەوییەكان ، چ هۆكارە ماددییەكانی كە لە ژێر ڕكێفو دەستەڵاتی تۆدا نین ، یاخود لە ژێر دەستەڵاتی بەشەردا نین) ، هەروەها

بەهۆی ئیماندارانیشەوە ، دیارە ئەوە كاتە بڕواداران پشتیوانان و كۆچكەران بوون ، خوا لێیان ڕازی بێ ، بەڵام خوا لە قورئاندا ئەوەی ڕەچاو كردوە ، كە ئەم ئایەتانە تەنیا بۆ ڕۆژگاری پێغەمبەر نین ، بۆیە نەیفەرموە : (هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بالـمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصار) ، ئەگەر وای فەرموو بایە هەر ئەوانی دەگرتەوە ، بەڵام فەرموویەتی : ﴿وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ، ئنجا ئەو تەعبیرە : ئێستاش و ، پێش ئێستاش و ، دوای ئێستاش بڕوادارانێك كە لە خزمەتی بەرنامەی پێغەمبەری خوا دان ، دەگرێتەوە ، وە خوا بە چەندان شێوەی ماددیی مەعنەویی ، وەك : هۆكارە سیاسیی و ئابووریی و كۆمەڵایەتییە هەڵكەوتووەكان ، وە ترس خستنە دڵی كافران و ، ناردنی فریشتان و ... هتد ، كە دەستی مسوڵمانانیان تێدانیە ، یاخود بەهۆی ئیماندارانەوە ، بەهێزیان دەكات و پشتیان دەگرێ .

ئنجا چۆنیەتی پشتگرتنی پێغەمبەر بەهۆی ئیماندارانەوە ، ڕوون دەكاتەوە ، دەفەرموێ : ﴿وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ﴾ ، پێشتر باسمان كرد (تأليف) بە مانای پێكەوە بەستنی چەند شتێك دێ ، ﴿وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ﴾ ، واتە : دڵی پێكەوە جوش داون[1] .

ئنجا خوا تبارك وتعالى ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خۆشەویست دەكات ، دەفەرموێ : ﴿لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ ، واتە : ئەگەر تۆ هەرچی لە زەویدا هەیە لە سەروەت و سامان ، هەموویت خەرج كردبایە ، نەتدەتوانی ئاوا پێكەوە دڵیان گرێ بدەی ، (وەك خوا پێكەوە دڵی پێكەوە بەستوون) ، بەڵام خوا دڵی پێكەوە گرێ داون ، بێگومان خوا زاڵی كاربەجێیە .

بە ڕاستی ئیمان ئەو هێزە مەعنەوییەیە ، كە دڵی ئیمانداران پێكەوە گرێ دەدات ، بە شێوەیەك كە بە هیچ شتێكی دی ئاوا پێكەوە گرێ نادرێن ، با لەوبارەوە ئەم دەقە بێنین :

١) المصباح المنير ، للفيومي ، ص ١٥ .

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ، قَالَ : إِنَّ الرَّحِمِ لَتُقْطَع ، وَإِنَّ النِّعْمَةَ لَتُكْفَر ، وَإِنَّ الله إِذَا قَارَبَ بَيْنَ القلوب لَمْ يُزَحْزَحهَا شَيءٌ أَبَدَاً ، ثُمَّ قَرَأَ : ﭽلَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡ ﭼ﴾ }أَخْرَجهُ عَبدالرَّزاق ، برقم : (٢٠٢٣٣) ، وَالحَاكِمُ برقم : (٣١٧٩) ، وَقَالَ هَذَا حَدِيثٌ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْن ، وَلَمْ يُخرِجاهُ بِهَذِهِ السياقة ، وَقَالَ الذَّهبي : صَحِيح عَلَى شَرْطِ ، البُخَارِي و مسلم{ .

واتە : عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : جاری وایە پەیوەندیی خزمایەتیی دەپچڕێنرێ ، وە جاری وایە چاكە ، سپڵەیی لەگەڵ دەنوێنرێ ، بەڵام خوا هەر كاتێك دڵەكانی لە یەكەوە نیزیك خستنو پێكەوە پەیوەستی كردن ، هیچ شتێك لێكیان ناترازێنێ .

دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﭽلَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡ ﭼ .

منیش دەڵێم : ئەگەر تەماشای تەسبیح بكەی دەزوویكی پێوەیە ، ئەو دەزووە بەنێو هەموو دەنكەكاندا دەڕواتو ، پێكیانەوە دەبەستێو دەیانخاتە پاڵ یەكدی ، بێنە ئەو دەزووە بپچڕێنە ، نەك تەسبیحێك نامێنێ ، بەڵكو دەنكەكانیش پرژو بڵاو دەبنو بە زەحمەت بۆت كۆدەكرێنەوە ، ئیمانیش ئەو هێزەیە ، كە ئاوا بڕواداران پێكەوە گرێ دەدات ، ئنجا ئەو دەزووە ، ڕووی هەموو دەنكەكان بەرەو یەك لا ئاڕاستە دەكات ، ئیمانیش ئەو هێزە مەعنەوییەیە كە بڕواداران بەرەو یەك ڕووگە ئاڕاستە دەكاتو ، پێكیانەوە دەبەستێ .

بۆیە هەر كاتێك بمانەوێ ئەو هێزە تۆكمەو توندو تۆڵو پەیوەستە بین ، كە بتوانین مەداری ئیسلام ساز بكەینو ، بتوانین ئەركەكانی ئیسلام جێبەجێ بكەین ، دەبێ مشووری زیاتری بەهێزكردنی ئەو ئیمانو عەقیدەیە بخۆین ، كە لە مێشكو دڵماندا هەیەو ، كە بەهۆیەوە یەكرێزییو دۆستایەتییو خۆشەویستییمان لە نێو خۆماندا ، پتەوتر دەبێ .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هەشـت (٨) ئـایەت پێك دێ ، ئایەتـەكـانی : (٦٤ تـا ٧١) ، كـە تێیـاندا زیـاتر ڕووی دوانـدان لـە پێغەمبـەری خاتـەمە ، وە سـێ جـاران خـوا پێی دەفەرموێ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ، واتـە : ئـەی پێغەمبـەر !

سەرەتا خـوای بـەرزو مـەزن پێغەمبـەری خاتـەم دەدوێنـێ‌و ، پێیـڕادەگەیەنـێ كـە خـوا بۆ خـۆی‌و بڕوادارانـی شـوێنكەوتووی ، بەسـە .

پاشـان بـۆ جـاری دووەم دەیدوێنـێ‌و ، فـەرمانی پێدەكـات ، كـە بـڕواداران لەسـەر جەنگ كردن هـانبداتو ، دەبـێ یەك بە دە ، بەرانبـەری دوژمنانیـان بوەستن ، پاشـان دەفەرموێ : ئێستا بەهـۆی بێهێـزیتانەوە ، ئەركتان سووك كـراو ، دەبـێ یـەك بـە دوو لە بەرانبـەر دوژمنـاندا بوەستن .

دوایـی خـوای كاربـەجـێ ڕەخنـە لـە پێغەمبـەر و بـڕواداران دەگـرێ ، بەهـۆی ئـەووەوە كە پەلـەیان كردوە ، لە بە دیل گرتنی كافرە شەڕفرۆشەكاندا ، بـە هانـدەری وەرگرتنـی قەرەبوو (فديـة) لـێیـان ، كە ڕاسـتتـر وا بوو ، پاش لە پەل‌و پۆ خستنیـان ، بـە دیلیـان گرتبـان .

پاشـان پێیـان دەفەرموێ : لـەو دەستكـەوتـە بخـۆن ، كـە لـە جـەنگ دا گرتوویـانـەو حـەڵاڵ‌و زەڵاڵـە .

وە لە كۆتایی دا خـوا بۆ جاری سێیەم ، پێغەمبـەری خاتـەم دەدوێنـێ : كـە بـەو دیلانـەی بـەردەستیـان بفـەرموێ : ئـەگـەر خـوا خێرو چاكـەتان لە دڵدا بزانـێ ، باشـتـر لـەو قـەرەبووەی لـێتان وەرگیـراوە ، پێتـان دەبـەخشـێ‌و لـێشـتان دەبـوورێ ، بـەڵام ئـەگـەر بیانـەوێ جارێكی دیكە سـەنگەرت لـێ بگرن‌و ، ئـەو پەیمانـەی پێیـان داوی : كـە شـەڕت لـە دژ نـەكـەن ، بیشكێنن ، ئـەوە پێشتـر بـاجی خیانـەتیـان داوەو تامیـان كردوەو ، دووبـارەی نەكـەنەوە باشـە !

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٦٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمۡ عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ٦٥ ٱلۡـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ٦٦ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٦٧ لَّوۡلَا كِتَٰبٞ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمۡ فِيمَآ أَخَذۡتُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٦٨ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمۡتُمۡ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٦٩ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٠ وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدۡ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ فَأَمۡكَنَ مِنۡهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ٧١ ﴾

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

}ئـــەی پێغـەمبـــەر ! خـــۆت‌و بـــڕوادارانی شوێنکـــەوتووت ، خـــواتان بـەســـە (پشـتیوانتـان بـێ) ﴿٦٤﴾ ئەی پێغـەمبـەر ! بـڕواداران لەســەر جـەنگ کـردن ، هـان بـدە ، ئـەگـەر بیسـت کـەسـی خۆڕاگرتـان هــەبن ، بـەســەر دوو سـەد کـەسـدا زاڵ دەبـن‌و ، ئـەگـەر سـەد کـەس بـن ، بـەســەر هـەزار کـەس لـە بێبـڕوایـان دا زاڵ دەبـن ، بـەهـۆی ئـەوەوە کـە ئـەوان کۆمەڵێکن تێنـاگـەن ﴿٦٥﴾ ئێستا خـوا لەسـەری سووك کـردن‌و زانـی کـە بێهێـزییتـان تێدایە : ئنجا ئـەگـەر سـەد کـەسی خۆڕاگـرتان هـەبن ، بـەســەر دوو سـەددا زاڵ دەبـن‌و ، ئـەگەر هـەزار کـەسـتان هەبـێ بـە مۆڵـەتی خـوا ، بـەسـەر دوو هـەزار کـەس (لـە بێبـڕوایـاندا) زاڵ دەبـن ، وە خـوا لەگـەڵ خۆڕاگران دایـە ﴿٦٦﴾ هـیچ پێغـەمبـەرێك بـۆی نیـە دیلـی هـەبن (دیـلان بگـرێ) هـەتا لـە زەویـدا دوژمـن لـە پەل‌وپـۆ نـەخـات ، ئێـوە ئامانجـتان (لـە گرتنـی دیـلان‌و قـەرەبوو لێوەرگرتنیـان) بـەرژەوەندیـی دنیـایەو ، خـواش دواڕۆژی (بۆتـان) دەوێ ، وە خـوا زاڵـی کـارزانـە ﴿٦٧﴾ ئـەگەر لەبـەر ئـەوە نـەبووایە کـە نووسـین (ی بڕیـار)ێـك لـە لایـەن خـواوە ڕابـردوە ، بـەهـۆی ئـەو (قـەرەبوو)ەوە کـە وەرتـان دەگـرت ، ئـازارێکی مەزنتـان تـووش دەبـوو ﴿٦٨﴾ ئنجا ئـەوەی دەستکـەوتتـان بـووە ، بـە حـەڵاڵ‌و زەڵاڵـی بیخـۆن ، وە پارێـز لـە خـوا بکـەن ، مسۆگـەر خـوا لێبوردەی بـە بـەزەیی یـە ﴿٦٩﴾ ئـەی پێغـەمبـەر ! بـەو دیلانـە بڵـێ ، کـە بـە دەستتـانـەوەن : ئەگـەر خـوا (نیـازی) چاکـە لـە دڵـتاندا بزانـێ (و نیـازو مەبەسـتتان لەگـەڵ مسوڵمانـاندا باش بـێ) ئەوە لەو (قـەرەبوو)ە کە لـێتان وەرگیـراوە ، بـاشـتـرتـان پـێ دەدات ، وە لـێتـان دەبـوورێ‌و ، خـواش لـێبوردەی میهرەبانـە ﴿٧٠﴾ وە ئـەگەر بیانـەوێ ناپاکییـت لەگـەڵدا بکـەن (پەیمـانێك کـە پێیـان داوی بیشکێنن) ، ئەوە پێشـتـر ناپاکییـان بـەرانبـەر خـوا کـردو ، خـواش دەستی ئێـوەی بەسـەریـاندا زاڵـکرد (وە سـزای پەیمان شـکێنییـان چێشـت) ، وە خـوا زانای کاربـەجێیـە ﴿٧١﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(حَسْبُكَ) : یانی : (كافیك) ، واتە : بەستە ، (حَسْبُنَا الله : كافِينَا ، حَسْبُكَ دِرْهَمٌ : كَفَاكَ) .

(حَسْب) واتە : بەس ، ئەوەندە بەسە بۆ تۆ ، كە دەگوترێ : (حَسْبُنَا الله) واتە : خوا بۆ ئێمە بەسە ، دەگوترێ : (حَسْبُكَ دِرْهَمٌ) واتە : درەمێك بۆ تۆ بەسەو بەشت دەكات .

(حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ) : (التَّحْرِيضُ : الحَثُّ عَلَى الشيء ، بكَثْرَةِ التَّزيين وَتَسْهِيلِ الخَطْبِ فِيهِ) .

(تَحْرِيض) بریتیە لە هاندانی كەسێك بۆ ئەوەی شتێكی بۆ جوانو ئاسانی بكاتو بیڕازێنێتەوە ، بۆ ئەوەی ئەنجامی بدات .

(لَّا يَفْقَهُونَ) : واتە : بە وردیی تێناگەن ، (فقه) بریتیە لە ورد تێگەیشتن ، (فهم) بریتیە لە تێگەیشتن ، دەڵێ : (الفِقْهُ : هُوَ التَّوصل إلى عِلْمٍ غَائِبٍ بعِلْمٍ شاهِدٍ ، فَهُوَ أَخص مِنَ العِلْمِ) .

(فقه) بریتیە لە گەیشتن بە زانیارییەكی نادیار ، بەهۆی زانیارییەكی دیارەوە ، بۆیە (فقه) لە (علم) تایبەتترە ، (علم) بریتیە لە زانین ، بەڵام (فقه) بریتیە لە زانینی شتێك بە وردیی ، یان بەهۆی شتێكی دیكەوە .

(أَسْرَىٰ) : (الأَسْرُ : الشَدّ بالقِدِّ[1] ، وَأَسارى ، وأُسارى ، وَأَسْرَى جَمْعُ أَسِير) .

(أَسْر) بریتیە لە دەست بەستنی كەسێك بە زوێڵە چەرم ، وە (أَسارى ، أُسارى ، أَسْرَى) هەر سێكیان كۆی (أَسِير)ن ، واتە : دیل ، ئەوەی كە لە جەنگدا دەگیرێ .

---

١) سُمِيَ الأسيرُ أسيراً لأنه يُشَدُّ بالقِدِّ ، مختار الصحّاح ، ص ١٦، (قِدّ) یش بە كوردیی زوێڵە چەرمی باریكە ، شتیان پێ بەستوە.

(حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ) : واتــە : لـە پـەل‌و پۆیــان دەخـات لـە زەویـدا ، یــاخود كوشــتاری خەستیــان لــێ كـردن ، دەگـوترێ : (ثَخُنَ الشيءُ فَهُوَ ثَخِينٌ ، إِذَا غَلُظَ فَلَمْ يَسَلْ ، أَثْخَنْتُهُ ضَرْبًا) ، (ثَخُنَ الشيءُ فَهُوَ ثَخِينٌ) .

واتـە : ئـەو شتـە پتـەوە ، یـاخود بـە مانای توندیی دێ ، كـە پێچەوانـەی ئـەوەیە شـل بـێ‌و بڕژێ ، ئنجا لەوەوە خـوازراوەتـەوە بۆ هـەر شـتێك كە زۆر بـە خەســتیی بكرێ ، دەگوترێ : (أَثْخَنْتُهُ ضَرْبًا) واتە : زۆرم لێدا ، (أَثْخَنَ فِيهِمُ القَتْلَ) واتـە : زۆری كوشـتار لـێكردن ، بۆیە من وشــەی لـە پـەل‌و پـۆ خستنم بـۆ بەكارهێنــاوە ، واتـە : هێنـدەیان لــێ بكـوژی ، كـە لـە پـەل‌وپۆ بكـەون ، توانـای بەرهـەڵستییــان نەمێنــێ .

(عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا) : (العَـرَضُ : مَـا لاَ يَكـونُ لَـهُ ثَبـاتٌ إِلاَّ بـالجَوْهَرِ ، كـاللَّوْنِ وَالطعْـمِ ، وَالعَرَضُ : المَالُ قَلَّ أَوْ كَثُرَ) .

وەك پێناســەیەكی فـەلسـەفیی دەڵـێ : (عَـرَض) ئــەوەیە كــە بـۆ خـۆی ناتوانــێ هەبــێ ، بـەبــێ جەوهــەر ، وەك بـۆن‌و تـام‌و ڕەنـگ ، ئـەوانــە دەگــوترێ : بۆنێكـی سـووك ، خـواردنێكی بـەتـام ، ڕەنگێكی جوان ، دەبێ شـتـەكە ببـێ ، ئـەوجـار تـام‌و بـۆن‌و ڕەنگـی دەبێ ، بـەڵام لێرەدا مەبـەست لە (عرض الدنيا) ئـەوە نیە ، بـەڵكـو مەبــەست پێـی بــەرژەوەندیی دنیاییــە ، ســەروەت‌و ســامان ، كـەل‌و پــەل ، ئـەو شــتانەی كـە پەیوەندیــیان بـە دنیـاوە هــەیە ، بۆیـــەش نـاوی لــێنراوە : (عَـرَض) چونكـە زوو دەڕوات‌و تێدەپەڕێ ، دنیـا هـەر بـۆ خـۆی تەمـەنی كـورتـە ، بێگـومان شـتەكـانی نێـو دنیــاش تەمـەنیان لـە هـی دنیــاش كەمتــرە ، بـۆ وێنــە : كـەسـێك شــەست ، حەفتــا ســاڵ دەژی‌و ، شــتێكی دێتــە دەستــێ ، بێگـومــان كـەمتــر لــە تەمەنی خـۆی ، بەدەستییەوە دەبـێ ، ئنجا كورسـی‌و دەسـتـەڵاتە ، پـارەو ســامانە ، هەرچــی هەیە .

(خِيَانَتَكَ) : (الخِيانة : مُخَالَفة الحَقّ بنَقْضِ العَهْدِ فِي السّرّ ، وَنَقِيضُ الخِيانة : الأَمَانة) .

(خِيانة) بریتیـە لە پێچەوانـەی هـەق جووڵانــەوە ، بـەوە پەیمـان بشـكێنی بـە پەنهانیی ، وە پێچەوانـەی (خِيانة) (أَمَانة)ە ، (أَمَانـة) واتـە : پەیمـان پارێزیـی ، (خِيانة) واتـە : پەیـمان شـكێنـی .

(فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ ) : واتـە : ئـێـوەی بـەسـەر ئـەواندا زاڵ كـرد ، دەڵــێ : (مَكَّنْتُـهُ وَمَكَّنْتُ لَـهُ ، وَأَمْكَنْتُ لَـهُ : جَعَـلَ لَـهُ عَلَيْهِ سُلْطانَاً وَقُـدْرَة) .

واتــە : وامكــرد كــە دەسـتەڵاتــی بەســـەریدا هەبــێ ، بكـەوێتـــە ژێـر ڕكـێفی ئــەوەوە .

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـایەتـەكـان

١) هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئـایەتــەی كـە دەفـەرموێ : ﴿ ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟ مِائَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ .

لەوبارەوە ئـەم ڕیـوایەتە هـەیـە :

﴿عَـنِ ابْـنِ عَبَّــاسٍ رَضِــيَ اللهُ عَنْهُمَــا فِــي قَوْلِــهِ : ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَـٰبِرُونَ﴾ ، قَـالَ : فَفَرَضَ عَلَيْهِمِ أَنْ لاَ يفِـرَّ رَجُـلٌ مِنْ عَشْـرَةٍ ، وَلاَ قَـوْمٌ مِـنْ عَشْـرَةِ أَمْثَالِهِم ، فَجَهِدَ النَّاسَ ذَلِكَ ، وَشَقَّ عَلَيْهِم ، فَنَزَلَتْ الآيَـةُ الأُخْـرَى : ﴿ ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ ﴾ ، إِلـى قَوْلِهِ : ﴿يَغْلِبُوا۟ مِائَتَيْنِ﴾ ، فَفَرَضَ عَلَيْهِمِ أَنْ لاَ يَفِـرَّ رَجُـلٌ مِـنْ رَجُلَيْنِ ، وَلاَ قَوْمٌ مِنْ مِثْلَيْهِم ، وَنَقَصَ مِنَ الصَّبْرِ بِقَدَرِ مَا تَخَفَّفَ عَنْهُم مِنَ العِـدَّةِ﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبي حَاتِم في تفسيره ، برقم : (٩١٣٨) ، وقال مؤلِّفا الإستيعاب ج ٢ ، ص ٢٤٨ ، قُلْنَا : وَهَـذَا إِسنادٌ صَحيحٌ ، وَرَوَاهُ البُخَارِيُّ ، بـرقم : (٤٦٥٣) بلفظ قريـب منه} .

واتـە : عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خـوا لە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ ، دەڵـێ : كـاتێك خـوا ئـەوەی نـاردە خـوار }ئـەگـەر بیسـتی خۆڕاگـرتان هـەبن ، بـەسـەر دوو سـەددا زاڵ دەبـن{ لەسـەری پێویسـت كـردن كـە پیـاوێك دەبـێ لـە بـەرانبـەری دە پیـاودا بوەسـتێ ، وە كۆمەڵـێكی مسوڵمانـان ، دەبێ لە بەرانبـەری كۆمەڵـێكدا كە دە هێنـدەی خۆیـانن ، بوەسـتن ، بـەڵام ئـەوە لەسـەریـان قورس بوو ، وە گـران لەسـەریـان وەسـتا ، دوایی ئایەتەكەی دیكـە هاتە خوار ، كە دەفەرموێ : }ئێسـتا خـوا بۆی سووك كردن ، ئەگـەر سـەد كەسـی خۆڕاگرتـان هـەبێ ، بـەسـەر دوو سـەد دا زاڵ دەبن ، وە هـەزارتان بـەسـەر دوو هـەزاردا زاڵ دەبـن{ ، ئەو كـاتە خـوا لەسـەری پێویسـت كـردن ، پیـاوێـك

لە بەرانبەر دوو پیاودا نابێ ڕا بكات ، وە كۆمەڵێك لە بەرانبەر كۆمەڵێك كە دوو بەرانبەری خۆیانن نابێ ڕا بكەن ، وە بە ئەندازەی ئەوە كە لە ژمارەكەیاندا بۆی سووك كردن ، ئارامگرییشیان كەم بوو .

بەڵام لە ڕاستییدا من پێچەوانەی ئەوە دەڵێم ، پێم وایە لەبەر ئەوەی صەبرو خۆڕاگرییان كەم بوو ، هێزو پێزیان كەم بوو ، بۆیە خوای كارزان لە ژمارەكەشدا بۆی كەم كردنەوە ، نەك لەبەرئەوەی ژمارەكە كەم بوو ، خوا ئارامگریی وانی كەم كردبێتەوە ، ئەوانە خۆیان صەبریان كەم بۆوە ، وەك دوایی زیاتر ڕوونی دەكەینەوە .

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێ : ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ ﴾ .

لەوبارەوەش ئەم ڕیوایەتە هەیە :

﴿عَنِ ابْنِ عَباسٍ فَلَمَّا أَسَرُوا الأُسارَى ، قَالَ رَسولُ اللَّهِ لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ : (مَا تَرَوْنَ فِي هَؤُلاَءِ الأُسارَى) ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ : يا نَبِيَّ اللَّهِ ! هُمْ بَنُو الْعَمِّ وَالْعَشِيرَةِ ، أَرَى أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُمْ فِدْيَةً فَتَكُونُ لَنَا قُوَّةً عَلَى الْكُفَّارِ فَعَسَى اللهُ أَنْ يَهْدِيَهُمْ لِلإِسْلاَمِ ، فَقَالَ رَسولُ اللَّهِ : (مَا تَرَى يَا ابْنَ الْخَطابِ) ؟ قُلْتُ : لاَ وَاللَّهِ ، يا رَسولَ اللَّهِ ! مَا أَرَى الَّذِي رَأَى أَبُو بَكْرٍ ، وَلَكِنِّي أَرَى : أَنْ تُمَكِّنَّا فَنَضْرِبَ أَعْنَاقَهُمْ ، فَتُمَكِّنَ عَلِياً مِنْ عَقِيلٍ فَيَضْرِبَ عُنُقَهُ ، وَتُمَكِّنِّي مِنْ فُلاَنٍ (نَسِيباً لِعُمَرَ) فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ ، فَإِنَّ هَؤُلاَءِ أَئِمَّةُ الْكُفْرِ وَصَنَادِيدُهَا ، فَهَوِيَ رَسولُ اللَّهِ ، مَا قَالَ أَبُو بَكْرٍ ، وَلَمْ يَهْوَ مَا قُلْتُ ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ ، جِئْتُ فَإِذَا رَسولُ اللهِ وَأَبُو بَكْرٍ قَاعِدَيْنِ يَبْكِيَانِ قُلْتُ : يَا رَسولَ اللهِ ! أَخْبِرْنِي مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَبْكِ أَنْتَ وَصاحِبُكَ ، فَإِنْ وَجَدْتُ بُكَاءً بَكَيْتُ ، وَإِنْ لَمْ أَجِدْ بُكَاءً ، تَبَاكَيْتُ لِبُكَائِكُمَا ، فَقَالَ رَسولُ اللهِ : (أَبْكِي لِلَّذِي عَرَضَ عَلَيَّ أَصْحَابُكَ مِنْ أَخْذِهِمُ الْفِدَاءَ ، لَقَدْ عُرِضَ عَلَيَّ عَذَابُهُمْ أَدْنَى مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ) ، شَجَرَةٍ قَرِيبَةٍ مِنْ نَبِيِّ اللهِ وَأَنْزَلَ

اللهُ عَزَّ وَجَلَّ : ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ ، إِلَى قَوْلِهِ : ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ﴾ ، فَأَحَلَّ اللهُ الْغَنِيمَةَ لَهُمْ ﴾ }أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ ، برقم : (١٣٨٢) وغيره{.

واتـە : عـەبدوڵڵای كوڕی عەبباس لە عومـەری كـوڕی خـەتتاب خـوا لـێیـان ڕازی بـێ ، دەگـێڕێتــەوە ، (ڕاوییەكـە عومـەرە خـوا لـێی ڕازی بـێ) ، دەڵــێ : كـاتێك كـە (هـاوەڵان) دیلەكـانیـان لـێ بـە دیل گرتـن ، پێغـەمبــەری خـوا بــە ئــەبو بــەكرو عـومەری فـەرموو : ڕاتـان چییــە ؟ چـی لـەو دیلانــە بكـەین ؟ ئــەبو بــەكر گــوتی : ئـەی پێغـەمبـەری خـوا ! ئـەوانـە خزمی خۆمانن‌و ئـامۆزای خۆمـانن ، پـێم وایـە قەرەبووویـان لــێ وەربگیــرێ ، ئـەو پـارەو قـەرەبووە بـەكاربێنیــن بـۆ زیـاد كردنـی هێزمان لە دژی كـافران ، وە بـەڵكـو خـوای بـە بەزەیـی ڕێنمـایـی ئـەوانــەش بكـاتو مسـوڵمـان بـن .

پێغـەمبـەری خـوا فـەرمووی : ئـەدی كوڕی خەتتـاب ! تۆ چی دەڵێی ؟ دەڵـێ ، گوتـم : نا ، سوێند بـە خـوا ، ئـەی پێغـەمبـەری خـوا ! ئـەو ڕایـەی ئــەبو بــەكرم نیە ، من پێم وایە ئـەوانـە بخـەیە بـەردەسـتی ئێمـەو لـە گەردنیـان بـدەین ، عەقیـل (كـە برای عەلـی كـوڕی ئـەبی تالیبـە) بیخـە بـەردەسـتی عەلـی ، بـا لــە گــەردنی بــدات ، وە فلان كەسـیش (كـە خزمـی عومـەر بـوو) بیـدە بـەردەسـتی مـن ، بـا لـە گەردنی بدەم‌و بیكـوژم[١] ، چونكە ئـەوانـە پێشەوای كـوفرن‌و زلـەزلانی كـوفرن ، بـا لە نێویـان بـەرین .

پێغـەمبـەری خـوا ئـەو ڕایـەی ئـەبو بـەكری بـە دڵ بـوو ، ئـەوەی منـی بـە دڵ نەبوو ، بۆ بەیـانـی هـاتـن[٢] ، تـەماشام كـرد : پێغـەمبـەری خـوا و ئەبـو بەكـر دانیشــتبوون دەگریــان ، گوتــم : ئــەی پێغـەمبــەری خــوا ! بۆچـی لەگــەڵ هـاوەڵەكـەت دەگریـن ؟ ئـەگەر هـۆكـارێك هـەبـێ بۆ گریـان منیش دەگرییێم ، ئـەگـەر هۆكـارێكیش نـەبـێ ، هـەر لەبـەر گریـانی ئێـوە منیش دەگـریـم ؟!

---

١) ئەو كاتە لە گـەردن دان ، ئاسـانتـرین شـێوەی كوشـتن بووە .

٢) دیارە شـەو كەوتـۆتە بەینـێ ، هـەر لە جەنگی بـەدر، هـەر لـەو شـوێنـەی لـێیـبوون ، یـان هــەر بە ڕێـوە .

پێغەمبەری خوا فەرمووی : بۆیە دەگریم ، سزادان بۆ هاوەڵانت بەهۆی ئەوەوە کە قەرەبوویان وەرگرت ، بۆ من پێشاندراوە لەم درەختە نیزیکتر بووە لێیان ، ئاماژەی بۆ درەختێکی نیزیك کرد کە لە پێغەمبەری خواوە نیزیك بوو ، دوایی خوای ئەم ئایەتەی ناردە خوار : کە دەفەرموێ : ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ...﴿٦٧﴾﴾ هەتا دەگاتە ﴿فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ...﴾ ، وە خوا دەستکەوتی جەنگی بۆ حەڵاڵ کردن .

هەڵبەتە ئەوە لە (صحيح مسلم)دا هاتوە ، بەڵام من تێبینییم لەسەر ئەم دەقە هەیە ، وەك دوایی دەیخەمەڕوو ، لە کاتی تەفسیرو لێکدانەوەی ئایەتەکاندا ، چونکە ئەم ڕیوایەتە ، لەگەڵ چەمکی ئایەتەکەدا ، وە لەگەڵ چەمکی ئایەتی ژمارە (٤) لە سووڕەتی موحەممەد دا ، کە باسی مامەڵە کردن لەگەڵ دیلاندا دەکات ، تێکدەگیرێو ، نابێ فەرموودەی پێغەمبەری خواش لەگەڵ قورئاندا تێکبگیرێ ، بۆیە ئەم دەقە ئیشکالی لەسەر هەیە .

٣) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ : ﴿لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٩﴾﴾ .

لەوبارەوەش ئەم گێڕراوەیە دێنین :

﴿عَن عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ قَالَ : لَمْ تَحِلَّ الْغَنَائِمُ لِأَحَدٍ سودِ الرُّءُوسِ مِنْ قَبْلِكُمْ ، كَانَتْ تَنْزِلُ نَارٌ مِنَ السَّمَاءِ فَتَأْكُلُهَا ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ وَقَعُوا فِي الْغَنَائِمِ ، قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ لَهُمْ ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى : ﴿لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ ، برقم : (٣٠٨٥) ، قَالَ : هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ وصحيح ، وَابْنُ حِبانَ ، برقم : (٤٨٠٦) ، وَصَحَّحَهُ الألباني} .

واتە : ئەبو هورەیرە خوا لـێی ڕازی بێ لە پێغەمبـەری خـوای ﷺ گـێڕاوەتـەوە ، دەفەرموێ : بۆ هیچ کەسی سەر ڕەش لە پێش ئێوەدا ، دەستکەوتی جەنگی حەلاڵ نەکرابوو ، کە دەستکەوتی جەنگیان دەگرت ، کۆیان دەکردەوە ، ئاگرێك لە ئاسمان دەهاتە خوار دەیسووتاند ، بەلاّم لە جەنگی بەدردا ، هاوەلاّنی پێغەمبەر ﷺ دەستکەوتی جەنگیان کۆکردەوەو (هی وا هەبوو هەندێك لە شتەکانیشی بۆ خۆی هەڵگرتبوو)[١] ، پێش ئەوەی بزانن خوا چ بڕیارێکی داوە ، دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی دەستکەوتی جەنگیی ، بۆیە خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە : ﴿لَّوۡلَا كِتَٰبٞ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمۡ فِيمَآ أَخَذۡتُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ ، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە ، کە ئەوە بڕیارێکە لەلایەن خوا تێپەڕیوەو نووسراوە ، لەسەر ئەوەی کە پێش ئەوەی بزانن بڕیاری شەریعەت چۆنە ؟ دەستکەوتی جەنگتان کۆدەکردەوە ، سزا دەدران .

٤) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٠﴾ .

لەوبارەوەش ئەم گێڕراوەیە دێنین :

﴿عَنِ ابْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا في قَولِهِ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ﴾ ، كَانَ العَباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَدْ أُسِرَ يَوْمُ بَدْرٍ ، فَافْتَدَى نَفْسَهُ بِأَرْبَعِين أُوقِية مِنْ ذَهَبٍ ، فَقَالَ العَباسُ حِيْنَ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ : لَقَدْ أَعْطانِي اللهُ تَعَالَى خَصْلَتَيْنِ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهِمَا الدُّنيا ، إِنّي أُسِرْتُ يَوْمَ بَدْرٍ ، فَفَدَيْتُ نَفْسِي

١) یەکێك لەوانە: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، دەڵێ : شمشێرێك کە پێیان دەگوت : (ذا الكتيفة) ، بۆ خۆم هەڵم گرتبوو، چونکە من خاوەنەکەیم کوشتبوو، دیارە دوایی کە دەچن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، دەفەرموێ : لەسەر دەستکەوتی جەنگ دایبنێن ، بەلاّم پاشان هەر دەیدات بە خۆی، وەك پێشتر باسمان کرد .

بأَرْبَعِين أُوقِيةً ذَهَباً ، فَأَعْطانِي اللهُ أَرْبَعِينَ عَبْداً ، وَإِنِّي أَرْجُو المَغْفِرَةَ الَّتِي وَعَدَنَا اللهُ عَزَّ وَجَلَّ﴾ [1] .

واتە : عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ ، لەبارەی ئەم ئایەتەوە : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ﴾ ، دەڵێ : عەبباس خوا لێی ڕازی بێ (کە دەکاتە بابی عەبدوڵلا) بە دیل گیرا لە جەنگی بەدرداو ، خۆی کڕیەوە بە چل ئۆقیە زێڕ ، عەبباس خوا لێی ڕازی دەڵێ : دوای ئەوەی ئەم ئایەتە هاتە خوار ، خوای بەرز دوو شتی پێداوم لە دنیادا ، پێم لە هەموو شت چاکترن ، ئەوانیش ، ئەوەیە کە دەفەرموێ : لەگەڵیان بە بەزەییەو لێیان دەبووریٚ ، دەڵێ : من لە جەنگی بەدردا بە دیل گیرام و خۆم کڕیەوە بە چل ئوقیە زێڕ ، دوایی خوا دەوڵەمەندی کردم ، من ئێستا چل کۆیلەم هەیە [2] ، لە ڕیوایەتێکی دی دا گوتوویەتی : هەر چلیان بازرگانییم بۆ دەکەن ، وە من بە ئومێدی ئەو لێبوردنەشم ، کە خوای زاڵ و پایەدار گفتی پێداوین .

---

١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرِي ، ج ١٠، ص ٣٥ ، وَابْنُ أَبي حَاتم في تفسيره ، برقم : (٩١٧٨)، وَابْنُ المُنْذِر وَابْنُ مَرْدَوَية في تفسيرهما كما في (الدر المنثور)، ج ٤ ، ص ١١٢، وَالبَيْهَقِي في (الدلائل) ج ٣ ، ص ١٤٣.

٢) دیارە ئەو کاتە ئەو قسەیەی گێڕاوەتەوە ، کە جەنگی بەدر کۆتایی هاتووە بووەتە مسوڵمان .

# مانـای گـشـتـی ئایەتەكــان

خوای بەرزو مەزن لەم هەشت ئایەتـەدا ، وەك پێشـتـریش باسمان كرد ، سێ جاران ڕوو دەكاتـە پێغـەمبەری خاتـەمو بـە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾ ، دەیدوێنـێ ، دیـارە لـەم سوورەتەدا ، تەنیا ئەو سێ جارەیە كە خوا ڕاستـەوخۆ بە ناوونیشانی پێغەمبەرایەتیی پێغـەمبـەر ﷺ دەدوێنـێ ، ئـەو سێ جارەش لەم ئـایەتـانەدان كە لـەم دەرسـەدا شـییان دەكەینەوە .

جـاری یەكـەمیـان خـوا دەفـەرموێ : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ، ئەی پێغـەمبـەر ﷺ ! خـوا بۆ تۆ بـەسـە ، وە بـۆ ئـەوانـەی شـوێنت كـەوتوون لـە بـڕواداران ، هەنـدێك لـە زانایـان ئـەم ئایەتەیـان بـە جـۆرێكی دیكـەش لێكداوەتەوە ، گـوتوویـانە : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ، واتە : ئەی پێغـەمبـەر ﷺ ! خـوا بۆ تۆ بەسـە ، كە پشتیوانت بێ ، وە ئەو بڕوادارانەش كە شـوێنت كەوتوون ، یـانـی : لـە ژێـر ڕۆشـنـایی ئـایەتی پێشـێ دا ، كـە دەفـەرموێ : ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ۝٦٢ ﴾ ، خـوا ئـەو كـەسـەیە كە تۆی بـەهێـز كـردوەو پشتـگـیـریی تۆی كـردوە ، بـە یـارمەتی تایبـەتـی خـۆی ، وە بـە بـڕوادارانیش ، بەڵام مانای یەكەمیـان ڕاسـتـتـرە ، چونكە وشەی (حسب) واتـە : بـەس (كـافِي) ، دیارە تەنیـا خـوای باڵادەست بـەسـەو ، وەك پێویست پشتـگیـرو پشتیوانی هەر كەسێكی بـوێ بكات ، دەیكات ، ئـەگەرنا هیچ كـەسێك جگە لە خوا بـەس نیە بۆ پشـتیوانیی ، لـەوێ دەفەرموێ : ﴿ حَسْبَكَ ٱللَّهُ ﴾ ، واتـە : خـوا بۆ تۆ بـەسـە ، بـەڵام بێگومـان خـوا هـەم بە یـارمەتی مـاددیی مەعـنـەویی خـۆی ، هـەم بـە یـارمەتی بـڕواداران ، پشـتـیوانیی لـە پێغەمبـەر ﷺ كردوە ، ئنجـا لـێرە كـە دەفـەرموێ : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ، ئەی پێغـەمبەر ﷺ ! تۆ خـوات بەسـە ، وە بۆ ئەوانەش كە

شوێنت کەوتوون لە بڕواداران ، واتە : خوا بۆ تۆش بەسە ، وە بۆ ئەو بڕوادارانەش بەسە ، کە شوێنت کەوتوون ، بۆ ئەوەی پشتیوانییان بکاتو سەریان بخات .

نەك مەبەست ئەوەبێ ، خوا بۆ تۆ بەسە ، وە ئەو بڕوادارانەش کە شوێنت کەوتوون بۆ تۆ بەسن ، چونکە ئەو کاتە بڕواداران دێنە ڕیزی خوای بەرزو بێ هاوتاوە ، لەو ڕووەوە کە کافیىو بەسن ، بۆ ئەوەی پشتیوانیی لە پێغەمبەری خاتەم ! بکەن ، ئەوەش مانایەکی نارێك دەردەچێ ! بۆیە مانای ڕاست هەر ئەوەیە ، کە : خوا بۆ تۆش بەسە ، وە بۆ ئەو بڕوادارانەش بەسە ، کە شوێنت کەوتوون ، بۆ ئەوەی پشتیوانییان بکاتو سەریان بخات .

ئنجا بۆ جاری دووەم خوا ڕوو دەکاتەوە پێغەمبەری خاتەم ، دەفەرموێ :

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ﴾ ، ئەی پێغەمبەر ! بڕواداران هان بدە لەسەر جەنگ کردن ، لێرەدا خوای بەرزو مەزن فەرمان بە پێغەمبەر دەکات ، کە بڕواداران هان بدات لەسەر جەنگ کردن ، لە دژی کێ ؟ لە دژی بێبڕوایانێك کە سەنگەر لە ئیسلام دەگرن ، وە دەیانەوێ دەستدرێژیی بکەنە سەر حورمەتەکانو پیرۆزییەکانی مسولْمانان .

دوایی خوا وەك یاسایەك بۆ ئیماندارانی دادەنێ ، کە دەبێ چۆن جەنگ بکەن ؟ وە بە چەند لە بەرانبەر چەند بۆ دوژمنانیان بوەستن ؟ دەفەرموێ : ﴿ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَـٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴾ ، ئەگەر لە ئێوە بیستی خۆڕاگر هەبن ، بەسەر دوو سەد (لە کافرانی شەڕ فرۆش)دا زاڵ دەبن ، وە ئەگەر سەد کەس لە ئێوە هەبێ ، واتە : سەد جەنگاوەری خۆڕاگر ، بەسەر هەزار لەواندا زاڵ دەبن ، ئەوێش بەهۆی ئەوەوە کە کۆمەڵێکن نافامن .

کەواتە : هەر کۆمەڵێکی مسولْمانان دەبێ ، یەك بە دە ، لە بەرانبەر کۆمەڵی نامسولْمانان دا بوەستن ، ئنجا ئەگەر هەر بە ئەندازەی خۆیان ، دوو بەرانبەرن ، سێ بەرانبەرن ، تاکو دە بەرانبەر ، دەبێ بۆیان بوەستنو نابێ پشتیان تێبکەن .

ئەمه لـه سـەرەتادا بـەو شێوەیه بوو ، چونکه دیاره ئـەو کاتـه بڕواداران کۆمەڵـێکی زۆر تایبــەت بـوون ، ئـەوانــه بـوون کـه پێغـەمبــەری خــوا زۆر تایبــەت پــەروەردەی کـردبـــوون ، وەك دوایــی دەردەکــەوێ ، بۆیــه دەیــانتوانی یــەك بــه دە لــه بـەرانبــەر دوژمــن دا بوەســتن ، دیــاره خــوای زانــاو شــارەزا هـۆکارەکەشــی ڕوون دەکــاتەوەو ، دەفـەرموێ : ﴿بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ﴾ ، چونکـه ئـەوانــه کۆمەڵێکــن نافـامن ، کـه ئـەم بابـەته دوایـی لە مەسـەله گرنگەکان دا تیشکی دەخـەینـه سـەر .

دوایـی خــوا دەفــەرموێ : ﴿ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ﴾ ، هەڵبــەته لـه بـەینی ئــەم ئـایەتـەدا کـه سـووك کردنی تێدایـه ، وە ئـایەتی پێشـێ دیاره ماوەیـەکی پێچوه ، ئنجـا ئـایــا سـاڵـێکی پێچـوه ، یــان کـەمتــری پێچــوه ؟ گرنــگ ئــەوەیه ماوەیــەکی پێچـوه ، چونکه ناگونجێ خـوای پەروەردگار بفـەرموێ : یـەك بـەرانبــەری دە بوەسـتن ، دوایـی یەکســەر بفــەرموێ : نــەخێر ، یــەك بــه دوو لــه بـەرانبــەر دوژمنانـدا بوەسـتن بــەڵام ئـەگـەر ســێ ئــەوەندەو چـوار ئــەوەندە بـن ، بۆتـان هــەیه بـەرەو ڕوویـان نـەوەســتن‌و بـەرەنگاریــان نـەبنـــەوە !! دەبـــێ لـــەو نێــوانەدا ماوەیــەك بووبــێ ، بــەڵام لێــرەدا لـه قورئــانی بــه پیـتـو پێـزدا ئـایەتـەکـان ، یەکســەر بــەدوای یەکـدا هــاتوون ، مەبــەستم ئــەوەیه ئــەگەر هەنــدێ کــەس بــه ســادەیی‌و سـەرکـێڵــیی ، تـەماشــای ئـایەتـەکــانی قورئــان بکـات ، ڕەنگـه بڵــێ : خــوا فـەرموویــەتی : یــەك بــه دە ، دوایـی یەکســەر دەفەرموێ : یەك بـه دوو !! بـەڵام نـەخێر ، ماوەیــەکی پێچوه ، بـەڵام لـه ڕیزبـەندیی کردنی ئـایەتـەکـاندا ، ئـەو دوو ئـایەتـه کـەوتوونـه پـەنـای یـەك ، چونکـه پەیوەندییـان پێکەوە هـەیه ، لـه بارەی یەك بابەتەوە دەدوێن ، ئنجا فـەرمووی : ﴿ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ﴾ ، ئێستا خـوا ئەو حوکمەی لەسـەر سووك کردن‌و ، بۆی ئـاسـان کردن ، بۆچی لەســـەری ســـووك کــردن ؟ ﴿وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗا﴾ ، زانــی کــه بێهێزییتــان تێدایـەو ، ئـەو هێـزو پێـزەی جـارانتان نەماوە ، دیارە ئەوە کـاتێك بووە کـه مسـوڵمانان زۆر بوونو ، هـاوەڵان خـەڵکی دیکـەیـان ڕەگـەڵ کـەوتوە ، ئنجا بـه ئـەندازەی ئــەوە کـه ژمـاره زیـاد دەبـێ ، جـۆرو کـوالیـێتـیی شــت وەك پێشـێ نامێنـێ ، بۆیـه دەفـەرموێ : ﴿فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِ﴾ ، ئێستا ئەگەر سەد کەسی خۆڕاگـر

لە ئێوە هەبن ، بەسەر دوو سەددا زاڵ دەبن ، واتە : لە دوژمنانتان ، ﴿وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ ، وە ئەگەر لە ئێوە هەزار کەسی خۆڕاگر هەبن ، بەسەر دوو هەزاردا زاڵ دەبن ، بە مۆڵەتی خوا ، ﴿وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ ، وە بێگومان خوا لەگەڵ خۆڕاگران دایە .

دوایی خوای کاربەجێ دێتە سەر بابەتێکی دی ، کە زانایانو لێکدەرەوانی قورئان زۆر مشتو مڕیان لەبارەیەوە بووە ، کە دەفەرموێ : ﴿مَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ ، هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە دیلان بگرێو دیلی هەبن ، تاکو کوشتارێکی باش لە زەویدا لە دوژمنەکانی نەکات .

لێرەدا دەتوانین بە کوردیی بڵێین : هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە ، دیلان بگرێ ، تاکو دوژمنەکەی لە پەلو پۆ نەخات ، واتە : دەبێ زۆریان لێ بکوژێو ، وایان لێبکات ، نەتوانن لە بەرانبەری دا بوەستن ، کەواتە : لێرەدا خوای کاربەجێ ، ڕەخنە لە پێغەمبەری خاتەم دەگرێ ، وە لە هاوەڵانی بەڕێزیشی ، کە لە جەنگی بەدردا بە تەماعی فەرەبوو (فدیة) لێوەرگرتن ، دوژمنەکانیان بە دیل گرتن .

هەڵبەتە پێم وایە لێرەدا هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان بە هەڵە داچوون ، کە دەڵێن : مەبەست لەو ئایەتە ، ئەوەیە کە خوا ڕەخنە لە پێغەمبەری خوا دەگرێ ، کە بۆچی دیلەکانی نەکوشتن ، وە بۆچی فەرەبووی لێ وەرگرتن ؟!

بە بۆچوونی من ئەو ڕایە هەڵەیە ، بەڵکو من لێرەدا خوا ڕەخنە لە پێغەمبەر دەگرێ ، وە لە هاوەڵانی بەڕێز خوا لێیان ڕازی بێ ، کە بۆچی دیلیان گرتن ؟ نەك بۆچی دیلیان نەکوشتن ؟

خوا دەفەرموێ : نەدەبوو بە دیلتان گرتبان ، دەبوو لە جەنگدا زیاترتان لێ کوشتبان ، نەك بە تەماعی وەرگرتنی فەرەبوو ، بە دیلیان بگرن ! ئەگەرنا خوا ڕەخنە لە پێغەمبەری خاتەم ناگرێ : کە بۆچی کە دوژمنەکانی بە دیل گرتوون ، دوایی نەیکوشتوون ؟ هەرچەندە هۆی هاتنە خوارەوەکەش پێشتر باسمان کرد ، کە فەرموودەکە لە (صحيح مسلم)دا هاتوە ، کە باسی ئەوە دەکات ،

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی بە ئەبو بەکرو عومەر کردوە ، خوا لێیان ڕازی بێ ، ئەبو بەکر گوتوویەتی : با فەرەبوویان لێ وەربگرین ، عومەریش گوتوویەتی : با بیانکوژین ، دوایی خوای بەرزو مەزن ئەو ئایەتەی ناردۆتە خوارو ، پشتگیریی ڕایەکەی عومەری کردوە ، بەڵام من پێم وایە ئەم هۆی هاتنە خوارەوەیە ، لەگەڵ دەقی ئایەتەکەدا ناگونجێ ، وە لەگەڵ ئایەتی ژمارە (٤)ی سوورەتی (محمد)یش دا ناگونجێ ، وەك دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر .

ئنجا خوای بێ هاوتا دەفەرموێ : ﴿تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا﴾ ، ئێوە ماڵو سامانی دنیاتان دەویست (لە بەرانبەر بە دیل گرتنی کافرەکاندا ، تەماعی ئەوەتان هەبوو دوایی خۆیان بکڕنەوەو ئێوە فەرەبوویان لێ وەربگرن) ﴿وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْأَخِرَةَ﴾ بەڵام خوا دواڕۆژی بۆ ئێوە دەوێ ، پاداشتی دواڕۆژیش زیاتر بەوە وەدەست دێ ، ئەوە بکەن کە بۆ ئیسلام قازانجترە ، ئنجا ئایا کامە بۆ ئیسلام قازانجتر بوو ؟ بێگومان ئەوە کە زیاتر لە کافرەکارەکان بکوژنو ، لە پەلو پۆیان بخەن ، کە ڕەنگە ئەگەر زیاتریان لێ کوژرابایە ، بیریان نەکردبایەوە لەوەی کە جارێکی دی بێنەوە سەر مسوڵمانان ، وە جەنگی ئوحوودو ئەحزاب بێنە پێش ، کە لە جەنگی ئوحووددا هاوەڵان حەفتایان لێ کوژراو زۆربەی ئەوانی دیکەش ، لە نێویشیان دا پێغەمبەری خوا ﷺ بە خەستیی بریندار بوون !

بەڵێ ئەو زلەزلانەی کە لە جەنگی بەدردا بە دیل گیرانو ، پاشان بە فەرەبوو (فدية) بەردران ، دوایی چوون پارەیان کۆکردەوەو خەڵکیان هاندا ، ئنجا ئەگەر ئەوانە لە جیاتی ئەوەی بە دیل بگیرێن ، کوژرابانایە ، ڕەنگە هۆزی قوڕەیش توانای ئەوەیان نەبووایە ، بۆ جەنگی ئوحوود سوپایەکی سێ هەزار کەسی بێنن ، وە بۆ جەنگی ئەحزاب سوپایەکی دە هەزار نەفەری بێننو ، هێرش بکەنە سەر مسوڵمانان ، بۆیە خوا دەفەرموێ : خوا دواڕۆژی بۆ ئێوە دەوێ ، پاداشتی دواڕۆژیش زیاتر بەوە وەدەست دێ ، کە بەرژەوەندیی ئیسلامی زیاتر تێدایە ، ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ ، وە خوا زاڵی کارزانە ، زاڵو بە دەستەڵاتە ، وە کاربەجێشە ، دەزانێ دەستەڵاتەکەی بۆ پشتگیریی مسوڵمانان ، چۆن بەکار دێنێ .

پاشان خوای كاربەجێ هەر دەربارەی وەرگرتنی فەرەبوو لە دیلەكان ، دەفەرموێ :

﴿ لَّوۡلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمۡ فِيمَآ أَخَذۡتُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ ، ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە ، نووسینی بڕیارێك لە خواوە تێپەڕیوە ، بەهۆی ئەوەوە كە وەرتان گرت ، (لە فەرەبوو) ، سزایەكی مەزنتان تووش دەبوو .

ئەوە بڕیارە چییە لە خواوە تێپەڕیوە ؟ ئەوەیە كە هیچ كەس سزا نادات ، تاكو بۆیان ڕوون نەكاتەوە : دەبێ وا بكەن و ، وا نەكەن ، ئەو كاتە خوای پەروەردگار ئەوەی بە پێغەمبەرو مسوڵمانان نەفەرموو بوو ، كە دەبێ لە كاتی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن دا ، چۆن مامەڵە بكەن ؟ كە نابێ پەلە بكەن لە بە دیل گرتنیان ، ئەوەیان نەدەزانی ، بۆیە خوای بەخشندە سزای نەدان ، دیارە خوا ئەوەی لەلا پەسند بوو كە زیاتریان لێ كوشتبان .

ئنجا بۆ ئەوەی هاوەڵان دڵیان هیچی تێدا نەبێ دەربارەی ئەوە ، كە بە غەنیمەت چنگیان كەوتووە ، ئەوەی كە وەك فەرەبوو وەریان گرتوە ، دەفەرموێ : ﴿ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمۡتُمۡ حَلَٰلًا طَيِّبًا ﴾ ، لەوەی كە دەستكەوتتان بووەو بە غەنیمەت گرتووتانە ، بە حەڵاڵ و زەڵاڵی بیخۆن ، عافیێتتان بێ ، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ، وە پارێز لە خوا بكەن ، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە .

ئنجا بۆ جاری سێیەم و كۆتایی لەم سوورەتەدا ، خوای میهرەبان ڕوودەكاتە پێغەمبەر بۆ مەبەستێكی دیكە ، دەفەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرًا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرًا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ ﴾ ، واتە : ئەی پێغەمبەر ! بەو دیلانە بڵێ : كە بە دەستتانەوەن ، ئەگەر خوا چاكەتان لە دڵ دا بزانێ ، نیازو مەبەستی چاكتان لە دڵدا ببینێ و بزانێ ، (واتە : ئەگەر خێرو چاكەتان لە دڵ دا هەبێ ، چونكە ئەگەر هەبێ ، خوا دەیزانێ) ، ئەوە باشتر لەوەی لێتان وەرگیراوە لە فەرەبوو ، پێتان دەبەخشێ ، شتی باشتر چییە بۆ بابای كافر ؟ ئەوەیە كە مسوڵمان بێ ، دژایەتیی ئیسلام نەكات ، دەفەرموێ : ئەگەر ئەو خێرو چاكەیەتان لە دڵدا هەبێ ، باشتر لەو فەرەبووەی كە لێتان

وەرگێڕاوە لە بەرانبەر خۆ كرپنەوەتان دا ، پێتان دەدات ، وە سەربارەی ئەوەش ﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ﴾ ، وە (خوا) لێتان دەبووری (لەو هەموو دژایەتیی كردنەتان بۆ ئیسلامو مسولمانان) ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ ، وە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

ئەوە ئەگەر خێرو چاكەو نیازو مەبەستێكی چاكیان لە دڵدا هەبێ .

﴿وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدۡ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ﴾ ، وە ئەگەر بیانەوێ ناپاكییت بەرانبەر بكەن ، ئەوە پێشتر ناپاكییان بەرانبەر بە خوا كرد ، چونكە دیارە هەر كامێك لەو دیلانە پەیمانیان لێوەردەگیرا ، كە جارێكی دی شەڕ لە دژی ئیسلامو مسولمانان نەكەنەوە ، وە هەبووە هەر بۆ خۆی خۆبەخشانە دەیگوت : من جارێكی دی سەنگەر دژی ئێوە ناگرم ، ئنجا ئەگەر بێتو ئەو پەیمانە هەڵوەشێننەوە ، ئەوە پێشتر ناپاكییان بەو پەیمانەكە كرد ، بە خوا دابوویان ، كام پەیمانە ؟ ئەو پەیمانەی كە خوا بە سروشت لە هەموو مرۆڤەكانی وەرگرتوە ، كە خوای خۆیان بناسنو ملكەچی بن ، ﴿فَأَمۡكَنَ مِنۡهُمۡ﴾ ، خوای باڵادەستیش ئێوەی بەسەر واندا زاڵ كرد ، لە ئەنجامی ئەوەدا كە خیانەتیان بە پەیمانی خوا كرد ، واتە : تامی خیانەتو ناپاكییو پەیمان هەڵوەشاندنەوەیان چێشتوە ، واتە : ئەگەر دەیانەوێ جارێكی دی خیانەت بكەن ، با بیر لە ڕابردوو بكەنەوە ، كە خوا چی پێكردن بەهۆی ئەو پەیمان شكاندنەوە ، ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ ، وە خوا زانای كاربەجێیە .

## چـەند مەسـەلەیەكـی گرنـگ

**مەسـەلـەی یەكـەم** : كـە دەفـەرموێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ ، پێشـتریش باسمان كرد ، وشەی (حسب) واتە : (كـافِي) ، یانی : بەس ، ئنجا مانای ڕاستی ئـەم ئایەتـە موبارەكـە ، كـە زۆربـەی هـەرەزۆر توێژەرەوان لەسەری ڕێككەوتوون ، ئەوەیە كە : ئەی پێغەمبەر ! خـوا بـۆ تـۆش و بۆ ئـەو بڕوادارانـەش كە شوێنت كەوتوون ، بەسـە .

شایانی باسە هەندێكیش گوتوویانە : خوا بۆ تۆ بەسە ، وە ئەو بڕوادارانەش كە شوێنت كەوتوون ، بۆ تۆ بەسن ، بـەڵام لە ڕووی عەقیدەییەوە ، ئـەو مانایـە هەڵەیە ، هەرچەندە (سیبویه) گوتوویەتی : لە ڕووی زمانەوانییەوە ئەم مانایە ڕاستترە ، جا دەڵێ : ئبنو تـەیمییە لەگەڵ ئـەبو حەییانی ئـەندەلووسی دا، كـە ئەویش خاوەنی تەفسیرێكە بە ناوی (البحر المحيط) ، سەرەتا ئەبوحەییان زۆر ڕێـزی ئیبنو تەیمییەی گرتووە ، زۆر پێی سەر سام بووە ، بـەڵام ڕۆژێك مشتومڕێكیان دەبێ لەسەر ئـەم ئایەتـە ، ئیبنو تـەیمییە دەڵێ : مانای ڕاستی ئـەم ئایەتـە ئەوەیـە : كـە خـوا بـۆ تـۆش و بـۆ ئـەو بڕوادارانـەی كـە شـوێنت كەوتوون بـەسە ، ئەبو حەییانیش دەڵێ : بەڵام (سیبویه) لە كتێبی (الكتاب)دا دەڵێ : لە ڕووی زمانەوانییەوە مانای دووەمیان ڕاستە ، واتە : خوا بۆ تۆ بەسە ، وە ئەو بڕوادارانەش كە شوێنت كەوتوون ، بۆ تۆ بەسن ، ئیبنو تەیمییەش دەڵێ : ئنجا خۆ (سیبویه) پێغەمبەر نیە ، هەر لە : (الكتاب)دا جگە لەوە هەڵەیە ، هەشتا هەڵەی دی تێدایە كە تۆ نایزانی ! (دیارە ئەو زانایەش دڵی لە ئیبنو تەیمییە دەڕەنجێ و ، لەوەدوا بە خراپ باسی كردوە) .

كە لە ڕاستییدا قسەكەی ئیبنو تەیمییە جوانترە ، چونكە لە هەموو قورئاندا وشەی (حسب) تەنیا بۆ خوای بالادەست بەكارهاتوە ، با تەماشا بكەین :

١) ﴿ قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾الزمر ، واتە : بڵێ : خـوام بەسە ، پشت بەستووان تەنیا پشت بەو دەبەستن .

٢) ﭽ Ţ Ț ʒ ʒ Ȟ ȟ ŋ ɖ 8 8 Ź ʐ Ȧ ȧ Ȩ ȩ Ȫ ȫ ﭼآل عمـــران ، واتـــە : ئـەوانــەی کــە خەڵك پێیـان گوتـن : خەڵك بۆتان کۆبوونـەتـەوە ، لێیـان بتـرسـێن (لەبـەر شـەڕ لــە دژ کردنتــان) ، بــەڵام ئــەو هەڕەشــەیــە ئیمــانی زیــاد کــردن و گوتیــان : خـوامـان بـەسـە ، وە بـاشـتـرین کـار پێسپێردراو خـوایـە .

٣) ﭽ Ȫ ȫ Ǒ ǔ Ǔ ǖ Ǖ ǘ Ǘ Ǚ ǚ Ǜ ǜ ǝ Ǟ ǟ Ǡ ǡ Ǣ ǣ Ǥ ﭼالتوبـة ، واتـە : وە ئـەگـەر ئـەوانــە (واتــە : دڵنـەخۆشـەکـان) ڕازی بووبـان بــەوەی کــە خــواو پێغـەمبــەری خـوا پێیـان داون ، وە گوتبـایـان : خـوامـان بـەسـە ، لەمـەودوا خـوا لـە بەخشینـی خـۆی دەمـانداتـێ ، وە پێغـەمبـەرەکەی (پێمان دەبـەخشـێ لـە سـەروەت و سـامان) وە ئێمە ئـارەزوومـان بـەرەو لای خـوایە ، (ئـەگـەر ئـەو قسـانـەیـان گوتبـایە ، ئـەوە نیشـانـەی ئیمـان بـوو) .

ئـەگەر سـەرنج بـدرێ : وشـەی (حسب) تـەنیـا بـۆ خـوا بـەکارهـاتوە ، بـەڵام ( ) بۆ هـەردووکیـان بـەکارهـاتوە .

٤) ﭽ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥۖ ﴿٣٦﴾ ﭼالزمـــر ، واتـــە : ئـایـا خــوا بــەس نیــە بـۆ بـەندەی خــۆی ؟!

کەواتــە : هــەر مانــای یەکــەمی ئـایەتـەکــە ڕاســت و تــەواوە ، کــە زۆربــەی توێـژەرەوانیش لەسـەری یـەك دەنگـن .

**مـەسـەلـەی دووەم :** کـە دەفـەرموێ : ﭽ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمۡ عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ﭼ .

## شـیكردنـەوەی ئـایـەتـی (٦٥) لە چوار برِگـەدا

١ - جارێ وشەی (حَـرِّضِ) دەڵێ : (التَّحْرِيضُ : الحَثُّ عَلَى الشيء بِكَثْرَةِ التَّزِيينِ وَتَسْهِيلِ الخَطْبِ فِيهِ) .

(تَحْرِيض) بریتیە لە هاندانی كەسێك كە شـتێكی بـۆ جـوانو ئـاسـان بكـاتو بیـرِازێـنێـتـەوە ، بۆ ئـەوەی ئـەنـجامی بـدات .

واتـە : (ئـەی موحەممەد ﷺ!) تـۆ بـرِواداران لەسـەر جـەنگ كـردن هانـبدە ، دیــارە پێغـەمبــەری خــوا ﷺ وای كــردوە ، وەك پێشتــر بـاســمان كــردووەو ، دواییش بـاسی دەكـەین ، كە لـە چـەندان فـەرمایشـت دا ، مسـوڵمانـانـی هانـداوە بۆ ئـەوەی لـە پێنـاوی خـوادا فیداكـاریی بكـەنو گیـانیـان ببـەخشـن ، وە پاداشـتی موجـاهیدانی بـۆ بـاس كـردوون ، كـەواتـە : پێغـەمبــەری خــوا ﷺ بـە تـەواویی ئـەمـەی جێبـەجـێ كـردوە .

ئنجـا لێـرەش دا ئـەوەمان بـۆ دەردەكـەوێ ، كـە هـانـدانی خـەڵك بـۆ جـەنگو جیهـاد ، ئەركێكی گەورەی پێغـەمبـەر ﷺ بووە ، بۆیە هـەستیـاریی (حساسـیـة) هەبوون بـە جـەنگو جیهـاد ، وەك لە لایـەن هـەندێ لـە مسوڵمانانـەوە هـەیـە ، لــە ژێــر فشــارو گوشــاری دوژمنــانو نـاحــەزانی ئیسـلامـدا ، كــە دەیانــەوێ مسـوڵمانـان نینۆكیـان نـەبـێ خۆیانی پـێ بخورێـنن ، وە هـەستیـار بـوون بـەو ئـایەتو فـەرموودانـەی كە باسی جـەنگو جیهـاد دەكـەن ، لەبـەرئـەوەی هـەندێ گرووپی توندرِەوو لادەر ، رەفتاری هـەڵە دەكـەن بـە نـاوی جیـهـادەوە ، كـە دێن خـەڵك دەكوژن ، هـەڵسوكەوتی كرچو كـاڵو نـارِێك ئـەنجـام دەدەن ، ئەوانیـش لەبـەر ئـەو هەڵسـوكـەوتانـە هـەستیـاریی پەیـدا دەكـەن لــە بـەرانبـەر ئــەو ئـایـەتو فـەرموودانـەدا ، كـە بـاسی جـەنگو جیـهاد دەكـەن ، وە ئەگـەر باسـی جەنـگو جیهادیش بكـەن ، زۆر بـە شـەرمەوە بـاسی دەكـەن ، كـە بـە دڵنیـایی ئــەوە شـتێكی زۆر هـەڵـەیە ، چونكـە ئـەركی گـەورەی پێغـەمبـەر ﷺ بریتـی بووە لە هـانـدانی بـرِواداران بـۆ فیـداكـارییو جـەنگو جیهاد كـردن ، وە كـوشـتار كـردنو خـۆ بەكوشـتـدان لـە كـاتی پێویسـت دا ، كـە ئـەهلـی كـوفر شـەرِت پـێ

دەفرۆشن ، سەنگەرت لێ دەگرن و تەماعیان لە دینت ، لە ژینت ، لە خێروبێری وڵاتتدا هەیە .

بەڵام دیارە دەبێ چەمك و واتای ڕاستو دروستی كاتو شوێنی جەنگو ، جیهاد بە جوانیی ڕوون بكرێتەوە بۆ ئەوەی كە (كا) و (دان)ی ئەو بابەتە گرنگە لێك جیابكرێتەوە ، وە هەقو ناهەقێك كە لەبەرچاوی مسوڵمانان ، لەوبارەوە تێكەڵ بە یەكدی بوون ، لێك جیا بكرێنەوە .

٢ - ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە كە خوا دەفەرموێ : ﴿إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَـٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ﴾ ، ئەگەر لە ئێوە بیستی خۆڕاگر هەبن ، بەسەر دووسەد (لە دوژمنان)دا زاڵ دەبن ، كەواتە : هەم ژمارە ، هەم چۆنیەتیی ، دەبێ هەبن ، نەیفەرمووە : هەر بیست كەس لە ئێوەدا هەبن ، بەسەر دوژمندا زاڵ دەبن ، واینەفەرمووە ، كەواتە : بۆ بەرەنگاربوونەوەی دووسەد لە كافرانی شەڕفرۆش ، بەلای كەمەوە ، دەبێ بیست جەنگاوەر هەبن ، وە ئەو بیستەش دەبێ خۆڕاگربن ، یانی : هەر بە گۆترەكاریی نیە ، پێنج شەش مسوڵمان یەكسەر خۆیان بە هەزار كافر دابدەن ، ئەوە نابێ ! بەڵكو ئەگەر بیانەوێ بەرەنگاری دوو سەد كەسی كافر ببنەوە ، دەبێ بە لای كەم بیست كەس ببن ، وە ئەو بیستەش دەبێ خۆڕاگرو دامەزراوبن ، ئنجا بەسەر دوو سەددا زاڵ دەبن .

٣ - پاشان كە دەفەرموێ : ﴿وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ، وە ئەگەر لە ئێوە سەد كەس هەبن ، بەسەر هەزاردا لەوانی بێبڕوان زاڵ دەبن .

دیسان ئەو سەد كەسەش دەبێ خۆڕاگربن ، وە دەبێ لە سەدیش كەمتر نەبن ، ئنجا بەسەر هەزاردا زاڵ دەبن ، لەوانەی كە بێبڕوان .

٤ - لە كۆتاییدا دەفەرموێ : ﴿بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ﴾ ، بەهۆی ئەوەوە كە ئەوانە كۆمەڵێكن نافامن ، واتە : ئێوە ئەی مسوڵمانینە كۆمەڵێكن دەفامن .

ئنجـا زۆربـەی زانایـان وشـەی (فقـه)یـان بـە (فهـم) لـێك داوەتـەوە ، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا وانیـە ، (فقـه) بریتیـە لـە ورد تێگەیشـتن ، چونکـە (فقـه) بریتیـە لـە زانینـی شـتێك نـەزانراو ، بەهـۆی شـتێکی زانـراوەوە[1] ، کەواتـە : (فقـه) زانیـاریەکی تایبـەتتـرە لـە زانیـاریی .

هەندێـك لە زانایـان گوتوویانـە : (الفقـه : فهـم مُـراد المتكلِّم من كلامِهِ) .

یـانـی : (فقـه) بریتیـە لە تێگەیشـتنی مەبەسـتی قسـەبێـژ ، لە قسـەکەی .

جا ئـایا کافرەکـان لـە چـی تێناگـەن ؟ : نازانـن کـێ دروسـتی کـردوون ؟ نازانـن بۆچـی دروسـتی کـردوون ؟ نازانـن بۆچـی هـاتوون ؟ نـازانـن بـۆ کـوێ دەچـن ؟ نازانـن خـاوەنی ئـەم بوونـەوەرە کـێیە ؟ هـەموو ئـەو شتانـەو زۆر شـتی دیکـەش نازانـن ، بـەڵام ئێـوەی بـڕوادار بـە پێچەوانـەی وانـەوە ، هـەموو ئـەو شتانـەو زۆر شـتی دیکـەش دەزانـن ، بۆیـە بـەسـەریـانـدا زاڵ دەبـن .

ئنجـا دیـارە ئـەم حوکمـە ماوەیـەك بـەردەوام بـووە ، وە لـە جـەنگی بـەدردا مسوڵمانان بـەوە کاریـان کـردوە ، چونکـە کافرەکـان سـێ بـەرانبـەر زیـاتر بـوون لـە مسوڵمانـان ، بـەڵام لە بـەرانبـەریشیـان وەستان ، زۆر بـاشیش شـکاندنیـانن .

هـەروەها لە جـەنگی ئوحـوودیشـدا دیسـان هـەر بـەو حوکمـەی یەکـەم ڕەفتـار کـرا ، چونکـە کافرەکـان سـێ هـەزار کـەس بـوون ، وە مسـوڵمانان کـە چوونـە دەر هـەزار کـەس بـوون ، یـەك لەسـەر سـێی سـوپایەکـەش لەگـەڵ عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبـەی کـوڕی سـەلـوول گەڕایـەوە ، واتـە : دەوری سـێ سـەد ، چـوار سـەد کـەس گەڕایەوە ، مسـوڵمانان شـەش سـەد ، حەوت سـەد کـەس مانـەوە ، واتـە : ئـەو کاتەش یـەك بـە پێنـج ، بـوون ، بـەڵام لەگـەڵ ئـەوەشـدا چـونکـە چۆنیـەتییـەکـەیـان زۆر باش بوو ، شـکاندنیـانن لە سـەرەتاوە ، دوایی کە سـەرەنجامی جەنگەکـە پێچەوانـە بۆوە ، لە ئـەنجامی سـەرپێچیی کردنیـانـەوە بـوو لە فـەرمانی پێغـەمبـەر ﷺ .

وە لـە جـەنگی ئـەحزابیشـدا کافرەکـان دە هـەزار کـەس بـوون ، مسـوڵمانان بـە هـەموویانـەوە بـا هـەزار کـەس بووبن ، چونکـە جـەنگی خەنـدەق دوو سـاڵ دوای جـەنگی ئوحـوود بـوو ، ئـەو کاتـەش مسـوڵمانان ژمارەیـان وا زیـادی نـەکـردبوو ،

---

١) مفردات ألفاظ القرآن ، راغب الأصفهاني ، ص ٦٤٢.

کەواتە : لەوێش کاریان بەو حوکمە کرد ، دیارە خوای بالاَدەستیش هۆکاری دی بۆ ڕەخساندن ، کە یەکیان ئەوەبوو ترسی خستە دڵی دوژمنیانەوە .

بۆیە واپێدەچێ ئەم حوکمە کە دەفەرموێ : ﴿ ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗا ﴾ ، ماوەیەکی زیاتری پێ چووبێ، ئنجا هاتبێتە خوار ، بەلاَم لەڕووی ڕیزبەندیی ئایەتەکانەوە ، ڕاستەوخۆ لە دوای ئەم ئایەتەی پێشێ دانراوە .

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ٦٦ ﴾ .

## شیکردنەوەی ئایەتی (٦٦) لە پێنج بڕگەدا

١/ کە دەفەرموێ ﴿ ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ ﴾ واتە : ئێستا خوا لەسەری سووك کردن ، چونکە زانی کە ئێوە بێهێزییتان تێدایە ، نەیفەرمووە بێهێزن ، خۆ کۆچکەرەکانو پشتیوانە یەکەمەکان ، ئەوانەی خوا لە سوورەتی (التوبة)دا باسیان دەکاتو دەفەرموێ : ﴿ I

ư t k K t ﴾ التوبة ، واتە : پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەرو پشتیوانان ، ئەوان حاڵەتی ئیمانییان چۆن بووە ؟ بێگومان ئەگەر زیادیان نەکردبێ ، کەمیان نەکردوە ، ئنجا بێهێزییەکەش هی ئەو مسوڵمانانە بوو ، کە دوایی مسوڵمان بوون ، وە دەرفەتی ئەوە نەبووە باش پەروەردە بکرێن .

٢/ ئنجا دەفەرموێ : ﴿ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِ ﴾ ، ئەگەر لە ئێوە سەد جەنگاوەری خۆڕاگر هەبن ، بەسەر دوو سەددا زاڵ دەبن .

ئەوە ئەگەر لە حاڵەتی دەرچوونی سەرییەو كۆمەڵێكی كەم دابێ ، جاری وایە سوپایەكی كەم دەچێ بۆ چالاكییەك ، ئەگەر لە حاڵەتی زۆرییش دابێ ، ﴿وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفَيْنِ﴾ ، دیسان ئەگەر ئێوە ـ ئەی بڕوادارینە ! ـ هەزاربن ، بەسەر دوو هەزاردا زاڵ دەبن .

بەڵام بۆیە لێرە دووبارەی نەكردۆتەوە كە دەبێ خۆڕاگربن ، چونكە پێشتر باسی كردوە .

٣/ ئنجا كە دەفەرموێ : ﴿بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ ، (الإِذْنُ فِي الشَّرْعِ : فَكُّ الحَجْرِ وَإِطْلاقُ التَّصَرُّفِ لِمَنْ كانَ مَمْنُوعَاً مِنْهُ شَرْعَاً ، والإعلام بإِجازة الشيء والرّخصة فيه)[1] ،

(إذن) لە زاراوی شەرعدا بریتییە لە شتێك كە قەدەغەی لەسەر بووە ، قەدەغەكەی لەسەر لابچێ ، وە دەست ئاوەڵا بكرێتەوە بۆ هەڵسوكەوت كردن ، واتایەكی دیكەی : ڕاگەیاندنی ئەوە كە بوارو مۆڵەت هەیە بەو شێوەیە هەڵسوكەوت بكرێ ، لەو شتەدا .

كەواتە : كە لێرە دەفەرموێ : ﴿بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ ، واتە : بە مۆڵەتی خوا ، ئەگەر خوا مۆڵەتتان نەداو ، هاوكارتان نەبێ ، بێگومان یەك بە دووش ناتوانن بەرانبەری دوژمن بوەستن ، نەك یەك بە دە .

٤/ ئنجا كە دەفەرموێ : ﴿بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ ، دوو جۆرە مۆڵەت هەیە :

١) مۆڵەتی شەرعیی .

٢) مۆڵەتی كەونیی ، كە لێرەدا مەبەست پێی مۆڵەتی كەونییە ، نەك مۆڵەتی شەرعیی .

واتە : ئەگەر خوا بیەوێ یەك بە دوو بەسەر دوژمندا زاڵ دەبن ، وەك چۆن پێشێ تاكو بەهێز بوون ، یەك بە دە بەسەر دوژمندا زاڵ دەبوون ،

---

١) المعجم الوسيط ، ص ١٢.

ئێستاش بە ویستی قەدەریی خوا ، یەك بە دوو بەسەر دوژمن زاڵ دەبن ، بۆیەش دەڵێم : لێرەدا مەبەست پێی مۆڵەتی شەرعیی نیە ، چونکە مۆڵەتە شەرعییەکە ، ئەوە خوا فەرموویەتی : یەك بە دوو لە بەرانبەر دوژمن دا بوەستن ، لە حاڵەتی بێهێزیی دا ، ئەوە شەرع مۆڵەتی داوەو بڕاوەتەوە .

٥/ کە دەفەرموێ : ﴿وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ ، وە خوا لەگەڵ خۆڕاگراندایە ، ئەوە شتێکی وردی لێ وەردەگیرێ : ئەگەر کافر خۆڕاگرتربن لە مسوڵمانان ئەوان زاڵ دەبن ، چونکە خوا لەگەڵ خۆڕاگراندایە ، هەر کەسێك خۆڕاگرتر بێ ، بە پێی یاسای کەونیی خوا (سنة الله الكونية) خۆڕاگرتر سەردەکەوێ‌و ئەو یاسایە پشتی وی دەگرێ ، یاسای خوا لە ژیانی بەشەردا ئەوەیە : کە هەر کەس خۆڕاگربێ ، سەرکەوتوو دەبێ ، ئنجا مسوڵمان بێ، یان کافر ، وەك چۆن : یاسای خوایە : کەسێك مەلەوان بێ ، لە ئاوێ دا دەربازی دەبێ‌و ناخنکێ ، هەروەها یاسای خوایە : هەرکەس ڕەچاوی هۆکارەکانی تەندروستیی بکات ، لەشی ساغ دەبێ ، ئەدی ئەگەر ڕەچاویان نەکات ؟ بێگومان لەشی ساغ نابێ ، با مسوڵمانیش بێ ، ئەوانە هەموویان قانوونی کەونیین ، کە بەداخەوە زۆربەی مسوڵمانان ئەو شتانە نازانن ، یەکێکیان پێی وایە ، کە گوتی : مسوڵمانم ، ئیدی تەواو ، خوای کاربەجێ هەموو یاساکانی خۆی بۆ وی تێکدەدات ، بۆیە ئێستا مسوڵمانان ملیارو نیوێك زیاترن ، کەچی زەبوون‌و زەلیلن ، بۆچی ؟ چونکە هەم لە یاسا شەرعییەکان لایانداوە ، هەم لە یاسا کەونییەکانیش .

**مەسەلەی چوارەم** : کە دەفەرموێ : ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٦٧﴾ .

# كورتە باسێك لەبارەی ڕەوانەبوونی كوشتنی دیلانەوە

وەك پێشـتـر گوتمان : ئەگەر تەماشـای ڕواڵەتی ئەم ئـایەتە بكـەیـن ، دوو واتایان دەگـەیـەنــێ :

یەكەم : هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە دیلی هەبن ، واتە : كە دیلی گرتن ، با بیانكوژێ .

دووەم : هیچ پێغـەمبـەرێـك بۆی نیـە ، هیـچ دیلێـك بگـرێ ، بـە ئومێـدی ئـەوەی لە بـەرنبـەریـان دا قەرەبـوو وەربگـرێ ، بـەڵكو دەبـێ لە جـەنگدا بیـانكـوژێ ، نــەك دوای ئـەوەی بـە دیلـی گرتـوون ، بیـانكـوژێ .

بەڵام ئەوەی ڕێمـان لـێ دەگـرێ مانـای یەكەمی لـێوەربگـرین ، ئـەوەیە كـە خـوا دەفـەرموێ : هیـچ پێغـەمبـەرێك بۆی نیە هیچ دیلـێك بگـرێ ، تاكو كـەی ؟ ﴿حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ، هـەتا دوژمـن لـە زەوی نــەداو ، لـە پـەلو پـۆی نـەخـات ، كـەواتـە : لـێرەدا ناگونجـێ مەبـەست كـوشـتنی دیلـەكان بێ ، چونكـە : كـەی دوژمــن زۆریان لـێ دەكـوژرێو ، لە پەلو پۆ دەخرێن ؟ لە گەرمەی جەنگدا ، بەڵـێ ڕسـتـەی : ﴿حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ، لەگەڵ كوشـتاری پێش بە دیل گرتـنـدا دەگونجـێ ، نـەك لەگەڵ كـوشـتنی دوای بە دیـل گـرتـن دا .

ئنجـا ئێـمە لـە كاتــی خســتنەڕووی هــۆی هاتنــە خــوارەوەی دا ، كــە پێشــتــر هێنـامــان ، وە لـە (صـحـیح مسلم)دا هاتوە ، وە لـە مانـای گشــتی ئـایەتـەكـانیش دا باسـمان كـرد ، كـە گێـڕاوە (روایـة)یەك هەیــە ئیشكالێـكی گـەوری تێـدایە، چونكـە

لـەگـەڵ قـورئـان دا، وە لـەگـەڵ سـوننـەتو سـیـرەی پێـغـەمـبـەری خـوا ـ وەك پێشـتـریش باسـمان کـرد ـ دژ دەوەسـتـێ .

ئنجا ئێمە سەرەتا دەقی گێڕراوەکە دووبارە دێنییـنەوە ، پاشان قسـەی لەبارەوە دەکەین ، ئەو گێڕراوەیە دەڵێ : پێغەمبەری خوا به ئەبو بەکرو عومەری فەرموو: ڕاتـان چییە ؟ چی لـەو دیلانـە بکـەین ؟ ئـەبو بـەکـر گـوتی : ئـەی پێغـەمبەری خــوا ! ئەوانـە خزمـی خۆمـانو ئامـۆزای خۆمـانن ، پێـم وایـە فەرەبوویـان لـێ وەربگیـرێو ، ئـەو پارەو فـەرەبـووە بـەکـاربێـنین بۆ زیـادکردنی هێـزمان لـە دژی کافران ، وە بـەڵکو خـوای میـهـرەبـان ڕێنمایی ئـەوانـیـش بکـاتو مسوڵمان ببـن .

پێغـەمبـەری خـوا فـەرمووی : ئـەدی کـوڕی خـەتـتـاب ! تـۆ چـی دەڵـێی ؟ (عـومـەر) دەڵـێ ، گوتـم : نا ، سوێند بـە خـوا ، ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! ئـەو ڕایـەی ئـەبو بـەکـرم نیـە ، مـن پـێم وایـە ئـەوانـە بخـەیە بـەردەسـتی ئێمـەو لـە گـەردنیـان بدەیـن ، عەقیـل (کـە برای عەلی کوڕی ئـەبی تاڵیبـە) بیخـە بـەردەسـتی عەلـی بـا لـە گـەردنی بـدات ، وە فـلان کـەسـیش (کـە خزمـی عومـەر بـوو) بیـدە بـەردەستی من بـا لە گەردنی بدەمو بیکـوژم ، چونکـە ئـەوانـە پێشـەوای کـوفـرنو زلەزلانی کوفـرن ، بـا لە نێویـان بـەرین ، بـەڵام پێغـەمبـەری خـوا ئـەو ڕایـەی ئـەبو بـەکـری بـە دڵ بوو ، ئـەوەی منـی بـە دڵ نـەبوو .

دوایی لە درێـژەی ڕیوایەتـەکـەدا (عـومـەر) بـاس دەکـات کـە بـۆ بـەیـانی هـاتن ، دەڵـێ : تـەماشـام کـرد پێغـەمبـەری خـوا و ئـەبو بـەکـر دانیشـتبوون ، دەگریـان ، گوتم : ئـەی پێغـەمبـەری خـوا ! بۆچی لەگەڵ هـاوەڵەکـەت دەگریـن ؟ ئـەگـەر هۆکـارێك هـەبـێ بۆ گریـان منیش دەگـریم ، ئەگەر هۆکارێکیش نـەبـێ ، هـەر لەبـەر گریـانی ئێوە منـیش دەگریـم ، پێغـەمبــەری خــوا فـەرمووی : بۆیـە دەگــریم ، سـزادان بۆ هـاوەڵانـت بـەهـۆی ئەوەوە کـە فەرەبوویان وەرگرت ، بۆ من پێشـاندراوە ، لـەو درەخـتـە نیزیکـتـر بووە لێیـان ، ئـاماژەی بۆ درەختێـکی نیـزیکی کـرد .

دیارە ئـەم دەقە کـە لـە (صحيح مسلم)دا هاتوە ، ڕاسـتە سـەنەدەکـەی صەحیحە ، بەڵام ئـەو دەقانەی کە پاڵدەدرێنـە لای پێغـەمبەری خـوا ، دەبـێ هـەم لـە ڕووی زنجیـرەی ڕاوییەکـانەوە ، هـەم لـە ڕووی مەتنـەوەش ، ڕاسـت بـن ، بۆیـەش زۆر لـە زانایان ، ژمارەیەك لە دەقەکانی سوننـەت ڕەت دەکـەنەوە ، کـە هەرچەنـدە لـە ڕووی

زنجیـرەی ڕاوییەکانەوە تـەواون ، بـەڵام بـەهـۆی ئـەوەوە کـە لـە ڕووی نێـوەڕۆکـەوە لەگـەڵ قورئان دا ناگونجێن ، وە لەگەڵ ڕووحی شەریعەت دا ناگونجێن ، بۆیە ئێمەش ناتوانیـن ئەو ڕایەی یەکەم بۆ تەفسیـری ئایەتەکە ، بە پشت بەسـتن بە گێڕراوەکەی (مسـلم) بسـەلمێنیـنو وەربگرین ، کە دەڵێ : خوا ڕەخنەی لە پێغـەمبەری خوا گرتوە ، لەسەر ئەوەی کە دیلەکانی نەکوشـتوونو قەرەبووی لێوەرگرتوون ، بۆچی ؟ چونکـە ئـایەتی ژمارە (٤) لە سـوورەتی (محمـد)دا زۆر بـە ڕوونو ڕاشـکاویـی بۆمـان دەخاتەڕوو ، کە مامەڵەکردنی ئەهلـی ئیسـلام ، لەگەڵ دیلـی کافران دا ، تـەنیـا دوو حالەتی هـەن :

١/ یـان دەبـێ بـە بـەلاش بـەریـان بـدەن .

٢/ یـان بـە قەرەبوو ، هیچ بواری دیکـەی تێدانیـە .

خـوا دەفـەرموێ : ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ﴿٤﴾﴾، واتە : ئەگەر بەرەنگاری کـافرەکـان بوونـەوە ، لە جەنگدا ، لە گەردنیـان بدەن ، هـەتا کـاتێـك کـە خەستتان کردنو لە پەلو پۆتان خستنو زۆرتـان لـێ کوشــتن ، ئنجـا کـەلـەپچەیـان بکـەن ، ئنجا دوای ئـەوەی بـە دیلـتـان گرتوون ، یـان بـە منـەت بـەریـان بـدەن ، یـان بـە بـەرانبـەرو قـەرەبوو ، هـەتا جـەنگ نامێنـێو قورساییەکانی دادەنـێ (لـە نێـوان ئێـوەو کـافراندا) .

وەك دەبینیـن : خـوای زانـاو توانا هیچ بواری تێدا نەهێشتۆتـەوە ، کـە بگـوتـرێ : خـوا ڕەخنـەی لە هـاوەڵانو پێغـەمبــەری خــوا گرتـوە ، کـە بۆچی دیلەکانیـان نەکوشــتوون ؟ بەڵکو ڕەخنەکە لەبەر ئـەوە بووە ، کە نەدەبوو بە دیلیـان بگـرن ، تاکو لـە پـەلو پۆیـان دەخســتنو زۆریـان لـێ دەکوشـتن .

ئنجـا کـە خــوا دەفـەرموێ : ﴿تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾﴾ ، واتـە : سـامانی دنیـاتان دەوێو ، خــواش ڕۆژی دوایـی دەوێ ، وە خـوا زاڵـی کـارزانـە .

ئەمەش یانـی : هاوەڵان بۆیە بـە دیلیـان گرتوون ، تاكو لە بـەرانبـەردا ، قـەرەبوو وەربگـرن ، یانـی : بـە هانـدەری وەرگرتنـی قەرەبـوو ، بـە دیلیـان گرتـوون ، بۆیـە خـوای كاربـەجێ ڕەخنـەی لـێگـرتوون .

ئنجـا لـە سـوورەتی (الأنفـال)دا دەفـەرموێ : ﴿حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ، واتـە : هەتا دوژمن لە زەوی نـەدرێ‌و لە پەل‌و پۆ نەخرێ (بە دیلیـان مەگـرن) ، وە لـە سـوورەتی (محمـد)یـش دا دەفـەرموێ : ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ﴾ ، واتــە : هـەتا كاتێك كە كوشتاری خەستتان لـێكـردن ، ئنجا بـە دیلیـان بگـرن ، كەواتـە : ئـەم دوو ئـایەتـە ڕێك پشتگیـریی یەكدی دەكەن ، واتـە : پـێش كوشـتاری خەستو لـە پـەل‌و پـۆ خسـتن ، دروسـت نیە بـە دیل بگـیـرێن ، بـەڵام پاش كوشـتاری خەستو لە پـەل‌و پـۆ خسـتن ، دروسـتـە ، بـە دیلیان بگـرن .

وە سوننەتی كردەیی پێغەمبـەری خـواش هەر وایە ، دیلی نەكوشتوون ، نەك هەر لە جەنگی بـەدردا ، بەڵكو دواییش دیلـەكانی نـەكوشتوون ، یان بە قەرەبـوو ، بەریـداون یـان بـە خۆڕایـی ، لە فـەتحـی مەككـەدا ، دوو هـەزار لە قوڕەیشییەكـان لـە مزگـەوتی حـەڕام دا بـە دیل گیـران ، فـەرمووی : پێتان وایە چیتان لـێ دەكـەم .

گوتیـان : ﴿خَيْرًا أَخٌ كَرِيمٌ ، وَابْنُ أَخٍ كَرِيمٍ﴾ .

ئـــەویش فـــەرمووی : ﴿اذْهَبُـوا فَأَنْتُمُ الطُّلَـقَاءُ﴾ {أَخْرَجَـهُ البَيْهَقِـي ، فِـي (الكُبْـرَى) ، برقم : (١٨٧٣٩)} .

واتـە : بـڕۆن ئێـوە ئـازادن ، ئـازادی كـردن .

ئنجـا بێـگومان ئــەو هەڵوێسـتەی ئـازادكردنـی دیلــەكان لـە فەتحـی مەككـەو جەنگەكـانی دیكـەش دا ، بەڵگـەیەكی بەهێـزی یەكلاییـكەرەوە (حاسم)یـە لەسـەر ئەوە كە ئایەتـەكـەی (الأنفـال) گلـەیی نیـە لـە پێغەمبـەری خـوا و هـاوەڵانـی بەهـۆی نەكوشتنـی دیلـەكانـی جەنگـی بەدرەوە، چونكە ئەگـەر وابووایـە ، لـەوەو دوا پێغـەمبـەری خـوا هیـچ دیـلێـكی جـەب نـەدەداو قەرەبووشـی لـیـۆەرنەدەگـرتن ، بەڵكو هەموویـانی دەكوشت ، بۆئـەوەی جارێـكی دیكە گلەیـی نەیەتەسـەر ، بەهـۆی نەكوشـتنـی دیلانـەوە !!

**مەسـەلـەی پێـنجـەم** : کـە دەفـەرمـوێ : ﴿ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ ﴾ ، ئـەگـەر لەبـەر ئـەوە نـەبووایە بڕیـارێك لـە خـواوە تێپـەڕیوە ، ئــەوە بـەهـۆی ئـەوەوە کـە وەرتـان گـرت ، ئـازارێکـی مەزنتـان تووش دەبـوو .

زانایان چەنـد واتایەکیـان بـۆ ئـەم ئایـەتە لـێکداونـەوە :

١ / واتـە : ئـەو بڕیارەی خـوا تێپـەڕیوە ، کـە سزای کـەس نادات ، تاکو ئـەوەی دەبـێ خـۆی لـێ بپارێـزێ ، بـۆی ڕوون نـەکاتـەوە ، وەك خـوا دەفـەرموێ : ﴿ Ū Æ ā Ā ã Ä ə ù Ù ŭ Ŭ ú Ú ű Ķ ğ Ğ g G æ ﴾ التـوبـة .

٢ / واتـە : خـوا بڕیـاری داوە ، مسولـْمانـانی بـەشـداری جـەنگی بـەدر ، سـزا نـادات ، وەك لە فـەرمایشتێـك دا هاتوە ، پێغـەمبـەری خـوا فـەرموویەتی :

﴿لَعَـلَّ اللهُ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ ، فَقَـالَ : اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ ، فَقَدْ غَـفَرْتُ لَكُمْ﴾ {أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد ، برقـم : (٦٠٠) ، وَالبُخَـارِيُّ ، بـرقم : (٢٨٤٥) ، وَمُسْلِمٌ ، بـرقم : (٢٤٩٤) ، وَأَبُـو دَاوُدَ ، بـرقم : (٢٦٥٠) ، وَالتِّرمِـذِيُّ ، بـرقم : (٣٣٠٥) وَقَـالَ : حَسَـن صَحِيح ، وَأَخْرَجَهُ أَيْضا : الحُمَيْدِيُّ ، برقم : (٤٩) ، وَابْنُ حِبانَ ، برقم : (٦٤٩٩)} .

واتــە : خــوای پەروەردگـار تـەماشــای ئـەهلــی بــەدری کــرد ، فــەرمووی : هـەرچی دەکـەن ، بیکـەن ، من لـێتـان خـۆش بـووم .

٣ / واتـە : لە زانیاریی خـوا لە (لَوح الـمَحْفُوظ)دا تێپەڕیوە ، کە قـەرەبوو (فـديـة)ی لە بـەرانبـەر بەردانـی دیلـدا بۆ حەڵاڵ دەکردن ، واتـە : ئـەو بڕیـارە هـەر دەدرا .

٤ / واتـە : کـەسـێك کـە کۆشـش دەکـات ، بـا بـە هـەڵـەش دابچـێ ، خـوای دادگـەر سـزای نـادات ، بـەڵکـو لەسـەر کۆشـش کردنـەکـەی پاداشـتی هــەیە ، وەك پێغـەمبـەری خـوا فـەرموویـەتی :

﴿إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ فَأَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ ، فَلَهُ أَجْرٌ﴾ (أَخْرَجَهُ أَحْمَد ، بِرقم : (١٧٨٠٩) ، وَالبُخَارِيُّ ، بِرقم : (٦٩١٩) ، وَمُسْلِمٌ ، بِرقم : (١٧١٦) ، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم : (٣٥٧٤) ، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم : (١٣٢٦) وَابْنُ حِبانَ برقم : (٥٠٦٠)}.

واتـە : هەرکـات حوکـمڕان کۆششـی کـردو پێـکای، دوو پاداشـتی هـەن، وە ئەگەر کۆششی کردو نەیپێکا پاداشتێکی هەیە .

٥ / یاخود لەبەر ئەوەی لـە کتێبـی خـوادا تێپـەڕیوە ، کـە خـوا دەفـەرموێ :

ﭽ ô Ȑ ř Ř Ữ ù Û û Ş ş Ţ

ţ 3 ﭼ الأنفال ، واتـە : بـەڵام بڕیـاری خوایـە کـە هەتـا تۆیـان (ئەی موحەممەد !) لە نێودابـی ، ئـازاریـان نـادات ، وە هـەتا داوای لـێبوردن (لـە خـوا بکەن) ئـازاردەریان نـابـێ .

**مەسەلەی شەشەم** : کـە دەفـەرموێ : ﭽ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمۡتُمۡ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٦٩﴾ ﭼ ، کـە دەفـەرموێ : ﭽ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمۡتُمۡ ﭼ ، لـەوەی دەسـتکەوتتان بـووە ، بخـۆن ، مەبـەست دەستکـەوتی جـەنگی بـەدرە ، یـان مەبـەسـت قەرەبـووی بـەرانبـەر دیلـەکانـە ، وا پێدەچـێ زیـاتر مەبـەسـت پێـی قەرەبـووەکـە بـێ ، بـەڵام بۆچـی دەفـەرموێ : دەسـتکـەوتتان بـووە ، چونکـە ئـەو دیـلانـە لە جەنگی بـەدردا گیـران ، وە ئـەو قـەرەبووانـەش کـە وەردەگیـرێن ، بـە بـەشێك لە دەسـتکەوتـی جـەنگیی دادەنـرێن .

منیش ڕام وایە مەبەست هەردووکیانە : دەستکەوتەکانی جەنگو ، قـەرەبووەکانی دیلـەکانی ﭽ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمۡتُمۡ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ ﭼ ، واتـە : بخـۆن لـەوەی کـە بۆتـە دەستکـەوتتـان ، بۆتـان حـەڵاڵە ، وە پاكو چاکە .

حـەڵاڵ لـە ڕووی شەرعییـەوە ، واتـە : حـەرام نیـە ، وە (طیب) واتـە : لـە ڕووی خـودی ئـەو ڕزقو ڕۆزییـەوە ، بـێ گرفتـە لـە ڕووی تـەندروسـتییـەوە ، چونکـە

هەندێـك لـە زانايـان وشـەی (طيـب)يـان بـە حـەڵاڵ لێكداوەتـەوە ، بـەڵام وانيـە ، چونكـە لێـرەدا هـەردوو وشـەی (حـلال) و (طيـب) پێكـەوە هـاتوونو ، ناشـگونجێ هەردووكيـان هـەر بە مانای حەڵاڵ بن ، چونكـە دەبێتـە دووبـارە ، بـەڵكو مەبـەست پێـی ئـەوەيە : كـە شـێوازی دەستكـەوتنی ئـەو مـاڵە حەڵاڵـەو لـە ڕێگەيـەكـی شـەرعييـەوە بـووە ، وە (طيـب)يشە ، يـانـی : خـۆشو بـەتـامو سـوودبـەخشـەو ، لـە خودی خۆيدا ئيشكالێكی ماددیی تێدانيـە .

(راغب) دەڵـێ : (أَصـلُ الطـَيِّبِ : مَـا تَسْتَلِـذُّهُ الحَـوَاسُّ ، وَمَـا تَسْتَلِـذُّهُ الـنَّفسُ ، وفي الشَّـرْعِ : مَا كـانَ مُتَنَاوَلاً مِنْ حَيْثُ مَا يَجُـوزُ) .

واتـە : ئـەسـڵی (طَيِّب) هەر شـتێكـە كـە هەسـتـەكـان چێـژی لـێوەرگـرن ، وە نـەفسی ئينسـان چێـژی لـێوەربگرێ ، وە (طَيِّب) لە ڕووی شـەرعـەوە ، هەر شـتێكە كە شـەرع ڕێيـدابـێ ئەو شـتـە وەربگيـرێو بەكاربهێنـرێ .

هـەرچەندە لە بـەكارهـێنـانی قورئـاندا وشـەی : (طَيِّب) بـە مـانـای حـەڵاڵ نيـە ، بـۆ وێنـە كـە خـوای پەروەردگـار دەفـەرموێ : چ      چ à À ǿ Ǿ ، ئـەمـڕۆ (طَيِّب)ەكـان بـۆ ئێـوە حـەڵاڵ كـراون ، جـا ئـەگـەر (طَيِّبـات) بـە مـانـای حـەڵاڵ بـێ ، دەبـێ بڵێـی : (أُحِلَّ لَكُم الحَلالُ) حەڵاڵـتـان بـۆ حـەڵاڵ كـراوە ، كـە ئـەوەش تـەعبيـرێـكی نـاڕێكـە ، بـەڵكـو (طَيِّب) واتـە : شـتـی خـۆشو بـە تـامو سـوودبـەخش .

كە دەفـەرموێ : ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ ، وە پـارێز لـە خـوا بكـەن ، واتـە : پارێـز بكـەنو شـتێك كـە قـەدەغەيـە توخـنی مەكـەون ، وە شـتـێك كە حـەڵاڵـە لـێی بەهـرەمەنـد بـن ، وە بێگـومان خـوا لـێبـوردەی بـە بـەزەيـی يە .

كـە دەفـەرموێ : ﴿ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمۡتُمۡ ﴾ ، بۆچـی دەفـەرموێ : لـێی بخـۆن ؟ چونكـە خـواردنو خـواردنـەوە ، ئـامانجی سـەرەكـيی هەبـوونـی سـەروەتو سـامانە ، وە بـە بـێ ئـەو دووە ، مرۆڤ نـازی ، ئـەگـەرنا مـەرج نيـە ئـەو سـەروەتو سامانـە ، ئنجا هـەرچی هـەيە ، تەنيـا بۆ خـواردنو خـواردنـەوە بەكاربـێ ، وە ژيان گـوزەرانـی

مرۆڤیش تەنیا بە خواردن‌و خواردنەوە بەڕێوە ناچێ ، بەڵام مەبەستی سەرەكیی لە سەرووەت‌و سامان پەیداكردنی خواردن‌و خواردنەوەیەو ، بەبێ شتەكانی دیكە ، ڕەنگە هەر چۆن بێ ، مرۆڤ بەردەوام بێ ، بەڵام بەبێ خواردن‌و خواردنەوە بەردەوام نابێ .

**مەسەلەی حەوتەم** : كە دەفەرموێ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٠﴾ ، ئەی پێغەمبەر ! بەو دیلانە بڵێ : كە بە دەستتانەوەن ، ئەگەر خوا چاكەتان لەدڵدا بزانێ ، لەوە باشتر كە لێتان وەرگیراوە ، پێتان دەبەخشێ ، وە لێشتان دەبووری ، بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە .

## شیكردنەوەی ئایەتی (٧٠) لە سێ بڕگەدا

مانای ئەم ئایەتە ، لە سێ بڕگەدا شی دەكەینەوە :

١ / كە دەفەرموێ : ﴿إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا﴾ ، ئەگەر خوا چاكەتان لە دڵدا بزانێ ، بۆچی ئەم تەعبیرە بەكارهاتوە ؟ چونكە هەرچی لە دڵی مرۆڤدا هەبێ ، خوای پەنهانزان دەیزانێ ، كەواتە : ماناكەی ئاوای لێدێتەوە ، ئەگەر نیازو مەبەستێكی چاكتان هەبێ ، كە خوا دەیزانێ ، ئەوە خوای بەبەزەیی ، باشتر لەو قەرەبووەی كە خۆتان پێ كڕیوەتەوە ، پێتان دەبەخشێ ، لە داهاتوودا دەوڵەمەندتان دەكات .

ئایا مەبەست لە وشەی (خَيۡرٗا ) چییە ؟ دەڵێین :

١) مەبەست پێی ئەوەیە ئەگەر ڕاست بكەن لە ئیددیعای ئیمان دا ، چونكە هەندێكیان دەیانگوت : ئێمە پێشتر ئیمانمان هەبووە ، یەكێك لەوانە عەبباسی مامی پێغەمبەر ﷺ وای گوت ، گوتی : من پێشتر ئیمانم هەبووە ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوەی لە دڵت دا بووە ، خوا

دەیـزانـێ ، بـەڵام بـە ڕواڵـەت لـە دژی ئێمـە بـووی ، بۆیـە قـەرەبووت لـێ وەردەگـریـن لە بـەرانبـەر ئـازادکـردنتـدا .

٢) وە دەگونجـێ مەبـەست پێی ئـەوەبـێ ، کە ئـەگەر ئێستاش ئیمـانتان نـەبـێ ، دوایـی ئیمـان بێـنـن .

٢ / ئەگـەر نیـازی چاکـتان هەبـێ ، کـە جارێکـی دی سەنگـەر لـە ئیسـلامو مسـوڵمانان نـەگـرن ، ئـەوکـاتـە خـوا بـە پێـی نیـازی چاکـی دڵـتان مامەڵەتـان لەگـەڵدا دەکـات ، بـا مسـوڵـمانیش نـەبـن ، چونکـە خـوا لـە دنیـادا وەك یـەك مامەڵە لەگەڵ بەشـەردا دەکات ، چونکە هەندێ کەس وادەزانێ لە دنیـادا ، بـەزەیی خـوا تایبـەتـە بـە ئـەهلـی ئیمانـەوە ، نـەخێـر ، وانیـە ، خـوا دەفەرمـوێ :

ﭽ...

ﭽالأعــراف ، واتــە : بەزەیــی مــن هەموو شـتێکی گرتۆتـەوە لە دنیـادا ، (کـافـرو مسولـمان دەگرێتـەوە ، بـەڵام) بـۆ قیـامەت بـەزەیی خۆم تایبـەت دەکـەم بـەوانـەوە کـە پارێـز دەکـەن ، وە خـۆیـان تـەزکیـە ، (یـان زەکـات دەدەن) ، وە بڕوا بـە ئـایەتـەکانی ئێمـە دێـنـن .

پێشتـر لە سـوورەتی (النساء) لە تەفسیـری ئەم ئایەتەدا ، خوا دەفەرموێ :

ﭽ 8 Ȥ ȥ Ȧ ȧ Ȩ ȩ Ȫ ﭼ ، واتـە : ئـەگـەر سـڵاوتان لێکـرا (لە هـەر لایەکەوە بوو ، بـە هـەر شـێوەیەك بـوو) ، بـە بـاشـتـر لـە خـۆی ، یـان وەك خـۆی وەڵامی بدەنـەوە .

ئـەو شـوێنـەوارەمان هێـنا ، کـە شـەعبیـی (یەکێکـە لـە زانایـانی تابیعـین) نـەصـرانییـەك سـڵاوی لێـکـرد ئـەویش گـوتی : (وعَلَيْـكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَـةُ اللّهِ) سـەلامو ڕەحمەتی خـوات لـێ بێ ، لەوبـارەوە پرسـیـاریان لـێکرد : چۆن ڕەحمـەتی خـوای بۆ دەنێـرێ ؟

گـوتـی : (أَلَيْسَ فِي رَحْمِةِ اللّهِ يَعِيش) ئـەدی ئـەوە نیـە لە ڕەحمـەتی خـوای ادا دەژی ! واتـە : ئـەگەر بـە ڕەحمـەتی خوا نـەبـێ نـاژی ، بـاران دەبـارێ ڕەحمـەتی

خوایە ، خوا لەشی ساغ كردوە ، ڕەحمەتی خوایە ، منداڵی داوەتێ ڕەحمەتی خوایە ، ڕزقی دەدا ، ڕەحمەتی خوایە ... هتد .

٣ / كە دەفەرمویێ : ﴿يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ﴾ ، واتە : باشتر لەوەی لێتان وەرگیراوە، دەتانداتێ ، لێرەدا مەبەست لە دیلەكانە كە لە بەرانبەر بەردران دا ، فەرەبوویان لێوەرگیرا ، ئەو كەسەی زۆرترین ئەندازەی لێوەرگیرا چوار هەزار درەمی زیو بوو ، كە ئەو كاتە دە درەم دینارێكی زێڕ بووە ، درەمی زیو ، دراوی فارس بووە ، دیناری زێڕ ، دراوی ڕۆمەكان بووە ، هەر دینارێكی زێڕ بەرانبەری دە درەم ، یان دوازدە درەمی زیو بووە ، دیارە لە هۆی هاتنە خوارەوەكەی دا باسمان كرد ، دەقێكمان هێنا ئێستاش دووبارە دەیهێنین : ﴿عَنِ ابْنِ عَباسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا فِي قَولِهِ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ﴾ ، كَانَ العَباسُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ، قَدْ أُسِرَ يَوْمَ بَدْرٍ ، فَافْتَدَى نَفْسَهُ بِأَربَعِينَ أُوقِيةً مِنْ ذَهَبٍ ، فَقَالَ العَباسُ حِيْنَ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ : لَقَدْ أَعْطَانِي اللّٰه تَعَالَى خَصْلَتَيْنِ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهِمَا الدُّنيا ، إنِّي أُسِرْتُ يَوْمَ بَدْرٍ ، فَفَدَيْتُ نَفْسِي بِأَربَعِينَ أُوقِيةً ذَهَبًا ، فَأَعْطَانِي اللّٰهُ أَرْبَعِينَ عَبْداً ، وَإِنِّي أَرْجُو المَغْفِرَةَ الَّتِي وَعَدَنَا اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ﴾ {أَخْرَجَهُ الطَّبَرِي ، ج ١٠ ، ص ٣٥ ، وَابْنُ أَبِي حَاتِم فِي تفسيره ، برقم : (٩١٧٨) ، وَابْنُ المُنْذِرِ وَابْنُ مَرْدَوِيَة فِي تفسيرهما كما فِي (الدر المنثور) ، ج ٤ ، ص ١١٢ ، وَالبَيْهَقِي فِي (الدلائل)، ج ٣ ، ص ١٤٣ } .

واتە : عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ ، لەبارەی ئەم ئایەتەوە : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ﴾، دەڵێ : عەبباس خوا لێی ڕازی بێ (كە دەكاتە بابی عەبدوڵڵا) بە دیل گیرا لە جەنگی بەدردا ، خۆی كڕیەوە بە چل ئوقیە زێڕ ، عەبباس خوا لێی ڕازی دەڵێ : دوای ئەوەی ئەم ئایەتە هاتە خوار ، خوای بەرز دوو شتی پێداوم ، لە دنیادا پێم لە هەموو شت چاكترن ، ئەوانیش ، ئەوەیە كە دەفەرمویێ : خوا لەگەڵیان بە بەزەییەو ، لێیان دەبووریێ ، دەڵێ : من لە جەنگی بەدردا بە دیل گیرام و خۆم

كرِیـەوە بـە چل ئوقیـە زێـڕ ، دوایـی خـوای دەوڵەمەنـدی كـردم ، مـن ئێستا چـل كـۆیلەم هـەیـە[1] ، (لــە ڕیوایـەتێكـی دی دا گوتــوویەتی : هــەر چلیـان بـازرگـانییـم بۆ دەكـەن) ، وە من بـە ئومێدی ئـەو لـێبوردنـەشـم كـە خـوای زاڵو پایەدار گـفـتـی پێداویـن .

كـەواتـە : عەبباس خـوا لـێی ڕازی بـێ ، یەكێكە لەوانـەی كـە خـوا گفتـەكـەی بـۆ هێنـاونـە دی ، چونكە دوای ئـەوەی كـە مسـولْمـان بـوو ، زۆر دەوڵەمەنـد بــوو .

**مەسـەلـەی هەشـتـەم** : كـە دەفـەرموێ : ﭽ وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ ﭼ ، ئـەگــــەر نیـــەتی بـــاش‌و مەبـەســتی بـاشیـان لـە دڵ هەبـێ ، }ئنجـا چ ئیمـان بێنــن ، چ بڕیـار بــدەن دژایەتیـی ئیسـلام‌و مسولْمانان نەكەن{ ئـەوە خوا بـە پێی ئـەو نیـەتـە چاكـەی خۆیان ، خـوا مـامەڵـەیـان لەگەڵ دەكـات ، بـەڵام ئـەگەر بیانـەوێ ناپاكییـت لەگـەڵ بكـەن ، پێشـتـر پەیمـانیـان لەگەڵ خـوا شـكـاندو ، خیانـەتیان بـە خـوا كرد ، خـوای بـاڵادەسـت ئێوەی بـەسـەر ئـەوانـدا زاڵ كـرد ، وە خـوا زانـای كـارزانـە .

زمـانـزانان گوتـوویـانە : (الخِيانة : نَقْضُ العَهْدِ) ، (خِيانة) پەیـمان شـكـاندنـە ، ئنجا ئـایا ئـەوانـە چ پەیمـانێكـیان پێشـتـر لەگەڵ خـوادا شكـاندوە ؟ زۆر سـەرنجـی تـەفسیـرەكـانم دا ، وەڵامـی ئـەو پرسیـارەم نـەكـەوتـە پێش چـاو ، بـەڵام وا پێدەچـێ مەبـەسـت ئـەو پەیمـانـە خـوازراوـكـە بـێ ، كـە خـوا لە سـوورەتی (الأعراف)دا بـاسـی دەكـات ، كـە دەفـەرموێ : ﭽ Y U Ʊ ɰ Ư Ʈ ƭ Ƭ ƫ

ɣ Ʒ ʑ Ʒ Ʒ ʒ Ʒ ƻ ƽ ʦ p l ﭼﭽ !

DžDŽ LJdž Lj ﭼ ، واتــە : وە یــاد بكــەوە كــاتێك پەروەردگــارت وەچــەی ئادەمــزادانی لــە پشــتیان وەرگــرت‌و لەســەر خۆیــانی كردنــە شــایەد (فەرمووی :) ئـایا من پەروەردگـارتـان نیـم ؟

---

١) ئەو كاتە ئەو شتەی گێڕاوەتەوە ، كە جەنگی بەدر كۆتایی هاتووە بووەتە مسولْمان .

گوتیـان : بـا ! شـایەدییمـان دا ، (بۆیـەش وامانکـرد) نـەوەك ڕۆژی قیامەتـێ بڵێن : ئێمە لەم (ڕاستیی)ە بێئاگا بووین .

بەڵێ هەر کەسێك پێچەوانەی ئایینی خوا مامەڵە بکاتو ، دژایەتیی خواو پێغەمبەرانی خوا بکات ، ئەوە پێچەوانەی سروشتی خۆیەتی ، پێچەوانەی ئەو سروشت (فطرة)ەیەتی کە وەك پەیمانی لێوەرگیرابێ وایە ، چونکە هەموو کەسێك لە دەروونی خۆیدا ، خوای خۆیو خاوەنی خۆی دەناسێ .

ئنجا دەفەرموێ : ئەگەر بیانەوێ ناپاکییت لەگەڵ بکەن ، پێشتر پەیمانیان لەگەڵ خوادا شکاندو ، خیانەتیان بە خوا کرد ، وە خوای بالادەست ئێوەی بەسەر ئەواندا زاڵ کرد .

کەواتە : ئەگەر جارێکی دیکە ناپاکییو خیانەتت لەگەڵ بکەن ، ئەوە خوای بالادەست هەر ئامادەیە ، دووبارە تۆڵەیان لێ بستێنێ .

ئنجا لێرەدا دەپرسین : ئایا پێغەمبەر پەیمانێکی لێوەرگرتوون ؟ وا پێدەچێ هەموو ئەوانەی کە ئازاد کراونو ، قەرەبوویان لێوەرگیراوە ، بەڵێنیشیان دابێ کە جارێکی دی سەنگەر لە دژی ئیسلامو مسوڵمانان نەگرن ، وا پێدەچی ئەو بەڵێنەیان دابێو ئەو پەیمانەیان لێوەرگیرابێ ، هەرچەندە لەوبارەوە شتێکی جێی دڵنیاییم نەدیوە ، بۆیەش دەڵێم : واپێدەچێ .

ئنجا لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ : ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ ، وە خوا زانای کارزانە ، زانایە ، دەزانێ چۆن مامەڵە لەگەڵ بەندەکانی دا دەکات ، وە کارزانە ، هەر شتێك لە شوێنی خۆیدا ، وە هەر هەڵوێستە لە شوێنی خۆیدا بەکاردێنێ بەرانبەر بەندەکانی ، چ چاکەکار بن ، چ خراپەکار .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ ، وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان کە دەرسی کۆتایی یە لە سوورەتی ئەنفال ، لە چوار ئایەت پێکدێ ، کە بریتین لە ئایەتەکانی : (٧٢ تا ٧٥) ، بابەتی ئەو چوار ئایەتەش بریتیە لە دۆستایەتییو پەیوەندیی نێوان بڕواداران ، بە هەموو پێکهاتە جۆراو جۆرەکانیانەوە ، لە نێو خۆیاندا ، هەروەها پەیوەندیی ئەهلی کوفر لە نێو خۆیانداو ، ئەوانەیان کە پەیمانیان لەگەڵ ئیمانداراندا هەیە ، لەگەڵ کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی دا .

سەرەتا خوای زاناو توانا ڕایدەگەیەنێ ، کە بڕوادارانی کۆچکەرو پشتیوان ، دۆستو پشتیوانی یەکدین ، بەڵام بڕوادارانێك کە کۆچیان نەکردووە ، نەهاتوونە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییەوە : قەوارەی ئیسلامیی بەرانبەریان بەرپرسیار نیە ، مەگەر ستەمی ئایینییان لێ بکرێ ، ئەو کاتە دەبێ هاوکاریی بکرێن ، مەگەر ستەمەکە لەلایەن لایەنێکی کافری هاوپەیمانی مسوڵمانانەوە بێ .

پاشان خوا ڕایدەگەیەنێ کە بێبڕوایانیش ، دۆستو پشتیوانی یەکدینو ، ئەگەر مسوڵمانانیش وا نەکەن ، ئاشووبو خراپەکاریی یەکی گەورە پەیدادەبێ .

دوایی جارێکی دیکە باسی ئەو ڕاستییە دەکرێ ، کە بڕوادارانی کۆچکەرو پشتیوان ، بڕواداری ڕاستەقینەنو ، پاداشتیان گەورەیە لە لای خوا .

وە لە کۆتایی دا خوا ڕایدەگەیەنێ : کە ئەوانەی دواتریش بڕوا دێننو کۆچ دەکەنو جەنگو جیهاد لەگەڵ مسوڵماناندا دەکەن ، ئەوانیش بەشێکن لە بڕواداران ، وە ئەوانەش کە پەیوەندیی خزمایەتییان هەیە ، لە کتێبی خوادا لە یەك نیزیکترنو ، بۆ میرات گرتن لە یەکدی لە پێشترن .

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ٧٢ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ ٧٣ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ٧٤ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٧٥ ﴾ .

## مانای وشـە بە وشـەی ئایەتەکـان

{بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کۆچیان کردووە ، بە سامانو گیانیان لە ڕێی خوادا تێکۆشاون ، وە ئەوانەی (پێغەمبەرو) کۆچکەرانیان حاواندۆتەوەو سەریان خستوون (و پشتیان گرتوون) ئەوانە هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن ، بەلاّم ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کۆچیان نەکردوە (بۆ ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی) هەتا کۆچ نەکەن ، بۆتان نیە دۆستایەتیی یان بکەن (و بەرگرییان لێ بکەن) ، وە هەر کات لە بواری دینداریی دا ، داوای یارمەتییان لێتان کرد ، لە سەرتان پێویستە پشتیان بگرن ، مەگەر لە بەرانبەر کۆمەڵێکدا کە پەیمان لە نێوان ئێوەو ئەواندا هەیە ، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن ﴿٧٢﴾ وە ئەوانەی بێبڕوان ، هەندێکیان دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن ، ئێوەش ئەگەر (لە نێوان خۆتاندا) ئەو دۆستایەتییە نەکەن ، بەلاّو خراپەکارییەکی گەورە لە زەویدا پەیدا دەبێ (بەهۆی پشتیوانیی یەکدی نەکردنتانەوە)﴿٧٣﴾ وە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کۆچیان کردووەو لە ڕێی خوادا تێکۆشاون ، وە ئەوانەی حاواندنەوەو سەرخستنیان ئەنجام داوە ، ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن ، (لەلایەن خواوە) لێبووردنو بژیوێکی باشیان هەیە ، (لە ڕۆژی دوایی دا) ﴿٧٤﴾ وە ئەوانەی دواتریش بڕوایان هێناوەو ، کۆچیان کردووە ، لەگەڵتان تێکۆشاون ، ئەوانەش لە ئێوەن ، وە لە کتێبی خوادا خزمان هەندێکیان بۆ هەندێکیان لە پێشترن (لە مسوڵمانانی دیکە) بە دڵنیایی خوا بە هەموو شتێك زانایە ﴿٧٥﴾)) .

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ) : بە ماڵو سامانیان تێكۆشاون . (الجِهَادُ وَالمُجاهَدَة : اسْتِفْراغُ الوَسْعِ فِي مُدَافَعَة العَدُوِّ) .

وشەی (جِهَادُ ومُجاهَدَة) ئەوەیە ئەوپەڕی تواناتی بەكاربێنی لە بەرەنگاربوونەوەی دوژمندا .

(ءَاوَواْ) : (أَوَى إِلى كَذَا : انْضَمَّ إِلَيْهِ ، يَاوِي أَوِيا وَمَأْوَىً ، وَآوَاهُ غَيْرُه يُؤْوِيه إِيوَاية) .

(أَوَى إِلى كَذَا) واتە : پەنای پێبرد ، یاخود چووە پاڵی ، (يَاوِي أَوِيا وَمَأْوَىً) واتە : پەنای پێ دەبات ، پەنابردن ، شوێنی حەوانەوە ، (وَأَوَاهُ غَيْرُه يُؤْوِيه إِيوَاية) ، واتە : غەیری خۆی حاوندبووە، دەیحاوێنێتەوە ، حەواندنەوە .

(وَّنَصَرُوٓاْ) : (النَّصْرَةُ وَالنُّصْرَة : العَوْنُ ، وَالتَّنَاصُر : التَّعَاون) .

(نَصْرَ ونُصْرَة) بە مانای هاوكارییە ، وە (تَنَاصُر) واتە : هاوكاریی یەكدی كردنو دەستبار بۆ یەكدی گرتن .

(أَوۡلِيَآءُ) : (جَمْعُ وَلِي ضِدُّ العَدوّ : المُحِبّ ، الصاحِب ، الحَلِيف ، الجار ، الشَّرِيك ، المُنْعِم ، المُنْعَمُ عَلَيْهِ) .

واتە : (أولياء) كۆی (وَلي)یە ، (وَلي) ئێمە بە كوردیی دەڵێین : دۆست ، یان خۆشەویست ، یان نیزیك ، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا دژی (عدو) واتە : دوژمن ، ئنجا ئەم وشەیە بە مانای : خۆشەویست ، هاوەڵ ، هاوپەیمان ، دراوسێ ، هاوبەش ، دێ ، وە بە مانای : كەسێك كە چاكەی كردووە ، كەسێك چاكەی لەگەڵ كراوە ، دێ .

(وَلَٰيَتِهِم) (الوَلاية) : (القَرَابة : النُّصْرَة) .

واتە : (وَلاية) بە مانای خزمایەتییو هاوكاریو سەرخستن دێ .

(مِّيثَٰقٌ ) : (العَهْدُ : وَالوَثِيق : الشيء المحْكَم) .

واتە : (ميثاق) یانی : پەیمان ، وە (وثيق) یانی : شتێکی مەحکەمو پتەو .

(وَفَسَادٌ ) : (الفَسادُ : التَّلَفُ وَالعَطَبُ ، وَالإضطِرَاب وَالخَلَل ، وَالجَدْب وَالقَحْط والضَّرَرُ) .

وشەی (فساد) هەموو ئەو مانایانەی هەیە ، لەبەین چوون ، شڵەژان ، کەمو کوڕیی ، گران ساڵیی ، قاتو قڕیی ، زەرەرو زیان .

(وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ ) : (أُولُوا) واتە : (أَصْحَاب) کۆی (صاحب)ە یانی : خاوەن ، یان هاوەڵ ، یانی : خاوەن ، (الأرحام) کۆی (رَحِمْ)ە ، واتە : لە ئەسڵدا یانی : منداڵدانی ئافرەت ، دوایی بە مانای پەیوەندیی خزمایەتیی هاتوە ،

(أَوْلَىٰ ) : (أَقْرَب وَأَجْدَر) واتە : نیزیکترو شایستەتر .

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە خوا دەفەرمویٚ : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٧٥﴾ .

لەوبارەوە ئەم دوو گێڕراوە هەن :

أ / ﴿عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ، قَالَ : فِينَا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة : خاصَّة معشر قريش والأنصار : ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ﴾ ، قَالَ : كَانَ رَسول اللّهِ ﷺ قَدْ آخى بَيْنَ رَجُل مِنَ المهَاجِرينَ وَرَجُل مِنَ الأَنْصار ، فَلَمْ نَشُكّ أَنا نَتَوارَثُ ، لَو هَلَكَ كَعْب وَلَيْسَ لَهُ مَنْ يَرِثُهُ ، فَظَنَنْتُ أَنّي أَرِثُهُ ، وَلَوْ هَلَكْتُ كَذَلِكَ يَرِثُنِي ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة : ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ﴾﴾ {أَخْرَجَهُ الحَاكِم بِرقم : (٨٠٠٥) ، وَقَالَ : هَذَا حَدِيث صَحِيح الإِسْنادِ ، وَلَمْ يخرجاهُ ، وَوَافقهُ الذَّهَبِي ، وَابْنُ أَبي حَاتم في تفسيره ، برقم : (٩٢٠٦) ، وقال مؤلفا الإستيعاب : قلنا : وهذا سند حسن} .

واتە : زوبەیری کوڕی عەووام خوا لێی ڕازی بێ ، دەڵێ : ئێمەی کۆمەڵی قورەیش‌و پشتیوانەکان ئەم ئایەتەمان دەربارە هاتە خوار : ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ﴾ ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای چوونی دا بۆ مەدینە ، برایەتیی دانا ، لە نێوان هەر پیاوێك لە پشتیوانان‌و پیاوێك لە کۆچکەران دا ، پێکەوە دەیکردنە برا ، وە ئێمە هیچ گومانمان نەبوو کە میرات لە یەکدی دەگرین ، زوبەیر دەڵێ : ئەگەر کەعب (کە لەگەڵی کراوەتە

برا) مردبایە ، پێم وایە من میراتم لێ دەگرت ، وە ئەگەر من مردبام پێش وی ، پێم وابوو ئەو میراتی لێ دەگرتم ، دوایی ئەم ئایەتە هاتە خوار ، ئەوەی هەڵوەشاندەوە ، کە دەفەرموێ : ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ﴾ واتە : وە خاوەن خزمایەتییەکان هەندێکیان لە هەندێکیان لە پێشترن .

ب/ ﴿عَنِ ابْنِ عَباسٍ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ : آخَى رَسولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ أَصْحَابِهِ ، وَوَرَّثَ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ : ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ﴾ ، فَتَرَكُوا ذَلِكَ ، وَتَوَارَثُوا بالنَّسَبِ﴾ {أَخْرَجَهُ الطيالسي برقم : (١٩٥٢) ، والبيهقي في سننه الكبرى ، برقم : (١٢٣٠٩) ، وَالطَّبَرَانِيُّ في الكبير ، برقم : (١١٧٤٨) ، والسيوطي في (الدر المنثور) ج٤ ، ص ١١٨} .

واتە : عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ ، دەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتیی لە نێوان هاوەڵەکانی دا بڕیاردا ، وە هەندێکیانی کردە میراتگری هەندێکیان (واتە : لە سەرەتای چوونیانەوە بۆ مەدینە) هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارێ ، ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ ئیدی وازیان لەوە هێنا ، وە بەهۆی ڕەچەڵەکەوە میراتیان لە یەکدی دەگرت .

بەڵام من ڕام وایە ئایەتی (٦)ی سووڕەتی (الأحزاب) ، ئەو مەسەلەی میرات گرتنەی هەڵوەشاندۆتەوە ، بەڵام ئەوەی سووڕەتی (الأنفال) کە ئێستا باسی دەکەین ، بۆ ئەوەیە کە خزمان زیاتر سوود لە یەکدی ببینن لە خەڵکی دی ، چونکە خزمەکان زیاتر مافیان بەسەر یەکدییەوە هەیە ، وەك دوایی باسی دەکەین .

وە دوایی باسی ئایەتەکەی سووڕەتی (الأحزاب)یش دەکەین .

## مانـای گـشــتـی ئایەتەکـــان

دیارە خوای کاربەجێ لەم ئایەتانەدا ، بابەتێکی گرنگ باس دەکات ، کە بریتیە لە پەیوەندییەکان ، وە بڕواداران دەکاتە چوار بەش :

١/ کۆچکەران .

٢/ پشتیوانان .

٣/ ئەوانەی کە لە دەرەوەی سنووری دەوڵەتی ئیسلامیی دا ژیاون .

٤/ وە ئەوانەی کە دوایی مسوڵمان دەبن .

وە باسی پەیوەندیی لەگەڵ کافرەکان ، دەکات ، چ مسوڵمانان پەیمانیان لەگەڵیان هەبێ ، چ پەیمانیان نەبێ ، لەم چوار ئایەتە موبارەکەدا خوای زاناو شارەزا باسی هەموو ئەو شتانەو شتی دیکەشی فەرمووە ، با سەرنج بدەین :

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ، کۆچیان کردووە ، بە سامانو گیانیان لە ڕێی خوادا تێکۆشاون ، ئەوە پێکهاتەی یەکەم .

﴿وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ﴾، وە ئەوانەی (پێغەمبەرو کۆچکەرانیان حەواندۆتەوەو بەرنامەو ڕێبازی خوایان سەرخستوە ، (بەوە کە پشتیان گرتوون) ، ئەوانە هەندێکیان دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن ، (لە هەموو کەس زیاتر لە یەکدی نیزیکترنو ، بەرگریی لە یەکدی دەکەن) ، ئەوە پێکهاتەی دووەم .

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ ﴾ ، وە ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو ، کۆچیان نەکردوە ، (لە شاری مەککەو لەنێو هۆزەکانی دیکەی عەرەبدانو لە مەدینەو دەوروبەرینی ، بەڵام لە ژێر سایەو لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا نین ،

گرنگ ئەوەیە بڕوادرن ، بەڵام كۆچیان نەكردوە ، جا لەبەر هەر هۆكارێك بێ) ، ئەوەش پێكهاتەی سێیەم .

﴿مَا لَكُم مِّن وَلَـٰيَتِهِم مِّن شَىْءٍ﴾ ، (ئا ئەوانە : خوشكو برای دینییتانن‌و ، پەیوەندیی ئیمانییتان پێكەوە هەیە) ، بەڵام بۆتان نیە هیچ دۆستایەتیەكیان بكەن ، یانی : بەرگرییان لێ بكەن ، كاتێك شەڕیان لێ دەقەومێ‌و ، ستەمیان لێ دەكرێ ، ئێوە پابەندنین‌و بۆشتان نیە لەسەریان بكەنەوە ، ﴿حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟﴾ ، هەتا كۆچ نەكەن ، بەڵێ دۆستایەتیی‌و پەیوەندیی ئیمانییتان پێكەوە ، بەڵام دۆستایەتیی‌و پەیوەندیی بەرگریی‌و سەرخستنتان لەگەڵیاندا نیە ، تا كۆچ دەكەن ، ﴿وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ﴾، وە ئەگەر داوای پشتیوانییان لێتان كرد ، لە بەرانبەر كۆمەڵێك دا ، كە دەیانەوێ ستەمیان لێ بكەن‌و لە ئیسلام لایان بدەن‌و هەڵیانگێڕنەوە ، ئەوە پێویستە پشتیان بگرن ، مەگەر لە بەرانبەر كۆمەڵێكدا كە پەیمان لە نێوان ئێوەو ئەواندا هەیە ، (ئەو كاتە نەك لەسەریان پێویست نیە ، بەڵكو بۆشیان نیە ، بێن ئەو پەیمانە هەڵوەشێننەوەو بەرگریی لەو مسوڵمانانە بكەن) ، ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ ، وە بێگومان خوا بینەری ئەوەیە كە دەیكەن .

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ﴾ ، وە ئەوانەش كە بێبڕوان هەندێكیان دۆستو پشتیوانی هەندێكیانن ، ﴿إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ﴾ ، ئەگەر ئێوەش لە نێو خۆتاندا وا نەبن ، (دۆستایەتیی‌و هاوكاریی یەكدی نەكەن) ، ئەوە بەڵاو خراپەكارییەكی گەورە لە زەویدا پەیدا دەبێ ، (لە ئەنجامی ئەوەدا كە ئێوە پشتیوانیی یەكدی ناكەن ، ئەگەر كافران پێكەوە تۆكمەو توندو تۆڵ بن ، ئێوەش پرژو بڵاوبن‌و هەر یەكەی لە ئاوازێك بخوێنێ ، هەر كەسە بە ڕێبەیەك بپێوێ ، ئەو كاتە بێهێزو زەبوون دەبن ، وەك ئێستا لە واقیعی مسوڵمانان دا دەیبینین ، بێگومان خراپەكاریی‌و گرفتاریی‌و بەڵا لە ژیانی مسوڵمانان دا زۆر زۆرە) .

ئنجا جارێکی دی خوای کاربەجێ : وەك مەدحو ستایشو پەسندکردنی ئەو کۆمەڵە مسوڵمانەی پێکهاتەی یەکەم ، دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴾ ، وە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ، کۆچیان کردووەو ، لە ڕێی خوادا تێکۆشاون ، (واتە : جەنگیان کردوە ، چونکە ئەوپەڕی خەرجکردنی تواناو کۆشش کردن ، بە زۆریی بە بەخشینی سەرو ماڵ دەبێ) ، وە ئەوانەی ئەرکی حاواندنەوەو سەرخستن‌و پشتگرتنیان ئەنجام داوە ، ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن ، (لەلایەن خواوە) لێبوردنێکی تایبەت‌و ، وە بژیوێکی باش‌و پڕ ڕێزو حورمەتیان هەیە ، لە ڕۆژی دواییدا .

ئنجا دێتە سەر پێکهاتەی چوارەم‌و کۆتایی مسوڵمانان : ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ ﴾ ، وە ئەوانەی دواتریش بڕوایان هێناوە ، کۆچیان کردوە (هاتوونە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی) ، وە بە سەرو ماڵیشیان لەگەڵتان تێکۆشاون ، ئا ئەوانەش لە ئێوەن ، (واتە : هاتوونە ڕیزی ئێوە) چونکە کۆمەڵگای ئیسلامیی ، کۆمەڵگایەکی داخراو نیەو ، کراوەیە ، وە ئەو حوکم‌و موژدەیە ئێستاش هەر دەگرێتەوە ، ئینسان بە ئەندازەی دڵسۆزیی‌و چاك کارکردن‌و پابەندیی بە شەریعەتەوە ، دەچێتە ئاستی کۆچکەران‌و پشتیوانان ، کە باشترین نەوەی ئوممەت بوون ، خوا لێیان ڕازی بێ .

لە کۆتاییدا دەفەرموێ : ﴿ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ ﴾ ، وە لە کتێبی خوادا : ئەوانەی پەیوەندیی خزمایەتییان هەیە ، هەندێکیان بۆ هەندێکیان لە پێشترن ، نیزیکترن .

زۆربەی توێژەرەوان گوتوویانە : واتە : بۆ میرات گرتن ، لەپێشترن ، بەڵام لە ڕاستییدا بۆ میرات‌و فراوانتریش لەوە ، خزم هەقی لەسەر خزم هەیە .

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکی دا فەرموویەتی :

﴿الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ ، وَالصَّدَقَةُ عَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ﴾ {رَوَاهُ التِّرمِذِيّ ، بِرقم : (٦٥٨) ، وَقَالَ : حَدِيثٌ حَسَنٌ ، وَالنَّسائِيُّ ، بِرقم :

(٢٥٨١) ، وَابْنُ مَاجَهْ ، برقم : (١٨٤٤) ، وَابْنُ حِبانَ ، برقم : (٣٣٤٤) ، وَالحَاكِمُ ، برقم : (١٤٧٦) ، عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ ، عَنْ أَنَسٍ ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ، وَصَحَّحَهُ الأَلْباني في (المشكاة) برقم : (١٩٣٩)}.

واتە : خێرکردن بە نەدارو خەڵکی ئاتاج ، هەر خێرو چاکەیە ، بەڵام بە خزمی نەدار ، دوو شتە : هەم خێرو چاکەیەو ، هەم صیلەی ڕەحمیشی جێبەجێ کردووە ، پەیوەندیی خزمایەتییشی گەیاندوە .

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾ ، بە دڵنیایی خوا بە هەموو شتێك زانایە ، کەواتە : هەرچی خوا پێتان دەفەرموێ : لێی وەربگرن ، وە پێوەی پابەند بن ، بەرژەوەندیی و خێری دنیاو دواڕۆژتانی تێدایە .

# ضـەند مەســەلەيەكـى طرنـط

**مەســـەلەی یەکـــەم** : کــە دەفـــەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴾ .

وەك پێشتریش گوتمان : لەم ئایەتەدا ، خوای کاربەجێ سێ پێکهاتەی کۆمەڵگای ئیسلامیی یەکەم ، دەخاتەڕوو ، لە چوار پێکهاتەکەی :

پێکهاتەی یەکەم : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ ، بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کۆچیان کردووە ، بە سامانو گیانیان لە پێناوی خوادا تێکۆشاون .

ئەوە کۆچکەران (المهاجرون) .

پێکهاتەی دووەم : ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ ﴾ ، وە ئەوانەی (دوای بڕوا هێنان) ، کۆچکەرانیان حاواندۆتەوە (لە نێوماڵو حاڵی خۆیاندا) ، وە پشتیان گرتوون ، (پشتی پێغەمبەرو کارو پڕۆژە ئیسلامییەکەیان گرتوە) ، ئەوەش پشتیوانان (الأنصار) .

ئەو دووانە : هەندێکیان دۆستو پشتیوانو هاوکاری هەندێکیانن ، لە هەموو ڕوویێکەوە .

پێکهاتەی سێیەم : ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُم مِّن وَلَايَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا ۚ وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ﴾ ، وە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ، کۆچیان نەکردوە ، ئێوە لەسەرتان پێویست نیە پشتیان بگرنو سەریان بخەن ، لە بەرانبەر دوژمنانیاندا ، هەتا کۆچ نەکەن ، بەڵام ئەگەر لە ڕووی دیندارییەوە ڕێگرییان لێکرا : هەوڵدرا هەڵبگێڕدرێنەوە لە ئایینو ، ئەزیەت دران ، ئەوە ئێوە لەسەرتان پێویستە هاوکارییان بنو پشتیوانیان بکەن ، بەڵام بێگومان ئەوانیش (واتە : ئەو مسوڵمانانەی کە لە دەرەوەی پێکهاتەو دەوڵەتی ئیسلامیین ، لە دەرەوەی سنووری قەوارەی ئیسلامیین ، هەر کات لە بواری دینداریی دا ، داوای یارمەتییان لێتان کرد ، لە سەرتان پێویستە پشتیان بگرن) ، ئەگەر کێشەیان هەبێ لەسەر هەر بابەتێکی دی ، جگە لە دینداریی ، لەسەرتان پێویست نیە بەرگرییان لێ بکەن ، (ئنجا لەسەر هۆزو عەشیرەتە ، لەسەر خوێنە ، لەسەرماڵو سامانە ، ... هتد) ، وە بۆ بەرگریی لێکردنیشیان لە بەرانبەر کەسانێك دا کە لەسەر ئایین دژایەتییان دەکەنو ، ئەزیەتیان دەدەن ، نابێ پەیمانتان لەگەڵ دوژمنەکەیان دا هەبێ .

واتە : لە کاتێك دا کۆمەڵێکی کافر کە پەیمانیان لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیی دا هەیە ، ستەم بکەن لە مسوڵمانانێك کە لەنێو خۆیاندان ، وە لەسەر دینداریش ستەمیان لێبکەن ، ئایا لەسەر دەوڵەتی ئیسلامیی پێویستە بەرگرییان لێ بکاتو ، پەیمان لەگەڵ قەوارەو کۆمەڵە کافرەکە هەڵبوەشێنێتەوە ؟ دەڵێین : نەك پێویست نیە ، بەڵکو هەر دروستیش نیە ، بۆچی ؟ چونکە :

١/ پارێزگاریی کردن لە قەوارەی ئیسلامیی ، گرنگترە لە بەرگریی کردن لە هەندێك مسوڵمان کە کۆچیان نەکردوەو ، کەمتەرخەمیش بوون ، کە کۆچ ناکەن بۆ ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی .

٢/ پاشان پەیمان پاراستن ، یەکێکە لە بەها بەرزەکانی ئیسلام ، لەگەڵ کافریشداو ، نابێ مسوڵمانان لە خۆیانی بوەشێننەوە ، پەیمان بشکێنن ،

بە هیچ شێوەیەك ، چونكە پەیمان شكاندنەكە ، گوناهەكەی گەورەترە لە خێری بەرگریی لێكردنی كۆمەڵە مسوڵمانێكی ستەم لێكراو ، كە ئەوانیش كەمتەرخەم بوون ، لە نەهاتنیان دا بۆ ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی .

كەواتە : ئیسلام زۆر واقیع بینانەو زۆر دوور بینانە لەگەل ئەو بابەتە سیاسییەو هەستیارەدا مامەڵەی كردوە .

وە لە حاڵەتێكی ئاواش دا دەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی دەوڵەتی كافری هاوپەیمان ئاگادار بكاتەوە ، لەوەی كە ئەوان پەیمانیان لە نێواندا نەماوە ، نەك یەكسەر هێرشیان بكاتە سەر ، چونكە ئەگەر پێشتر كۆمەڵێك مسوڵمان ژیانیان كەوتۆتە مەترسییەوە ، ئەو كاتە : هەموو دەوڵەتی ئیسلامیی دەكەوێتە مەترسییەوە .

ئنجا كە دەفەرمویٚ : ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ ، وە خوا بینەری ئەوەیە كە دەیكەن ، ئەوە هەم ئاگاداركردنەوەیە ، بۆ مسوڵمانان كە خوا دەتانبینیٚ ، وە هەم دڵخۆش كردنیشیانە ، كە بزانن : لە هەر كویٚ ستەمتان لیٚ دەكریٚو دەتانچەوسێننەوە ، ئەوە خوا دەتانبینیٚ ، بەڵام بەرنامەی خوای پەروەردگار ، بەرژەوەندیی گەورەتر زاڵ دەكات بەسەر بەرژەوەندیی گچكەتردا .

شایانی باسە پێكهاتەی چوارەم : لە ئایەتی (٧٥)دا باسكراوە : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ ...﴾ كە لەكاتی خۆی دا تەفسیری دەكەین .

**مەسەلەی دووەم** : كە دەفەرمویٚ : ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ﴾ ، وە ئەوانەش كە بێبڕوان ، هەندێكیان دۆستو پشتیوانی هەندێكیانن ، ئەگەر ئێوەش پشتیوانییو هاوكاریی یەكدی نەكەن ، (ئەی ئەهلی ئیسلام !) ئەوە لە زەوی دا ئاشووبو ئاژاوە (یاخود ئەشكەنجەدرانی مسوڵمانانو نارەحەت كرانیان) وە خراپەكارییەكی گەورە دەبیٚ .

وەك پێشتر ئاماژەیەکم پێدا ، ئەگەر ئێستا تەماشای واقیعی مسوڵمانان بکەی ، وای دەبینی ، مسوڵمانان ملیارێك و پێنج سەد ، شەش سەد ملیۆنن ، ئەگەر زیاتریش نەبن[1] ، بە ژمارە ، کەواتە : یەك لەسەر چواری بەشەر لەسەر زەوی ، مسوڵمانە ، بەلام تەماشا بکەن ! بێهێزو پێزترین ئۆممەتن ، نەك هەر بەرگرییان بۆ لە خەڵکی دیکە ناکرێ ، بگرە بەرگرییان بۆ لە خۆشیان ناکرێ ، سەرزەمینی مسوڵمانان بووەتە شوێنی تەراتێنی ئەهلی کوفر ، وە خێرو بێری مسوڵمانان بە تالان دەبردرێ ، وە مسوڵمانان وەك نیمچە کۆیلەیەك وان ، لەبەردەستی ئەهلی کوفردا ، بۆچی ؟! چونکە وەك خوا دەفەرموێ : وا نین : پێکەوە دۆست نین : ئەوە شیعەیە ، ئەوە سوننەیە[2] ، ئەوە تورکە ، ئەوە عەرەبە ، ئەوە کوردە ، ئەوە فارسە ، ئەوە خەڵکی فلان شوێنە ، ئەوی دی خەڵکی فلان شوێنە ، دابڕ دابڕ بوونو ، بە زۆر ناوونیشانان لەیەك ترازاون ، لە حاڵێکدا خوای پەروەردگار یەك ناوی لێناون :

...چ ... چ الحـج ، وە لێیان داوا دەکات کە وەك ئەهلی ئیسلام کۆببنەوەو ، لەسەر بناغەی ئیمان پێکەوە مامەڵە بکەن ، چ... À à Â î چ الحجرات ، نەك لەسەر بناغەی قەومیی و مەزهەبیی و حیزبو ناوچەی جوگرافیی و ... هتد ، بەڵێ مسوڵمانان ئاوا خۆیان دابڕ دابڕ کردوە ، بۆیە ئاوا بێهێزو پێز بوون ، ئەوەی کە خوا فەرموویەتی : چ...﴿إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ۝٧٣﴾ چ الأنفال ، ئەگەر ئێوەش پێکەوە دۆستو هاوکار نەبن ، ئاشووب و بەلاو خراپەیەکی گەورە لە سەرزەمین پەیدا دەبێ (سەرزەمینی مسوڵمانان) ، ڕێك ئێستا وایە ، تەماشا بکەن ! یەکێتی ئەورووپا هەیە ، جوولەکەو نەصرانیی

---

١) ئێستا : ٣ / رمضان / ١٤٣٧ ك بەرانبەر : ٧ / حوزەیرانی / ٢٠١٦ ز.

٢) دیارە مەبەستم ئەوەنیتە کە (شیعة) و (سنة) بخەمە تەرازووێکەوە ، چونکە ئەوانەی لەژێر ناوونیشانی : (أهل السنة) دان زۆربەی هەرەزۆری مسوڵمانن و ، (شیعة)ش یەکێکن لە کۆمەڵە داهێنەرەکان ، کە بە (فرق) و (أهل الأهواء) و (أهل البدع) ناسراون.

پێکەوەن ، بەڵکو بتپەرستەکانی هیندو چینو بوزییەکان لەگەڵ ڕۆژئاواییەکان ، لە بەرانبەر ئەهلی ئیسلامدا زۆر جار یەکن ، خواش دەفەرموێ : کە ئەوان یەکبن ، ئێوەش یەك نەبنو ، کۆك و تەبا نەبن ، فیتنەو ئاشووبێکی زۆر بڵاودەبێتەوە ، ئەوە دیارە ، فیتنەکە دەبینین ، لە جیهانیی ئیسلامییدا کە تێیدا دەژین .

وە هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە : ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ﴾ ، واتە : ئەگەر خزمان میرات لە یەکدی نەگرن ، ئاشووبو ئاژاوە لە نێوان مسوڵمانان دا پەیدا دەبێ ! بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە مانایەکی زۆر دوورو سادەو سەرکێڵە ، چەمکی ئایەتەکە زۆر لەوە فراوانترە ، بابەتەکە باسی میراتو شتی وا ناکات ، بەڵکو باسی پشتیوانیی یەکدی کردنو ، دۆستایەتییو بەرگریی لە یەکدی کردنە ، هەندێك لە توێژەرەوان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ بە شێوەیەکی زۆر تەسكو بچووك ، تەماشای واتای ئایەتەکانیان کردووە !

**مەسەلەی سێیەم** : کە دەفەرموێ : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾ ، وە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ، کۆچیان کردووەو ، لە ڕێی خوادا تێکۆشاون ، وە ئەوانەی ئەرکی حاواندنەوەو پشتگیریی کردنیان ئەنجام داوە ، ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن ، لێبوردنو بژێوییەکی باشو پەسندیان هەیە (لە ڕۆژی دوایی دا) .

یەکێك بۆی هەیە بڵێ : بۆچی خوا ئەم ڕستەیەی دووبارە کردۆتەوە ؟ دەڵێین : ئایەتی پێشێ باسی ئەوە دەکات کە حوکمی ئەو کۆچکەرانو پشتیوانانە ، چییە ؟ باسی کرد : کە ئەوانە نیزیکترین کەسی یەکدین ، دۆستو پشتیوانی یەکدین ، لەم ئایەتەشدا باسی پاداشتی ئەوانە دەکات ، کە ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن ، وە ئەوانە ڕزقو ڕۆزییو بژیوێکی باشیان هەیە ، وە پاداشتێکی تایبەتیان هەیە .

وە پاشان ئەم ئایەتە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ : کە بەڕاستیی کۆچکەرانو پشتیوانان ، بەسەر جگە لە خۆیاندا هەڵبژێردراونو ، ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن ، ئێستا شیعەکان کە تانە دەدەن لە کۆچکەرانو پشتیوانان ، لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا خوا لێیان ڕازی بێ ، ڕەفتارەکەیان لەگەڵ ئەم ئایەتەدا تێکدەگیرێ ، خوا دەفەرموێ : وە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ، کۆچیان کردووەو ، لە ڕێی خوادا تێکۆشاون ، وە ئەوانەی حاواندنەوەو سەرخستنیان ئەنجام داوە ، ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن ، لێبووردنو بژیوێکی باشیان هەیە (لە ڕۆژی دوایی دا) ، کەچی تۆ لەجیاتی ڕێزگرتن ، بیانبوغزێنی !!

مانای وایە : پێچەوانەی ئەم ئایەتە دەجووڵێیەوە .

کەواتە : ئەم ئایەتە بۆ ئەوە کە : پێگەو پایەی ئەو پشتیوانو کۆچکەرانە بۆ هەموو ئۆممەت دیاربێ ، وە هیچ کەس ئەو بێئەدەبییە نەکات ، تانەو تەشەریان لێ بدات ، ئەگەرنا بێگومان ئەوانیش فریشتە نەبوونو ، پارێزراو نین لە هەڵە ، کەمو کوڕییشیان هەبووە ، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ جیلەکانی دیکەی مسوڵمانان دا ، لە هەموو جیلەکانی دیکەی مسوڵمانان باشتر بوو ون ، وە لە خێرو پاداشتی چاکەی هەموو جیلەکانی دیکەدا بەشدارن ، چونکە لە دوای ئەوانەوە ، هەرچی کە هاتوە ، بەهۆی ئەوانەوە ئیسلامی وەرگرتوە ، ئەو ئیسلامەی کە ئەوان بڵاویان کردۆتەوەو ، ئەو ئیسلامەی ئەوان گەیاندوویانە ، کەواتە : لە خێرو پاداشتی هەموو جیلەکانی ئۆممەتدا بەشدارن ، بۆیە پلەو پێگەیان ، لە پێگەو پایەی هەموو جیلەکانی ئۆممەت گەورەترە .

**مەسەلەی چوارەمو کۆتایی** : خوا لەم ئایەتەدا باسی پێکهاتەی چوارەمی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی یەکەم دەکات ، دەفەرموێ : ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴾ ، واتە : وە ئەوانەی دواتریش بڕوایان هێناوەو ، کۆچیان کردووە ، لەگەڵتان (لە ڕێی خوادا) تێکۆشاون ، ئەوانەش

لەگەڵ ئێوەن و لە ڕیزی ئێوەن ، وە لە کتێبی خوادا ، خزمان هەندێکیان لە هەندێکیان لەپێشترن ، بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە .

ئەمە پێکهاتەی چوارەمی دەوڵەتی ئیسلامییە ، لە کۆمەڵگای سەردەمی پێغەمبەری خوادا ، وە هەر کۆمەڵگایەکی دیکە کە بشوبهێتە ئەو کۆمەڵگایە ، کە کۆچکەر هەبن و پشتیوان هەبن و مسوڵمانانێك هەبن ، کە لە دەرەوەی ئەو قەوارەیە بن ، پاشان مسوڵمانانی دیکەش پێوە پەیوەست بن ، ئەو لەو کاتەدا : هەمان حاڵەت دووبارە دەبێتەوە .

ئنجا کە خوا دەفەرموێ : ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمْ﴾ ، واتە : لە هەموو ڕوویێکەوە لە ڕیزی ئێوەدان ، لە ئاستی ئێوەن ، وەك ئێوەن ، چونکە وەنەبێ خوای بەخشندە هەر ئەوەندە بەخشش و ، هەر ئەو پاداشتەی بووبێ ، کە داویەتی بە کۆچکەران و پشتیوانان ! بەڵکو تاکو دنیا بە کۆتا دێ ، هەر کەسێك لەو ڕێیەوە بڕوات : بڕوای هەبێ بە خواو بە پێغەمبەران و بە هەرچییەکی هێناویانە ، وە ئامادەبێ کۆچ بکات ، لە کاتی خۆیداو ، ماڵ و حاڵی خۆی بەجێبهێڵێ ، وە ئامادەبێ لە پێناوی خوادا فیداکاریی بکات ، گیان و ماڵ و سەری خۆی ببەخشێ ، هەر کەس ئاوا بێ ، ئەوە دەچێتەوە ڕیزی کۆچکەران و پشتیوانانی یەکەم ، خوا لە هەموویان ڕازی بێ ، بۆیەش خوا فەرموویەتی : ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمْ﴾ ، نەیفەرمووە لە چیدا ؟ واتە : لە هەموو ڕوویێکەوە .

ئنجا لە کۆتایی دا دەفەرموێ : ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ ، وە ئەوانەی پەیوەندیی خزمایەتیی لە نێوانیاندا هەیە ، هەندێکیان بۆ هەندێکیان لە پێشترن ، واتە : لە مسوڵمانانی دیکە ، وەك گوتم : زۆر لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە : مەبەست پێی میرات گرتنە ، واتە : بۆ میرات گرتنێ لە یەکدی نیزیکترن ، چونکە پێشتر بە حوکمی ئەو برایەتییەی لە نێوانیان دروست بوو بوو ، بە شێوەی کاتیی هەر کۆچکەرو پشتیوانێك ، بوو بوونە براو میراتیان لە یەکدی دەگرت ، ئنجا دەڵێین : ئەو برایەتییەو ، ئەم میرات گرتنە : بەم ئایەتە هەڵوەشاوەتەوەو ، چۆتەوە سەر ئەسڵی خۆی :

میرات گرتن بە پێی نەسەبو بە پێی نیزیکیی خزمایەتیی ، نەك بە پێی ئەو ڕێو شوێنە کاتییەی کە پێغەمبەری خوا بڕیاری داوە ، لەبەر ناچاریی‌و لەبەر پێویستیی .

بەڵام من ڕام وایە ئەم ئایەتە مەبەستی پێی ئەوەیە ، کە خزمان لە نێوان خۆیاندا ، لە بواری پشتیوانیی یەکدی کردن‌و ، هاوکاریی پێکەوە کردن‌و ، دەستبار بۆ یەکدی گرتن دا ، لە خەڵکی دیکەی بێگانە لە یەکدی لە پێشترن .

ئەدی ئایا میرات لە یەکدی گرتن : بەهۆی ئەو برایەتییە کاتییەوە ، چی لێهات ؟ ئەوە بە ئایەتی ژمارە (٦)ی سووڕەتی **(الأحزاب)** هەڵوەشایەوە ، کە دوایی باسی دەکەم : بۆچی نابێ ئەم ئایەتە هەڵوەشێنەرەوەی ئەو میرات گرتنە بێ ، کە بەهۆی ئەو جۆرە برایەتییەوە دروست بوو بوو ؟

خوا لە سووڕەتی **(الأحزاب)**دا دەفەرموێ : **ﭿ** ...

**ﭿ** ، واتە :

وە خزمان لە کتێبی خوادا ، هەندێکیان لە هەندێکیان لە پێشترن ، لە بڕوادارانیش‌و لە کۆچکەرانیش ، مەگەر چاکەیەك لەگەڵ دۆستانتان دا بکەن‌و دیارییەکیان بدەنێ ، (ئەگەرنا وەك میرات لێگرتن ، بە حوکمی خزمایەتیی میرات لێك دەگرن ، نەك بە حوکمی ئەو برایەتییە کاتییەی کە لە نێوانتان دا دانرابوو) ، ئا ئەو بڕیارە پێشتر لە کتێبی خوادا هەبوو ، (بەڵام ئەو برایەتییە کاتییەی نێوان کۆچکەرو پشتیوانەکان ، لەبەر هەلومەرجێکی کاتیی دانرابوو) .

ئنجا ئایا بۆچی ناگونجێ ئەم ئایەتەی سووڕەتی **(الأنفال)** میرات گرتنی هەڵوەشاندبێتەوە ؟

چونکە سووڕەتی **(الأنفال)** هەمووی بە یەکەوە دابەزیوە ، لە کاتی جەنگی بەدردا ، لە ساڵی دووەمی کۆچیی دا ، کە برایەتییە کاتییەکە لە گەرمی جێبەجێکران دابوو ، بەڵام سووڕەتی **(الأحزاب)** بە لای کەمەوە ، سێ ساڵ دوای

سووڕەتی (الأنفال) دابەزیوە ، واتە : سێ ساڵ دوای جەنگی بەدر ، ئنجا ئەو كاتە برایەتییەكە هەڵوەشایەوە ، ئەگەرنا نابێ ئەو برایەتییە كاتییە ئەمڕۆ كرابێ‌و ، سبەی هەڵوەشابێتەوە ! بەڵام سێ ساڵ دوای بڕیاردانی برایەتییەكەو ، دوای جەنگی ئوحوودو ئەحزاب ، كە كۆچكەرەكان شتێكیان كەوتە دەست ، ئنجا ئەو حوكمەی پێشێ ، كە لەبەر ناچاریی درابوو ، هەڵوەشایەوە .

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ ، بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە ، واتە : متمانەتان هەبێ بە بڕیارەكانی خوا لە هەموو ڕوویێكەوە ، چونكە خوا بە هەموو شتێك زاناو ئاگادارە ، ئەوەی ئەمڕۆ بۆتان بڕیار دەدات ، هەر ئەوە بۆتان باشە ، بەرژەوەندیی دنیاو قیامەتی خۆتانی تێدایە .

لێرەدا كۆتایی بە تەفسیری سووڕەتی (الأنفال) دێنین ، خوا بە لوتفو كەرەمی خۆی لەو كەسانەمان بگێڕێ ، كە پابەند دەبن بە قورئانی خواوە ، وە یارمەتییمان بدات ، باشترو قووڵتر لە قورئان تێبگەین ، وە یارمەتییمان بدات ، بە تاك‌و كۆ ، پابەندبین بە شەریعەتی ئیسلامەوە ، لە ژیانی تاكیی‌و ، خێزانیی‌و ، كۆمەڵایەتیی‌و ، سیاسییماندا ، تاكو بەختەوەری‌و دنیاو سەربەرزی دواڕۆژ بین .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# سەرچاوەكان

١) تفسير الطَّبَري الْمُسمى جامع البيان في تأويل القُرآن ، لأَبي جَعفَر محمد بن جرير الطَّبَرِي ، تحقيق : هاني الحاج، عماد زكي البارودي، خَيْرِي سعيد ، المكتبة التوفيقية ، ٢٠٠٤ القاهرة.

٢) المِصبَاحُ الْمُنِير في تَهْذِيب تفسير ابن كثير للإمام الجليل عِماد الدِّين أَبي الفِداءِ إسْماعيل بن عُمَر بن كَثير القرشي الدمشقي ، إعداد جماعَة مِنَ العُلَمَاء ، بإشراف الشيخ صَفي الرحمن المباركفوري ، دار السلام ، الطبعة الثانية (١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م).

٣) التفسير الكبير أَو مَفَاتيحُ الغَيْب للإمام فَخْرَالدِّين محمد بن عُمَرَ بن الحسين بن الحسن ابن علي التميمي البكري الرازي الشافعي ، حَقَّقَهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ وَخَرَّجَ أَحَاديثهُ عِماد زكي البارودي المكتبة التوفيقية .

٤) الجامع لأحكام القُرآن، تفسير القُرطُبي لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القُرطُبي، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ عِماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية.

٥) أَحْكَام القُرْآن ، لأبي بَكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، راجع أصوله وَخَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى (١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م).

٦) فتح القدير، الجامع بين فني الرواية و الدراية من عِلم التفسير (تفسير الشوكاني) تأليف : الإمام العلامة محمد بن علي بن محمد الشوكاني ، تحقيق : عبدالرزاق الْمَهدي ، دار الكتاب العربي ، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

٧) زاد المسير في علم التفسير : لابن الجوزي .

٨) روح المعاني : للآلوسي .

٩) تفسير القاسمي الْمُسمى محاسن التأويل ، تأليف : علامة الشام محمد جمال الدين القاسمي ، دار الفكر الطبعة الأولى (١٣٩٨هـ - ١٩٧٨م).

١٠) تفسير المراغي ، تأليف أحمد مصطفى المراغي ، دار الفكر ، بيروت .

١١) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام الْمَنان ، تأليف : العلامة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي ، تحقيق : عبدالرحمن بن معلا اللويحق مؤسسة الرسالة ، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

١٢) صفوة البيان لِمَعَاني القُرآن ، تأليف : الشيخ حسين محمد مخلوف الطبعة الثالثة.

١٣) صفوة التفاسير ، تأليف : العلامة محمد بن علي الصابوني ، مكتبة الهداية ، أربيل/ العراق ، الطبعة الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م).

١٤) تفسير القُرآن الحكيم الشهير بـ (تفسير المنار) تأليف : محمد رشيد رضا ، دار المعرفة، الطبعة الثالثة.

١٥) الأساس في التفسير ، تأليف : سعيد حوى ، دار السلام ، الطبعة الثانية (١٤٠٩ هـ - ١٩٨٩م).

١٦) في ظِلال القُرْآن ، تأليف : سيد قطب دار الشروق ، الطبعة الشرعية الخامسة والعشرون (١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م).

١٧) التفسير الْمُنير في العَقِيدة والشَّرِيعَة والْمَنْهَج ، تأليف : الأستاذ الدكتور وهبة الزحيلي ، دار الفكر الطبعة الثالثة (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥م).

١٨) التحرير والتنوير ، محمد الطاهر بن عاشور .

١٩) الميزان ، محمد حسين الطباطبائي .

٢٠) تفسير الشعراوي ، محمد متولِّي الشعراوي .

٢١) تفسير نمونه ، ناصر مكارم شيرازي .

٢٢) الكاشف ، محمد جواد مغنية .

٢٣) التفسير التوحيدي ، د. حسن الترابي .

٢٤) مُفرَدات ألفاظ القُرآن ، تأليف : العلامة الراغب الأصفهاني ، تحقيق : صفوان عدنان داوودي ، دار القلم ، الطبعة الثالثة (١٤٢٣ هـ - ٢٠٠٢م).

٢٥) الإستيعاب في بيان الأسباب .

٢٦) أسباب النزول ، للنيسابوري .

٢٧) لُباب النقول في أسباب النزول، للإمام الحافظ جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي خَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ عبدالرزاق الْمَهْدِي ، دار الكتاب العربي (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٦م) ، (أسباب النزول) للنيسابوري .

٢٨) مختار الصِّحاح ، للرازي .

٢٩) المعجم الوسيط ، دار الدعوة ، الطبعة الثانية.

٣٠) الْموطأ للإمام مالك بن أنس برواية يحيى بن يحيى الليثي ، تحقيق : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨ م)، (أسباب النزول) للواحدي .

٣١) الْمُسنَد للإمام أحمد بن محمد بن حنبل ، الناشر مؤسسة قرطبة ، القاهرة ، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأنؤوط عليها .

٣٢) صَحِيح البُخَارِي للإمام أبي عبدالله محمد بن إسماعيل البُخَارِي ، تحقيق : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار الْمعرفة ، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٣٣) صَحِيح مسلم للإمام الحافظ مسلم بن الحجاج النَّيسابوري ، حقوق أصولُهُ و خَرَّجَ أَحاديثهُ على الكتب الستة : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار المعرفة ، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٤) سُنَن أبي داود للإمام أبي داود سُليمان بن الأشعث السجستاني ، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة الْمعارف ، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٥) سُنَن التِّرمِذِي للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة التِّرمِذِي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٣٦) سُنَن النَّسَائي للإمام أبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب بن علي الشهير بـ(النَّسَائي)، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة الْمعارف ، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨م).

٣٧) سُنَن ابْنُ مَاجَهْ، للإمام أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني الشهير بـ (ابْنُ مَاجَهْ)، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨ م).

٣٨) سُنَن الدار قُطني، للإمام الحافظ علي بن عُمر الدار قُطني ، تحقيق : مجدي بن مَنصور بن سي الشورى ، دار الكتب العلمية ، الطبعة الثانية (١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣ م).

٣٩) الْمُستَدرَك على الصحيحين للإمام الحافظ أبي عبدالله الحاكم النَّيسابوري ، تحقيق : صالح اللحَّام ، دار ابن حزم ، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٠) صَحِيح ابْنُ حِبَّان للإمام أبي حَاتِم محمد بن حِبَّان الخُراساني ، تحقيق : حقوق أصولهُ وخَرَّجَ أَحاديثه : الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا ، دار الْمعرفة ، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٤١) الْمُعجم الكبير للحافظ أبي القاسم سُليمان بن أحمد الطَّبَراني ، حَقّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ حمدي عبدالمجيد السلفي ، مكتبة الأصالة والتُّراث ، الطبعة الأولى (١٤٣١هـ - ٢٠١٠ م).

٤٢) سُنَن الدَّارمي للإمام أبو محمد بن عبدالرحمن بن الفضل بن بهرام الدَّارمي ، حَقَّقَهُ وَشَرَحَ ألفَاظَهُ وَجُمَلَهُ وَعَلّقَ عَلَيهِ وَوَضَعَ فَهارسَهُ : الأستاذ الدكتور مصطفي ديب البغا ، دار المصطفى ، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٤٣) مشكاة المصابيح، تأليف : محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي ، تحقيق : محمد ناصر الدين الألباني ، المكتب الإسلامي ، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٤) إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل ، تأليف : محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي ، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٤٥) السراج الْمُنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير ، للحافظ جلال الدين السيوطي، العلامة محمد ناصر الدين الألباني ، رتبهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ : عصام موسى هادي، دار الصديق ، الطبعة الثانية (١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م).

٤٦) السنن الكبرى تصنيف : الامام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي ، تحقيق : دكتور عبدالغفار سليمان البنداري ، وسيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية بيروت – لبنان ، الطبعة الاولى (١٤١١ هـ - ١٩٩١ م).

٤٧) سلسلة الأحاديث الصحيحة، تأليف: مُحَمَّد ناصر الدّين الألباني، رحمه الله، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع ، الرياض ، الطبعة الأولى.

# بەرهەمەكانی دانەر

**تێبینی:** بەپێی نێوەڕۆك و تەوەرەی كتێبەكان ڕیزكراون .

## قورئان و سوننەت :

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا. چاپی ١٩٨٤/١، چاپی ٢٠٠٦/٢

٢- با لە خزمەت قورئاندا بین، }كۆی هەردووك كتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟) وە (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە{،چاپی ٢٠٠٨/١ و ٢٠١١ ، چاپی ٢٠١٥/٢.

٣- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەكەم: سوورەتەكانی: (الفاتحة) و (البقرة)، چاپی ١ / ٢٠١٢.

٤- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران)، چاپی ١ / ٢٠١٢.

٥- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم : سوورەتی: (النساء)، چاپی ١ / ٢٠١٣.

٦- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم : سوورەتی: (المائدة)، چاپی ١ / ٢٠١٤.

٧- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم : سوورەتی: (الأنعام)، چاپی ١ / ٢٠١٥.

٨- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف). چاپی ١ / ٢٠١٦.

٩- شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر لەنێوان كەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا، چاپی ١/ ٢٠١٥.

## بیروبڕواو فیكری ئیسلامیی :

١- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچكان. چاپی ١ / ١٩٨٥ ، چاپی ٣ / ٢٠٠٦.

٢- پرۆژەی بەرنامەی فیكریی كاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦.

٣- بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی. چاپی ١ /٢٠٠١ ، چاپی ٣ /٢٠١٤.

تێبینی : وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش.

٤- چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم، سەرنجێكی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانە. چاپی ١ / ٢٠٠٢ ، چاپی ٦ / ٢٠١٦.

تێبینی : وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبیی و توركیی و فارسییش.

٥- خواناسیی، ئایین، ئیمان (ڕاستییەكانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەكانی ڕێچكان دەپووچێنەوە). چاپی ١ / ٢٠٠٢ ، چاپی ٢ / ٢٠٠٩.

٦- مەوسووعەی : ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا (٦ بەرگ) چاپی ١/ ٢٠٠٦-٢٠٠٨، چاپی ٢ / ٢٠١٦.

- ڕێبازی پێغەمبەر کامەیە ؟! چاپی ١ / ١٩٨٩

{تێبینی: دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسوڵمان)}.

- مسوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسوڵمان . چاپی ١ / ١٩٩٧

{تێبینی: دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا)}.

٧- تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانیان، چاپی ٢٠٠٨/١، چاپی ٢٠١٥/٣

تێبینی : زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی)و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٨- ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی . چاپی ١ /٢٠١٢، چاپی ٣ / ٢٠١٤

٩- تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طەحاویی . چاپی ١ / ٢٠١٤

١٠- ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طە حاویی . چاپی یەکەم / ٢٠١٥

## فیقهی ئیسلامیی:

١- مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ) . چاپی ١ / ٢٠٠٠ ، چاپی ٢ / ٢٠٠٩ .

٢- بنچینە گرنگەکانی هەڵس‌وکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا. چاپی ١ / ١٩٩٩

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٣- جەژن و یادو بۆنەکانو هەڵسەنگاندنێك. چاپی ١ / ٢٠١٣.

٤- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا، چاپی ١ / ٢٠٠٩ ، چاپی ٢ / ٢٠١٥.

تێبینی : بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە .

٥- چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵو سامان بەخشین لەڕێی خوادا. چاپی ١ / ٢٠١٣.

## تەزکیەی نەفس و ڕەوشت و ئاکار:

١- یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ / ١٩٨٧

٢- ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا. چاپی ١/ ١٩٩٠ ، چاپی ٥ / ٢٠١٢.

تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبیو فارسییش.

٣- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا. چاپی ١ / ١٩٩٩

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش.

٤- گەڕانەوە بۆ لای خـوا (سبحانه وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخان و وازهێنان لە گوناه و سەرپێچی و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان. چاپی ١ / ٢٠٠١ ، چاپی ٥ / ٢٠١٠.

٥- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢.

٦- باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دوارۆژدا، چاپی ١ / ٢٠١٥.

٧- گیانی ژیـان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن. چاپی ١ / ٢٠١٥.

٨- مەوسـووعەی: ڕەوشتو ئاکاری ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشـنایی قورئانو سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠١٦.

## بانگەوازو کاری ئیسلامیی:

١- کۆمەڵی خـوا. چاپی ١ / ١٩٨٨.

٢- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسـوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ چاپی ١٩٨٨/١ ، چاپی ٣ /١٩٩٨.

٣- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسـلامیی. چاپی ١ /١٩٩٠.

٤- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣.

٥- بزوتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێ چاپی ١ / ١٩٩٤.

٦- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسـلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ / ١٩٩٧.

٧- بزووتنەوەی ئیسلامییو ئاسۆیەکی گەشو ڕوون، بنەما شەرعییەکانو بنچینە ئەخلاقییەکان چاپی ١ / ١٩٩٧.

٨- ئیسـلامو کێشـە هەنووکەییەکـان. چاپی ١ / ١٩٩٨.

٩- زانایانی ئیسـلام کێنو چۆنن ؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢ ، چاپی ٣ / ٢٠١١.

١٠- کۆمەڵی ئیسـلامیی: ئامانجو هەڵوێسـتەکانی. چاپی ١ / ٢٠٠٢.

١١- چۆن هەڵسـوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢.

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

١٢- چۆن لە جیهاد بگەین؟ چاپی ١ / ١٩٩٨.

١٣- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجو ئاگادارییەك. چاپی ١ / ٢٠٠٢.

١٤- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە ! چاپی ١ / ٢٠٠٢.

١٥- جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەكرێو چۆن دەكرێ ؟ چاپی ١ / ٢٠٠٢.

١٦- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشكو برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ / ٢٠٠٢.

١٧- ئیسلامو مسوڵمانەتیی‌و كاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا. چاپی ١/٢٠٠٦.

١٨- هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٩.

١٩- بەشدارییكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانەو ژیرانە.
چاپی ١ / ٢٠٠٩ ، چاپی ٢ / ٢٠١٣.

تێبینی: چاپی یەكەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز كراوە، بەم شێوەیە:

أ- ئاڵقەی یەكەم: بەڵگەكانی ئەوانەی بەشداریكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.

ب- ئاڵقەی دووەم : بەڵگەكانی ڕەوایی بەشداریكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا.

٢٠- هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەرگیرانەكانی ڕێكخراوی (داعش)، چاپی ١ / ٢٠١٥.

٢١- با لادانو تاوانی پەرگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی‌و گومان. چاپی ٢٠١٥/١ .

٢٢- پەرگیریی: پێناسەی، نیشانەكانی پەرگیران، هۆكارەكانی پەرگیریی، شوێنەوارو دەرهاوێشتەكانی، چارەسەری. چاپی ١ / ٢٠١٥.

## زنجیرەی بنەما شەرعی یەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی:

١- ئاڵقەی یەكەم: بەڵگە شەرعی‌یەكانی بنیاتنانی كۆمەڵی ئیسلامیی. چاپی ١ / ٢٠٠١.

٢- ئاڵقەی دووەمو سێیەم: حوكمی لادانی خەلیفەو كاربەدەستانی مسوڵمان لەكاتی لاریی و ستەمكاریی‌دا. چاپی ١ / ٢٠٠١.

٣- ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێكی شەرعی یانەو ژیرانەی فەتوانامەكەی. چاپی ١ / ٢٠٠١.

## وتاری كۆنگرەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان:

١- كارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری كۆنگرەی یەكەمی كۆمەڵی ئیسلامیی).
چاپی ١ / ٢٠٠٥ ، چاپی ٢ / ٢٠٠٦.

٢- ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیكریی، سیاسیی كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان (وتاری كۆنگرەی دووەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ٢٠١٠/١

## نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد :

١- کوردستان بۆ ویران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی ١ / ١٩٨٩

٢- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە. چاپی١/ ١٩٩٠ ، چاپی ٢٠٠٥/٢.

٣- سۆزی نەتەوایەتیو بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا.

چاپی ١٩٩٠/١ ، چاپی ٢٠٠٥/٣.

٤- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمانو پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢.

## سیاسەت و حوکمڕانیی :

١- چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵو وەحییدا. چاپی ١ / ٢٠١٠.

٢- مەوسووعەی: ئیسلامو دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ). چاپی ١ / ٢٠١٤- ٢٠١٦.

## ئافرەت و خێزان :

١- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانیو ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ / ٢٠٠٣.

٢- مەوسووعەی : ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەتدا.

بەرگی یەکەم چاپی ٢٠٠٢/١ ، بەرگی ١و٢ چاپی ٢٠١٣/٣.

## مێژوو :

١- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ، دەرس و پەندەکانی.

چاپی ٢٠٠٩/١ ، چاپی ٢٠١٣/٣.

٢- چەند مەلۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم . چاپی ٢٠١٥/١.

## دیدارو گفتوگۆ :

١- سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز).

چاپی ٢٠٠١/١ ، چاپی ٢٠٠٤/٢.

٢- ئەشکەنجەو زیندان ، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر). چاپی ١ / ٢٠٠٥ ، چاپی ٣/ ٢٠٠٩.

تێبینی : وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپو بڵاوکراوەتەوە ، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٣- گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا (چاوپێکەوتنی ناجیح حەمە فەرەج). چاپی ١ /٢٠١٠.

## زنجیرەی بابەتە هەنوكەییەكان :

١- گەنجەكانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی‌و لاسایی كردنەوەدا، چاپی ١ / ٢٠٠٦.

تێبینی: بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە.

٢- با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت كۆمەڵگاكەمان بەرەو هەڵدێر دەبات.
چاپی ١ / ٢٠٠٢ ، چاپی ٢ / ٢٠٠٦.

٣- بە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین ؟! چاپی ١ / ٢٠٠٧.

٤- چۆنیەتی بوونە پێشەنگ‌و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی . چاپی ١ / ٢٠٠٧.

٥- سیاسەتی ئیسلامیی‌و چەند ڕوونكردنەوەیەك. چاپی ١ / ٢٠٠٧.

٦- چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی. چاپی ١ / ٢٠٠٦.

تێبینی: بۆ فارسییش وەرگێڕراوە .

٧- قوتابیانی زانیاری شەرعیی‌و چەند سەرنج‌و ڕێنماییەك، چاپی ١ / ٢٠٠٧.

٨- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەكی مسوڵمانەتییە. چاپی ١ / ٢٠٠٧.

٩- بانگەواز بۆ لای خودا چییەو چۆنەو بە كێ دەكرێ؟ چاپی ١ / ٢٠٠٧.

١٠- قوتابیان لەم هەل‌و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن‌و چی بكەن ؟! چاپی ١ / ٢٠٠٨.

١١- واقیعی هەرێمی كوردستان ، دیدێكی ئیسلامییانە . چاپی ١ / ٢٠٠٨.

١٢- سروشت‌و پایەكانی خێزان‌و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع‌و عەقڵدا.
چاپی ٢٠٠٩/١.

تێبینی: ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە.

١٣- كاری ئیسلامیی‌و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك. چاپی ١ / ٢٠١١.

١٤- حوكمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك. چاپی ١ / ٢٠١١.

١٥- مەلای گەورەی كۆیەو تەفسیرەكەی‌و چەند سەرنجێك. چاپی ١ / ٢٠١١.

١٦- لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون‌و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا. چاپی ١ / ٢٠١٢.

١٧- تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی چییەو چۆنە؟ چاپی ١ / ٢٠٠٣، چاپی ٢ / ٢٠١٢.

١٨- ڕەوەندی كورد لە هەندەران‌و ئەركی سەرشانی. چاپی ١ / ٢٠١٢.

١٩- خاتوون مەلاژن : ئافرەتێكی هەڵكەوتوو و هاوسەرێكی ناوازە. چاپی ١ / ٢٠١٢.

# کتێبە عەرەبییەکان

- موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله

كە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە :

١- الكتاب الأول : الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق والخلق .
٢- الكتاب الثاني : تعريف الإيمان .
٣- الكتاب الثالث : الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى .
٤- الكتاب الرابع : الإيمان بالملائكة و بالجن.
٥- الكتاب الخامس : الإيمان بكتب الله الحكيم.
٦- الكتاب السادس : القرآن العظيم.
٧- الكتاب السابع : الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام.
٨- الكتاب الثامن : خاتم النبيين محمد : موجز سيرته وبراهين نبوّته.
٩- الكتاب التاسع : إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله.
١٠- الكتاب العاشر : إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى.
١١- الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام.
١٢- الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم.
١٣- نقض فكرة التطرف. ط ٢٠١٦/١.
١٤- ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية)، ط ٢٠٠٦/١.
١٥- لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم)، ط ٢٠٠٦/١.

# ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن

١- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال).
٢- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة).
٣- ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی هەرێم، گرفتو چارەسەر.
٤- سیکۆلاریزمو دیموکراسیی لە کوردستاندا، (دیبەیتی ساڵ).
٥- چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمانو واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥.
٦- كلمتان موجزتان حول مايجري على الساحة العراقية. (٢٠١٤ و ٢٠١٥).

# نێوەڕۆک

| لاپەڕە | بابــەت |
|---|---|
| ١٨٢ | **دەرسی سێیەم :** ئایەتەکانی (١٥- ٢٣) ئامۆژگاریی خوا بۆ بڕواداران کە خۆڕاگربن‌و، ڕوونکردنەوەی چەند ڕاستییەك . |
| ٢٠٢ | ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی حاڵەتەکانی پشتکردنە دوژمن لە جەنگ دا . |
| ٢١٩ | **دەرسی چوارەم :** ئایەتەکانی (٢٤- ٢٩) ئامۆژگاریی‌و ئاراستەکردنی خوا بۆ بڕواداران لەبارەی : بەدەم بانگی خواوە چوون‌و، خۆپاراستن لە بەڵاو خیانەت نەکردن لە ئەمانەت‌و وریابوون لە ماڵ‌و منداڵ‌و ، پارێزکاریی یەوە . |
| ٢٣٠ | ڕوونکردنەوەی چەمکی بەدەم بانگی خواو پێغەمبەرەوە چوون‌و، دەستکەوتنی ژیانی ڕاستەقینە بەو هۆیەوە . |
| ٢٤٣ | کورتە باسێك لەبارەی ئەمانەت پارێزییەوە . |
| ٢٥٠ | **دەرسی پێنجەم :** ئایەتەکانی (٣٠- ٤٠) باسی پیلانی کافرەکان دژی پێغەمبەری خاتەم‌و هەڵوێستی نەفامانەیان لە بەرانبەر قورئان‌و ، پووچیی پەرستشەکانیان‌و ، هەوڵ‌و تەقەللایان بۆ دژایەتی ئیسلام‌و و مسوڵمانان‌و بێ سەرەنجام بوونی‌و ، فەرمانکردن بە بڕواداران هەتا فیتنە نامێنێ ، جیهاد بکەن . |
| ٢٦١ | کۆبوونەوەی قسەڕۆیشتووانی قورەیش‌و ڕاوێژکردنیان دەربارەی پێغەمبەر دا . |
| ٢٨٨ | ڕوونکردنەوەی چەند ڕاستییەك‌و ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەك . |
| ٢٩٥ | **دەرسی شەشەم :** ئایەتەکانی (٤١- ٤٤) چۆنیەتی دابەشکردنی دەستکەوتەکانی جەنگ‌و، حیکمەتی خوا لە هێنانەپێشی جەنگی بەدردا . |
| ٣٠٤ | باسێك لەبارەی دابەشکردنی غەنیمەتەوە . |
| ٣٠٨ | وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێکی پێویست لەبارەی دەستکەوتەکانی جەنگ‌و چۆنیەتی دابەشکردنیانەوە ، لەم ڕۆژگارەدا |
| ٣١٦ | پێنج هەڵوەستە لەبەردەم ئایەتی (٤٢)ەوە کە باسی جوگرافیای گۆڕەپانی جەنگی بەدرو حیکمەتەکانی دەکات . |
| ٣٢٤ | **دەرسی حەوتەم :** ئایەتەکانی (٤٥- ٥٤) چەند ئامۆژگارییەکی گرنگی جەنگیی بۆ بڕواداران‌و باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان . |
| ٣٤٠ | حەوت ڕێنمایی گەورەو گرنگ بۆ جەنگاوەرانی ڕێی خوا . |
| ٣٤٥ | ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی شەیطان لە حەوت بڕگەدا . |